# کۆچ

ژمارە ( 5 ) بەهاری 2006

وەرزە گۆڤارێکی روناکبیرییە

سەنتەری روناکبیری ئێلبەگی جاف دەری دەکات.


خاوەنی ئیمتیاز

سەنتەری روناکبیری ئێلبەگی جاف

سەرنووسەر

حەبیب محەممەد دەروێش

نەخشەساز: حیکمەت مەعروف

تایپ: کۆژین حامید

هەڵەبڕی: م. عەلی عەبدوڵلا

چاپخانە: ئاوێنە

## ناوەرۆك

## سەروتار

خودی گۆڕانە دەبێت بەمێژووی مرۆڤایەتی، ئەمەش بەو شێوازە دەبێت کەمرۆڤەکان درووستی دەکەن بەو پێیەی ئەو دەستەواژە سیکۆلارە کە دەڵێت: مێژوو درووستکراوێکی مرۆڤەکانە، یان وەك (فیکۆ ) دەڵێ: ئێمە تەنها هەست بەو شتانە دەکەین کە بەرهەممان هێناوە ، یان بە دەستەواژەیەکی تر بڵێین: ئێمە دەتوانین ئەو شتانە بناسینەوە بەو رێگایانەی هاتووەتە بەرهەم .

جارێکی تر پێویستە قسە لەسەر رۆڵی سەنتەر و ناوەندە روناکبیرییەکان بکەین لە گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکان و توانایان لەداهێنانی نەریتی نوێ بەتایبەتی دوای تێپەڕبوونی زیاتر لە پانزە ساڵ بەسەر راپەڕیندا و قسە لەسەر ئەوە بکەین ئەم ناوەندانە چەندێك توانیویانە نەریتی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری نوێ بەرهەمبێنن و ئایا ئەم سەنتەرە روناکبیریانە هەر بەچالاکییە تەقلیدییەکان درێژە بەتەمەنی خۆیان دەدەن بەچاپکردنی رۆژنامە و گۆڤار و گرتنی کۆڕ و سیمینار کە لە کاوێژ کردنەوەیەك دەچێت کاریگەرییەکانی عەولەمە بەڕوونی بەسەریانەوە دیارە ، بەو مانایەی ئەوەی ئێمە ئەنجامی دەدەین دووبارەکردنەوەیەکی دەقاو دەقە یان فۆتۆ کۆپییەکی رۆشنبیری دەورو بەرمانە بە زمانی کوردی،لە کاتێکدا دەبێت ناوەندە روناکبیرییەکان نەریتێکی کلتوری نوێ بەرهەمبهێنن کاریگەری مێژوویی لەسەر رەوتی ژیانی کۆمەڵگا هەبێت و بابەتێکیش بێت بۆ لێکۆڵەران و توێژەرانی بواری سۆسیۆلۆژی بۆ خوێندنەوە و تێگەشتن لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی،

ئەمەش بەو مانایە نییە کە سوود وەرنەگیرێت لە نەریت و شێوازی خوێندنەوی میتۆدە زانستی و فەلسەفییەکانی جیهان کە توانیویانە خوێندنەوەی جیدی و گەورە بکەن بۆ هەموو نەریتە کۆمەڵایەتییەکان تا دەگاتە ئەفسانەکان ، چونکە تەنانەت لە خوێندنەوەی ئەفسانەکانیشدا ماناو گووتەزا (مقولات) ی گرنگ بەرهەم هاتووە لە ئەفسانەی ئەو کۆمەڵگایانەی کە خوێندنەوەی جیدی بۆکراوە و بوارێکی گەورەی کردووەتەوە بۆ خوێندنەوەی سۆسیۆلۆژی لەسەر ئەو کۆمەڵگایانە و رەوتی پێگەیشتن و ئاستی پێشکەوتن و دواکەوتنی ئەو کۆمەڵگایانە لەرووی پێگەشتنی شارستانیەوە.

سەنتەری روناکبیری ئێلبەگی جاف کە تاقە سەنتەرێکی روناکبیرییە کە توانیویەتی (ئەگەر چی بەشێوەیەکی سادەش بێت) نەریتی کەرنەڤاڵ دابهێنێ و هەوڵیداوە ساڵانە ئەنجامی بدات و وێنەیەکی کلتووری بەشێکی گەورەی پێکهاتەی کۆمەڵگای کوردی بخاتە ڕوو و دەشێ بکرێت بەرووبەرێك بۆ توێژینەوەی بونیادی کۆمەڵگای کوردی .

وەك لەسەرەوە ئامارەمان پێدا ئەم کەرنەڤاڵەی سەنتەری روناکبیری ئێلبەگی جاف ئەگەر چی ساڵانە بەشێوەیەکی سادە ئەنجامدەدرێت، بەڵام سەنتەر لە کەرنەڤاڵی ساڵانە سووربووە لەسەر دووبارەکردنەوەی بانگەوازێك بۆ هەموو مەڵبەند و ناوەندە روناکبیرییەکان بەمەبەستی ئەنجامدانی کاری هاوبەش بەسوود وەرگرتن لە پێشنیار و ئەزمونی یەکتر و بۆ ئەوەی بتوانرێت ڕەهەندی تازە تر بە کەرنەڤاڵ بدرێت و لەو شێوازە سادەیەی ئێستای دەرباز بکرێت، ئەویش بە پشتبەستن بەشارەزایانی بواری کەرنەڤاڵ و مەسەلە فۆلکلۆرییەکان، بەڵام بەداخەوە تا ئێستا ئەم بانگەوازە بیسەرێکی ئیجابی نەبووە و مانای

خراپی‌لیّ وەرگیراوە، لە کاتێکدا دەبێت ناوەندە رۆشنبیرییەکان بێ لایەنانەتر مامەڵە لەگەڵ یەکتر بکەن و بەشێوەیەکی شەفافتر دیالۆگ لەسەر هەموو مەسەلەکان بکەن، ئەم سەنتەرە دەیەوێت رووبەرێك لە رۆشنبیری کوردی پڕ بکاتەوە بۆیە دەستی کردووە بەکاری جیدی لەهەموو بوارە روناکبیری و کلتوری و ئەدەبییەکاندا و سەرەڕای ئەنجامدانی سەرکەوتوانەی کەرنەڤاڵی ئەمساڵ ، توانرا دیدارێك بۆ حەزرەتی نالی رێکبخرێ کە بەشاهیدی پسپۆڕانی بواری ئەدەب و فەرهەنگ کارێکی جیدی و زۆر سەرکەوتوو بووە کە تا ئێستا بۆحەزرەتی نالی کرابێت، هەرچەندە هەندێ لەنووسەران بەتێگەشتنێکی هەڵەوە پێش ئەنجامدانی دیدارەکە تەماشای ئەم پڕۆژەیان ئەکرد کە ئەو روانینەیان خاڵی نەبووە لە کاریگەری ناوەندە سیاسییەکان، بەڵام ئێمە درێژە بەو پڕۆژانە دەدەین و جارێکی تریش داوا لەنووسەران و روناکبیران دەکەین کەبەشداری جیدی بکەن بە خوێندنەوە و توێژینەوەکانیان بۆ زیاتر دەوڵەمەند کردنی دونیای کلتوریمان و مژدەش دەدەین کە پڕۆژەی خوێندنەوە بۆ گەورە شاعیر و پیاوە هەڵکەوتوەکانی کورد بەردەوامە و پڕۆژەی ئایندەشمان لەسەر( مەولانا خالیدی شارەزووری) دەبێت .

## تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامی و ...

## ئیشکالییەتی بەرهەمهێنانی توندوتیژیی ئاینی.

نووسینی

سەلام عەبدولکەریم

**پێشەکی :**

ئەمڕۆ توندوتیژی و کردەوە تیرۆریستییەکان سنووره لۆکاڵیو هەرێمییەکانی تێپەڕاندووە و بەشێکی هەرە زۆری وڵاتان و دنیای گرتووەتەوە، بەجۆرێك ئارامترین و هێمنترین پارچە زەوی جیهان لە بەردەم هەڕەشەی کردەوە تیرۆریستییەکاندایە و ڕەچاوی شوناس و ناسنامە و نەتەوە و جوگرافیا ناکات و لە کوێدا ڕەوایەتی پێدرا بە بێ دیاریکردنی کات دەگاتە ئەنجام و مەرگەسات دەخولقێنێت.

ئەو کردەوە توندوتیژی و تیرۆریستییانەی ئەمڕۆ لە کۆمەڵگا جیاوازەکاندا روو دەدات زیاتر سیمایەکی ئاینیان هەیە، بەمانایەکی تر ئەوەی تیرۆر و توندوتیژی بەرهەم دێنێت ژمارەیەك لەو گروپ و دەستە و تاقم و هێزانەن کە بەناوی ئاین و دەقەکانییەوە شەرعیەت وەردەگرن و بۆ هەر کردەوەیەکی توندوتیژی پاساوی ئاینی دەهێننەوە، هاوکات ئەو تیرۆر و توندوتیژییەی ئەم هێزانە ئەنجامیدەدەن لە راستیدا بە شەڕێکی رەوای دەناسێنن، رەوا لەوەدایە کە چەندین مەغزا و مەبەستی لە پشتەوە بۆ ریزکراوە هەر (لە درێژەدان بە جیهاد و تێکۆ شان، شەڕی کوفر و ئیمان، دامەزراندنی خەلافەتی ئیسلامی، بەرپەرچدانەوەی سەلیبیەتی جیهانی، جێبەجێکردنی شەریعەت و ئەحکامەکانی تا دەگاتە پاراستنی مسوڵمانان لە

پلانی سەهۆنییەت و ماسۆنییەتی جیهانی، دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی وئاینی... تاد.

ئەگەرچی هێز و گروپی دیکەی ئیسلامی ئەم توندوتیژییە بەناوی ئیسلامەوە رەفز دەکەنەوە، بەڵام ئەم دیاردەیە پێویستی بەلێکۆ ڵینەوە و بەدواداچون هەیە و بابەتێکی پنت فراوانە و ناکریٚ وازی لێبهێنرێت. تیرۆر و توندوتیژی بۆ خۆی پەیوەندی بە چەندین هۆکارەوە هەیە، بە بڕوای ئێمە ئەوەی ئەمڕۆ سیمای تیرۆر و توندوتیژی ئاینی لە خۆگرتووە، پەیوەندی پتەوی بە هۆکاری عەقیدەییو فیکری و پەروەردەییەکانی ئاینی ئیسلام و مومارەسەی سیاسی هێزە ئیسلامییەکانەوە هەیە و ئایدۆلۆجیای ئاینی و سیاسی ئەم هێزانە داینەمۆی جووڵاندنی تیرۆر و توندوتیژی ئاینییە، ئەم ئایدۆلۆجیا ئاینی و سیاسییە پەیوەندی کاریگەر و کارلێکردووی بە تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامییەوە هەیە، ئەم تیۆرەش لە نێوخۆیدا پەیوەندی بە مەسەلەکانی وەك ( حاکمیەت و ئیشکالییەتی پێناسەکردنەوەی چەمکی نەفامی و هەروەها گرفتی تەکفیرکردنەوەی کۆمەڵگە و ململانێی سیاسی هێزەکان لە پێناوی دەسەڵاتدا و گرفتەکانی جیابونەوە و ئیختیلافو رەفزکردنەوەی بنەماکانی پێکەوەژیان و زاڵبوونی تێزی سەلەفیەت بۆ ئاین و ژیان و تێکەڵکردنی ئاین و سیاسەت و تەئویلی دەقە ئاینییەکان و مردنی ئیجتیهاد و نوێبونەوەی ئاینی و پیرۆزکردنی چەمکی خەلافەت و...تا د) ەوە هەیە.

بۆیە گرنگە جومگە و ریشاڵەکانی ئەم تیۆرە و بابەتە پەیوەندیدارەکانی شیبکەینەوە بۆ ئەوەی مەودا و پەیوەندی لەسەر رەنگدانەوە و دروستبوون و بەرهەمهێنانی تیرۆر و توندوتیژی ئاینی روون بکەینەوە ، کە رۆژانە ئەم تیرۆرە لە زیادبووندایە و لە ئاکامیشدا جگە لە ئامانجە دیاریکراو و دەستنیشان کراوەکان، کەسانی بێتاوان وسڤیل ومنداڵ و گەنج و پیر دەبنە قوربانی، ئەم لێکۆڵینەوەیەش لە دووبەشی سەرەکی پێکهاتووە کە لەنێو

خۆیاندا دابەشکراوە بۆ چەند باسێکی تر، هەرچی بەشی یەکەمە تەرخان کراوە بۆ لێدوان دەربارەی شوناس وپێناسەی چەمکی تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامی و مێژووی سەرهەڵدانی ئەم تیۆرە و بابەتەکانی وەك چەمکی فەرمانڕەوایەتی و مێژووی سەرهەڵدانی ئەم گرفتە و چۆنێتی دروستبوونی لە نێوان مێژوو و کلتوری ئاینیدا، لە نێو پرۆسەیەکی مێژووکردندا و لە دەرەوەی چوارچێوەی دەق و تێکستەکان.

بەشی دووەمی ئەم لێکۆ ڵینەوەیە تایبەتە بەچۆنێتی گۆڕانی تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامی بەرەو بە کارهێنانی توندوتیژی ئاینی ئەمەش بە شێوەیەکی پلەبەندی لە نێویدا، سەرەتا ئیشکالییەتەکە لە پێناسەکردنەوەی چەمکی نەفامی لای هەر یەکە لە مەودودی و سەیدقوتب و سەپاندنی بەسەر هەموو کۆمەڵگەکاندا، پاشان تەکفیرکردنی کۆمەڵگەی لێدەکەوێتەوە و رەوایەتی دەدرێ بە بەکارهێنانی توندوتیژی. هەروەها تێڕوانینی سەلەفییانە بۆ ئاین وژیان دەبێتە مایەی بەرتەسکردنەوەی وتاری گەردوونیانەی ئاین و رەفزکردنەوەی پێکەوە ژیان. دواتر دەرئەنجامەکانی توێژینەوەکە بە پوختی دیاریکراوە و ئاماژەکراوە بە سەرچاوەکان.

**دەروازە:**

ناکرێ ئەوتیرۆرو توندوتیژیەی ئەمڕۆ ژمارەیەك لە هێزە ئاینی و ئیسلامییەکان پێی هەڵدەستن لە تێزی دەسەڵات و سیاسەتی دووربخەینەوە، بەوەی پێش وەختیش بەشێکی هەرە زۆری ئەو شەڕ و کوشتار و ماڵوێرانی و توندوتیژیانەی کە لەنێو مێژوو کلتوری ئیسلامیدا روویانداوە بە پاڵنەری شەڕکردن لەسەر دەسەڵات و گەیشتن بەپلە و پایە و تەختی فەرمانڕەوایی وێنا نەکەین. دەسەڵاتێکی سیاسی کە هەموو روخساری خۆی و کار و کردەوەکانی بە دەقەکانی ئیسلام جوان دەکات و لە ناوەڕۆکیشدا هەموو بەها

ئاینییەکانی دەق پێشێل دەکات و ئامادەیە رۆحی مرۆڤەکان بەو پیرۆزی و گەورەییە لای خودا بۆ هەتا هەتایی کۆتایی پێبهێنێت.

ئەگەر بمانەوێت بەرائەت و پاکێتی و نەزاهەت بۆ ئیسلام بگێڕینەوە پێویستە بابەتیانە و دوور لە هەر لایەنگیرییەك توێژینەوە لەسەر ئەم توندوتیژیە ئاینییە بکەین و مەبەست و مەرامەکانی پشت ئەم پرۆسەیە و هۆکارەکانی تەئویلکردنی ئاین بۆ ئەم کردەوە نامرۆیی و نائاساییانە دیاری بکەین. تیۆری دەسەڵاتخوازی چ لە فیکر و ئەندێشەی ئاینیدا چ لە مێژووی واقیعی کۆمەڵگەکاندا زۆرترین تیرۆر و توندوتیژی بەرهەمهێناوە، چونکە ئەم تیۆرە پشت ئەستور بووە بە سیاساندنی ئیسلام، بەمەش جۆرێك لە ئایدۆلۆجیای ئاینی بەرهەمهاتووە کە دەسەڵات بەردەوام وێنەکانی خۆی پێ جوان کردووە لە بەرامبەر ئەوانیتردا و هاوکات هەر بەم ئایدۆلۆجیایەش بەرامبەرەکانی پێ سەرکوت کردووە و هەموو ئاین لە چوارچێوەی یەکجۆر لە ئایدۆلۆجیای ئاینیدا کە زۆر جار ئایدۆلۆجیای گروپی دەسەڵاتداری فەرمانڕەوا بووە خۆی نواندووە. گواستنەوەی ئاین بەو هەموو رۆحە ئاسمانی و خواوەندییەوە بۆ نێو فەزای سیاسەت ودەسەڵات و ئایدۆلۆجیا، گەورەترین لێدانی کوشندە بوو لە پەیامی رۆحی ئاین و تێڕوانینە ژیاندۆستییەکانی و سەرهەڵدانی گوتاری مەرگدۆستی و کوشتنی هەموو ئەوانیتر کە لە دەرەوەی دنیابینی دەسەڵات بیری کردبێتەوە. هەروەها پرۆژەی پشت کردەوە تیرۆریستی و توندوتیژییەکان بە مانایەك لە ماناکان پرۆژەی رەفزکردنەوەی پێکەوەژیان و قبوڵکردنی ئەوی ترە کە جیاواز بیر ئەکاتەوە و دەدوێ و سەیری جیهان دەکات. بۆیە تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامی تا ئەو ئاستە کاریگەری هەبووە لەسەر سەرهەڵدانی توندوتیژی تیرۆری ئاینی کە هەموو پرۆسە کارلێکردووەکانی ژیانی لە دوو بەرەدا زەق کردووەتەوە ئەوانیش بەرەی ( ڕەوا و ناڕەوا، شەری کوفر و ئیمان، دارولحەرب و دارولئیسلام..تاد).

دواجار گرنگە ئەوە بڵێین کە تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامی بە شێوەیەك لە شێوەکان دوورکەوتنەوەیە لە بەرهەمهێنانی خوێندنەوە و راڤەکردنەوەی نویٚ بۆ ئاین و دەقەکانی بەدەر لە هەر کاریگەرییەکی میژوویی و کلتوری ، هەر وەك ئەم تیۆرە رەفزکردنەوەی بەرهەمهێنانی مۆدێلێکە لە گوتاری ئیسلامی کە وەڵامدەرەوەی خواست و داواکاری و کێشە و گرفتەکانی کۆمەڵگەی پێشکەوتووی مرۆڤایەتی بێت و ئیشکردن بێت لەسەر رواندنەوەی گوتاری هیومانستی ئیسلامی و خزمەتکردنی مرۆڤ لە نێو چەمکی دادپەروەری کۆمەڵایەتیدا. هەروەها ناکرێت لەم تیۆرەدا قسە لەسەر میتۆدی پەروەردەیی ئەم هێزە ئاینییە سیاسیانە نەکەین، میتۆدێك کە لەسەر بنەمای رەهای ( دۆست و دوژمن، ئەهلی کوفر و ئەهلی ئیمان، مسوڵمان و کافر، تەکفیرکردنی کۆمەڵگە و رەتکردنەوەی هەموو جۆرە دیاردە و دەستکەوتێکی هاوچەرخی شارستانی و...تاد) بەرجەستە کرابێت لایەنی کەم لایەنگران و خاوەنی ئەم تیۆرانە ئیفلیج دەبن لە بەردەم داواکاری مرۆڤایەتیدا کە بەرەو پێکەوەژیانی ئاشتییانە دەڕوات.

گرنگیشە لەم لێکۆڵینەوەدا ئەم بیرۆکەی پێکەوەژیانە پەرە پێبدەین و هانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بدەین کە بیر لە پێکەوەژیانی ئاشتیانە بکاتەوە لە بری کوشتنی مرۆڤەکان و بڵاوکردنەوەی پەتای مەرگدۆستی، بیر لە هۆشیارکردنەوەی مرۆڤایەتی بکرێتەوە و لە جێگەیدا تەساموح و لێبوردەیی ئاینی پەرە پێبدەین، لە بری تۆڵەسەندنەوە لە یەکتری ، هاریکاری یەکتری بکرێت و هەمووان لە ئاستی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی یەکتریدابن.

## بەشی یەکەم

## ( شوناس و مێژووی تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامی )

### باسی یەکەم:

### ( پێناسەی چەمکی فەرمانڕەوایەتی حاکمیەتو دەسەڵات )

**زاراوەی (الحاكمیە) لە زماندا لە ناوی (حاكم )ەوە دروستكراوە و گومانی تێدا نییە كە لە ڕەگوڕیشەی وشەی (حكم )ەوە پێكهاتووە بەڵام لە فەرهەنگە پشت پێبەستراوەكانی وەكو ( لسان العرب) دا نەهاتووە.**

**وشەی فەرمانڕەوایی ( الحكم ) زیاتر لە سەد جار لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە لە فەرمودە و پەڕاوەكانی شەرعیشدا ئاماژەی پێكراوە، بەڵام لە هەموو ئەمانەدا زاراوەی (حكم ) بە مانای گرتنەدەست و مومارەسەكردنی دەسەڵاتی سیاسی بەكارنەهاتووە، چ لە سەردەمی نەفامی یاخود لە سەردەمی ئیسلامیشدا. تەنانەت لە فەرهەنگە زمانەوانییە كۆنەكانیشدا. هەروەها نە لە قورئان و نە لە سوننەتی پێغەمبەریشدا (د.خ)و لە سەرچاوە ئیسلامییەكانیشدا بە مانای چەمكی دەسەڵاتخوازی سیاسی نەهاتووە، كە لە زمانی نوێی عەرەبیدا بڵاوە.**

**بە مانایەكی تر زاراوەی (حكم ) بە مانای دانایی هاتووە كە ڕەوا و ناڕەوای پێ جیادەكرێتەوە، ژمارەیەك لە توێژەرەوانی عەرەب بڕوایان وایە كە وشەی (حكم) كۆكراوەكەی (حكام )ە، كە لە قورئان و فەرمموودە و لە مێژووی ئیسلامد ابەو مانایە نەهاتووە كە كەسێك هەستێ بە دامەزراندنی**

فەرمانڕەوای سیاسی واتە بە مانای (خەلیفە یاخود پادشا یان دەسەڵاتدار) بەڵکو زیاتر تایبەت بووە بە مەسەلە دادوەرییەکان، ئەم بەکارهێنانەش تا وەکو داڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی ماوەتەوە و بەسەر دادوەردا نازناوی (دادوەری شەرعی) دابڕاوە. کاتێکیش قورئان ئاماژە بۆ مانای دەسەڵاتی سیاسی دەکات ئەوا زاراوەی (حكم) بەکارناهێنێت، بەڵکو ئەو زاراوە سیاسییە داکەوتووانە بەکاردەهێنێت، کە ئەو کات تایبەت بووە بە کاروباری سیاسی دەوڵەتانەوە وەکو زاراوەکان خاوەنداریێتی و فەرمان (الملك والامر) ( ) ولە چەندین ئایەتدا ئاماژەی پێکراوە (فقد اتينا ابراهيم الكتاب والحكمەواتيناهم ملكا عظيما)( )، بەڵام لە کاروباری سیاسیدا بەم شێوەیە هاتووە (وامرهم شورى بينهم)( ).

نەوەی یەکەمی مسوڵمانان وا تێگەیشتوون کە زاراوەی (حكم) واتای دەسەڵاتی سیاسی ناگەیەنێت، کە لە دەربڕینی سەردەمی ئێستادا مەبەست پێی دەسەڵاتی سیاسییە، بۆیە زاراوەکانی( الامارەو الامير) تایبەت بوون بە بواری سیاسیو ئەم نازناوەش بەسەر سوپا و شار و هەرێمەکاندا دابڕاوە. تەنانەت عومەری کوڕی خەتتاب  بە رەوای نەزانیوە کە نازناوی جێنیشینی پێغەمبەری خودا بۆ خۆی بەکاربهێنێت، بەڵکو نازناوی ( لێپرسراوی مسوڵمانان)ی بە باشزانیوە بۆ خۆی بەکاری بهێنێ، چونکە عومەری کوری خەتتاب وایدەبینی کە خەلافەت واتە جێنیشینیکردن لە دووکاردا: ئاینی و سیاسی، ئەو ئاگاداری ئەوە بوو کە جێنشینیکردنی پێغەمبەر(د.خ) لە بواری ئاینیدا ناکرێ، چونکە ئیسلام تەواو کراوە و پێویستی بە زیادکردن و چاوپێداخشانەوە نییە. پێغەمبەر (د. خ) کۆچی دواییکردووە، بۆ هیچ کەس نییە کە بانگەشەی جێنشینایەتی ئەو بکات لە ئایندا. هاوکات وەزیفەی سەرۆکی دەوڵەت پێویستە یەك بەرپرسیارێتی بێت کە ماف و ئەرکە لەسەری پێی هەستێ و بریتییە لە بە رێوەبردنی دەوڵەت و کاروباری دنیا، نەك بەرێوەبردنی ئاین، بەوەش تێدەگەین کە دەسەڵاتی ئاینی جیابووە لەدەسەڵاتی دنیایی، هەروەك عومەری کوڕی خەتتاب نەیویستووە تێکەڵیان

بكات نەبادا شەرعیەتو رەوایەتی بەدەسەڵاتی سیاسی خۆی بدات (5). بۆیە زاراوەی (حاکم)و (حوکمەت) بەمانای دەسەڵاتی سیاسی جێبەجێکردن تەنها لە سەردەمی نوێدا نەبێت بەکارنەهاتووە، دەکرێ بڵێین ئەم بەکارهێنانە سیاسیەی زاراوەی (حکم) لە دایکبووی دنیای نوی و مۆدێرنەیە بە تایبەت پاش گەشەسەندنی چەمکی فیکری سیاسی لە ئەوروپا، لێرەشەوە ئەوە تێدەگەین کە چەمکی دەسەڵاتی سیاسی و فەرمانڕەوایەتی (الحاکمیە) لە دایکبووی سروشتی نێو دەق و تێکستەکانی ئاین نییە ئەوەندەی لە دایکبووی کلتور و رووداوەکانی مێژووە، هەر وەك دیسان لەدایکبووی نێوململانێ و مشتومڕی گروپ و هێزەکان بووە لە نێوان یەکتریدا لەسەر دەستبەسەراگرتن و لە دەستنەدانی ئەو ئیمتیازە دنیاییە کە دەسەڵاتی سیاسی بووە. هەرچی ئەو دەقانەش هەیە کە تایبەتن بە بواری دەسەڵاتی سیاسییەوە زەقدەکرێنەوە و زیاتر پرۆسە مێژوویکردەکان دروستی کردوون و کار لەسەر پیرۆزکردنیان کراوە و سەرهەڵدانیان پەیوەستە بە جووڵەی مێژووە و لە هەناوی مێژووەوە دروستبوون، بە واتایەکی تر تیۆری سیاسی دەسەڵاتخوازی ئیسلامی تیۆرێکە وەکو چەمکی حاکمیەت لە نێو کولتور و مێژوودا بەچەند قۆناغێك لە دایکبووە و گەشەیکردووە و ناپابەندە بە دەقەوە و دەق نەینووسیوە، بەڵکو مێژوو دایڕشتووە(6). بە تەنیشتی ئەم پرۆسە مێژووکردەی تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامییەوە تێبینی ئەوەش دەکەین کە لەنێو ململانێکاندا دیسان ململانێ بووە بۆ دەستبەسەرگرتنی دەسەڵات و پلەوپایەی سیاسی ئەمەش کاریگەری هەبووە لەسەر دەرکەوتنی چەندین گروپی ئاینی و دواتر چوونە نێو شەڕ و کێشمەکێشی درێژخایەن و ترسناکەوە لەسەر ئەو دەسەڵاتە سیاسییە تەنانەت درێژکراوەی رووخسار و سیمای زۆرێك لەو گروپ و هێزانە کە ململانێی یەکترییان کردووە رووخسارێك بووە بە پێوەری دەسەڵاتخوازی و بەرژەوەندی و ململانێی دنیاییەوە ململانێ بکەن ، چونکە لە دنیای ئەمڕۆدا زۆر وڵاتی جیهانی ئیسلامی سەدەها حزبو هێزی ئیسلامی هەیە و لە ناوەڕۆکدا

ئەجێندای سیاسیان کارکردنە بۆ ئامانجێك کە هەموویان تێیدا هاوبەشن و یەك شتە کەچی شەرعییەت بەو جیاواز و پەرتەوازییە دراوە و بەردەوام لە داهاتووشدا درێژەی دەبێت و دەدرێت. هەروەك (د.مەحمود ئیسماعیل) دەبێژێت:" دەرکەوتنی گروپە ئیسلامیەکان پەیوەندیدارە بە کێشەی دەسەڵات و سیاسەتەوە، جیاوازی نێوانیان ئاینی و تیۆری نەبووە بەڵکو ململانێی دنیایی بووە "(7)، لەم نێوەندەدا دەبێ قسە لەسەر کرۆکی ململانێی هێزە ئاینییەکان بکەین لە مێژوودا، بۆیە تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامیدا بەو دروستبوونە مێژووییە و بەو خوێندنەوە کلاسیکیەی کە لە رابردوو و ئێستادا بۆی دەکرێت جموجووڵێکە بۆ دەسکەوتنی بەرژەوەندی زیاتری سیاسی و هەر هێزێك خۆی بە ئەولەوییەت دەزانێت لە گێڕانەوەی تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامی بۆ سەر شانۆی سیاسی، هەر وەك ( لینین )یش لە وتەیەکیدا گوزارشتی لە چەمکی سیاسیەت کردووە و دەڵێت:" سیاسەت گوزارشتکردنێکی خەستوخۆڵە لە دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی"(8) واتە چەمك و دەقەکانی ئیسلام زیاتر لەم بارەوە سیاسێنراوە(9) لە دەرئەنجامی ململانێکانی مێژووەوە نەك پێش ئەوە بۆ خۆیان شەقڵێکی سیاسیان هەبووبێت، ئەم دید و تێروانینانە بۆ سیاساندنی ئاین لە ململانێی نێوان گروپەکانەوە هەر یەکێك بۆ لای خۆی بەتایبەت (سوننە و شیعە و خەوارج)بووە بە مایەی راکێشانی ئاین بەرەو مەغزا و مەبەستە سیاسییەکان و دوورخستنەوە و داڕنینی لە بەها رۆحیەکان و پەلکێشکردنی ئاین بوو بەو هەموو مەزنێتی و پیرۆزییەوە بۆ نێو بازنەکانی ململانێ و کێبەرکێ سیاسییەکان.

هاوکات چەمکی خەلافەت کە کرۆکی تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامی پێکدەهێنێت، ئەوا سەرەتاکانی ململانێی گروپەکان لە مێژووی ئیسلامیدا، لە مێژووی هاتنە ئارای چەمکی جێنشینایەتییەوە سەرچاوەی گرتووە و پاش پێغەمبەر (د.خ) زیاتر شەقڵێکی سیاسی دەردەخات هەروەك

(د.عەلی عەبدوڕڕەزاق) دەڵێت:"خەلافەت شتێك نییە لە نەخشەی ئاینیدا بەڵكو نەخشەیەكی سیاسی تەواوە، نە فەرمانی پێكردوە و نە قەدەغەیكردووە، بەڵكو بەجێیهێشتووە بۆ ئێمە تا بگەڕێینەوە بۆ ئەقڵ و ئەزمونی نەوەكان و قاعیدە سیاسییەكان ".

## باسی دووەم:

## ( تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامی لە نێو مێژوو و كلتوردا)

پێشتر باسی ئەوەمان كرد كە شوناسی تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامی شوناسێكی دنیاییانەی هەیە و لە ناو مێژوودا دروستبووە نەك دەق و تێكستە شەرعیەكان فەرمانی پێكردبێت راستەوخۆ، بەوەش دەسەڵاتی سیاسی ئیسلامی شەقڵێكی دنیای هەیە وەك لە وەی ئاینی بێت واتە دەسەڵات كە پەیوەستە بە ژیانی دنیایی مرۆڤەكانەوە و دەبێ ئەوان جۆری ئەو دەسەڵاتە بۆ خۆیان دەستنیشان بكەن، كاتێكیش دەڵێین ئەم تیۆرە لە نێو ململانێكانی مێژوودا پەرەیسەندووە گرنگە ئاماژە بە مێژووی سەرهەڵدانی سەرەتاكانی ئەم تیۆرە دەسەڵاتخوازە ئیسلامییە بدەین بە تایبەت لە ڕووداوی دوای كۆچی دوایی پێغەمبەر (د.خ) كە هێشتا تەرمەكەی ئەسپەردە نەكرابوو ململانێ لەسەر دەسەڵاتی ئەو دروستبوو.

بە هەرحاڵ دامەزراندنی یەكەمین هێمای دەسەڵاتی سیاسی لە تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامیدا لە نێو ململانێی بەرژەوەندی هۆز و خێڵە عەرەبیەكانەوە سەرچاوەی گرتووە(10)، ململانێكانیش شەقڵێكی سیاسی و دنیایی و بەرژەوەندیخوازانەی لە خۆگرتووە، بە جۆرێك هەر لایەنێك دەیویست ئەو ئیمتیازە بەرخۆی بكەوێت هاوكات ئەوەش نیشاندەدات كە تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامی تیۆرێكی دروستكراو و دنیاییە، نەك ئاینی، چونكە پێغەمبەر (د.خ) كاتێك كۆچی دواییكرد پێشوەخت هیچ كەسێكی راستەوخۆ و

ناراستەوخۆش دیارینەکرد، پاش خۆی کاروباری جێنشینایەتی بگرێتە دەست و ئەو کارەی بۆ موسڵمانان خۆیان جێهێشت. هەر لێرەوە تێدەگەین کە ئەم تیۆرە تیۆرێکی پیرۆز و موقەدەس نییە، وەك ئەوەی کە قورئان و فەرمودە بە یەك شێوە و فۆرم فەرزیکردبێ، یاخود بەو شێوازەی کە ئەمڕۆ چەندین گروپی ئاینی جیاواز لە یەکتر بیردەکەنەوە و ئەم تیۆرەیان پیرۆز و موقەدەسکردووە. (11) لەپێناویشیدا خەڵك و کۆمەڵگەی پێ تەکفیردەکەن و توندوتیژی و تیرۆری ئاینی بەرهەمدێنن. بۆیە ئەگەر ناکۆکی نێوان یارانی پێغەمبەر(د.خ) و هەر کەسە بۆ خۆی لە مەسەلەی سەرکردایەتیکردندا بەڵگە بێت، ئەوا هاوکات بەڵگەشە لەسەر نەبوونی هیچ دەقێکی ئاینی لەمەڕ دانانی خەلیفە و سەرکردایەتی. مادام هیچ دەقێکی ئاینی لە گۆڕێدا نییە، ئەوا لۆژیکی هێز لەو مەیدانەدا ڕۆڵ دەبینێ، هێزی مادی و مەعنەوی، هێزی تیرە و هۆز بەهێزترین هێزە بۆ بردنەوەی گرەوی سەرکردایەتی(12)، کە وا بێت کێشمەکێشی هەموو ئەو گروپانەی کەچ لە مێژوودا و چ لە ئێستاشدا بانگەشەی تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامی دەکەن و لە بەرامبەردا هەموو ڕێگە و هۆکارەکانی توندوتیژی و زەبروزەنگ و تیرۆر دەگرنە بەر پاش تەکفیرکردنی بەرامبەر بە ناوی دەقەکانی ئاینەوە، ئەوا ئەو گروپانە شەرعیەتی ئاینیان نییە و دەیانەوێ دەقەکانی ئاین بسیاسێنن لەپێناوی بەرژەوەندی و ئامانجە دنیایی و سیاسییەکانی خۆیاندا کە دەستگرتنە بەسەر دەسەڵات و پلەوپایە سیاسییەکاندا. چونکە هەر وەك (سەمەرقەندی) دەبێژێت:" کاروباری دنیا لەسەر بەرژەوەندی خێرا دامەزراوەو لەکاترمێژێکەوە بۆ کاتژمێرێکی تر لەوانەیە بگۆڕێت "(13) .

بەڵگەیەکی دیکە لەسەر ئەوەی کە زیاتر چەمکەکانی نێو تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامی لەبەر بەرژەوەندی دەستکاری کراون، ئەگەر سەیری پێناسەی هەر یەکە لە چەمکەکانی وەکو، (خەلیفە و دەسەڵاتدار و ئیمام ...تاد) بکەین دەبینین پێناسەکان جیاوازن لە یەکتری بەجۆرێك:

*خەلیفە یان جێنشین: واتە جێگری پێغەمبەر (د.خ) کە بەردەوام وەزیفەی ئەو لە خۆدەگرێ.
*ئیمام: ئەو کەسەیە کە لە کاتی نوێژدا سەرکردایەتی موسوڵمانان دەکات، واتە بەرپرسیارە لە سەرکردایەتیکردنی رۆحیدا.
*دەسەڵاتدار: ئەو کەسەیە کە مومارەسەی دەسەڵات بە مانا سیاسی و دنیاییەکەی دەکات، بۆیە خەلیفە و ئیمام بەرپرسیارێتی رۆحی لە خۆدەگرن، بەڵام دەسەڵاتدار ئەو کەسەیە کە هەر کات ویستی سەرکردایەتی رۆحی و دنیایی تێکەڵ دەکات، یاخود لە یەکتریان جیادەکاتەوە، هەر وەك دەسەڵاتدار بریتییە لەوەی کە مومارەسەی دەسەڵاتی وەرگیراو لە رێگەی هێزەوە دەکات، بەوەش دەتوانین دیسان جیاوازی بکەین لە نێوان خەلیفە و دەسەڵاتداردا.(14)
کە هەندێك لە هێزە ئاینییەکان لە کۆن و نوێدا بۆ مەرامی تایبەتی خۆیان تێکەڵیانکردووە. بەڵگەی زیاتریش لەسەر ئەوەی کە ئەم تیۆرە لە نێو ململانێکانی مێژوو، کلتوری ئیسلامییەوە سەرچاوەی گرتووە، بریتییە لە سەرهەڵدانی جەنگی هەڵگەڕاوەکان (المرتدین) لە سەردەمی خەلیفە ئەبوبەکردا، ئەم جەنگە خۆی لە خۆیدا گوزارشتێکی دیکە بوو لەسەر ئەوەی تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامی پەیوەندی بە ئاین و دەقە شەرعیەکانییەوە نییە و پەیوەستە بە دنیاوە، هەروەك جەنگی هەڵگەڕاوەکان، کەوا ناسراوە لە مێژوودا، بەڵگە بوو دیسان لەسەر ئەوەی کە دەقێکی شەرعی نییە لەسەر بوونی سیستەمێکی سیاسی لە قورئاندا بەو شێوازە خوازراوەی کە بسەپێنرێ بەسەر مرۆڤەکان و کۆمەڵگەدا. بەڵکو ئەم سیستمە وەك بەرهەمهێنانێکی مێژوویی لەئیرادەی مرۆییەوە پەرەی سەندووە(15). هەروەك ناکرێ ئەوانەش بە هەڵگەڕاوە لە ئیسلامیان ناوزەد بکەین، چونکە تەنها ئامادە نەبوون زەکات بدەن بە خەلیفە ئەبوبەکر و وازیان لە بیروباوەڕەکانی تری وەك (نوێژ و رۆژ و حەج و...تاد) نەهێنا بوو، (ئیبن کەسیر)یش لەم بارەیەوە دەڵێت : " ناکرێ ئەمانە بەهەڵگەڕاوە (مرتد ) لە قەڵەم بدەین، چونکە نوێژ و ڕۆژوو دەگرن،

بەڵام زەکاتیان نەداوە ئەویش لەبەر زۆر هۆ و لە ژێژ رکێفی خەلیفە ئەبوبەکر دەرچوبوون".(16) بۆیە دواتریش لە قۆناغەکانی تری مێژووی فەرمانڕەوایی ئیسلامیدا ئەم ململانێیانە لەسەر وەرگرتنی پۆستی جێنشینی دەسەڵاتی سیاسی درێژبوونەوە وەك هەوڵەکانی موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان کە تەنانەت دوای خۆی لە بنەما هەرە سەرەکی و بنەڕەتیەکانی ئیسلام لایدا لە بواری دەسەڵاتدا کە پەیرەوکردنی سیستمی پشتاوپشت بوو لە جیاتی راوێژ و شورا دوای خۆی و رازی نەبوو جگە لە یەزیدی کوڕی کەسی دیکە بیٚ بە خەلیفە و دوای ئەمانیش هەر لە بنەماڵەی ئومەوییەکاندا پاش روداوی خوێناوی (مەرج رەهت) لەساڵی ( 65ك). دەسەڵات کەوتە دەست بنەماڵەی مەروانییەکان و کۆتایی دەسەڵاتی ئومەوی لەلایەن عەباسییەکانەوە هات و وردە وردە ئەوانیش لەسەر خەلافەت چەندین کێشەی تریان دروستکرد و لە دەست عەباسییەکانیشدا نەما و کەوتەدەست بنەماڵە فەرمانڕەواکانی تورك و فارسەکان و بوەیهی و سەلجوقی بەمجۆرە تێگەیشتین کە تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامی لە نێو کلتور و مێژووی ئیسلامیدا چەکەرەی کردووە و پەرەی سەندووە و پاڵنەرەکانیش بەرژەوەندی دنیایی بوون نەك بەڵگەی دەقە شەرعییەکان.

## بەشی دووەم

## (تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامی و پاڵنەرەکانی سەرهەڵدان و بەرهەمهێنانی توندوتیژی ئاینی)

گرنگە لەم بەشەدا راستەوخۆ پاڵنەرەکانی سەرهەڵدان و بەرهەمهێنانی توندوتیژی و تیرۆری ئاینی دەستنیشان بکەین، ئەوەی پێشوەخت پێویستە

قسەی لەسەر بکەین بریتییە لەوەی کاتێك ئەوگریمانەمان بەرجەستەکردووە کە تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامی کاریگەری و رەنگدانەوەی لەسەر سەرهەڵدان و بەرهەمهێنانی توندوتیژی و تیرۆری ئاینی هەیە، ئامانجی ئەم توێژینەوەی و هەوڵەکانی پشت ئەم ماندووبوونە ئەوە نییە کە ئەم تیۆرە لە بنەرەتدا توندوتیژی و تیرۆری ئاینی بەرهەمدێنی، بەڵکو گرفتەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە نێو ئەم تیۆرەدا و بەم خوێندنەوە تەقلیدی و سیاسییە بەرژەوەندیخوازانە ئەبستراکتەی ئەو هێزە ئاینیانەی ئەمڕۆ بە ناوی ئاینەوە توندوتیژی و تیرۆر بەرهەمدێنن دوور لە گوتاری رۆحی و گەردوونیانەی ئاینی ئیسلام چەندین بابەتی هەستیاری تێدایە ئەو بابەتانە پاڵنەری سەرەکین بۆ بەرهەمهێنانی توندوتیژی ئاینی نەك لە بنەڕەتەوە ئەو گریمانە فەرزبکەین کە خودی ئاین و تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامی تیرۆر و توندوتیژی بەرهەمدێنیٚ، چونکە لەو خوێندنەوە جیاوازانەی هێز و گروپە ئاینییەکاندا بۆ تیۆری دەسەڵات چەند تەوەرێك بەدیدەکریٚ کە دەبنە مایەی سەرهەڵدانی توندوتیژی ئاینی و رەشەکوژی مرۆڤ، وەك( رەفزکردنەوە بنەماکانی پێکەوەژیانی ئاشتیانەی نێوان بیروڕا جیاوازەکان و مەسەلەی دابەشکردنی کۆمەڵگە و جیهان بۆ دوو بەرەی سەرەکی، کە بەرەی کوفر و بەرەی ئیمانن، یاخود بەرەی تاریکی و گومڕایی و بەرەی روناکی و هیدایەت، یاخود سەپاندنی ناسنامەی نەفامی و جاهیلی بەسەر جیهان بە گشتی و تەنانەت بەسەر ئەو کۆمەڵگایانەشدا کە زۆربەیان موسوڵمان پێکدەهێنن، یاخود درێژەدان و رەوایەتیدان بە تەکفیرکردنی بەردەوامی کۆمەڵگە و رەوایەتیدان بە نەهێشتنی ئەو کوفرە لەدنیادا)، لە ئاکامدا رەوایەتیدان دەبێت بە کردەوەی توندوتیژی و تیرۆریستی بە مانایەکی تر ناکریٚ کاریگەری دید و تێڕوانینی سەلەفیانە بۆ ئاین و ژیان و کورتکردنەوەی پەیامی ئاین بۆ چەند پەرستشێکی رووت بە پاڵنەرێکی کاریگەر وێنا نەکەین بۆ سەر کوشتنی رۆحی نوێبونەوەی گوتاری ئاینی کە دواجار پیرۆزکردنی تیۆری دەسەڵاتخوازی

ئیسلامی لێدەکەوێتەوە لە سەرووی ئەمانەوە پێویستە دەربارەی میتۆدی پەروەردەیی ئەو هێز و گروپانە بدوێنین کە رۆژانە نەوە لە دوای نەوە بەرهەمدێنن و بوونی پەروەردەی توندوتیژ، کەسایەتی توندوتیژی لێ بەرهەمدێت، جگە لەوەش دەکرێ ئەوە بڵێین کە لە دەرەوەی گوتاری دەسەڵاتخوازانەی هێز و گروپە ئیسلامیە توندڕەوەکانی وەکو (قاعیدەو تالیبان و...تاد)باس لەو عەقڵیەتو بیرکردنەوە شەڕانگێزییەش بکەین کە لە دنیای ئەمڕۆدا بوونی هەیە، کە وڵاتە زلهێزەکان بۆ قووتدانی وڵاتە بچووکەکان پەیڕەوی لێدەکەن، لە ریزی پێشەوەشیان وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکایە. بێگومان ئاکامی برەودان بەم عەقڵیەتە شەڕانگێزییە ئاسۆکانی ژیاندۆستی و پێکەوەژیانی ئاشتیانەی نێوان گەلان و ئاین و نەتەوە و بیروباوەڕە جیاوازەکان بەرتەسکتر دەکاتەوە و لە جێگەیدا لەبری گوتاری مرۆڤدۆستانە گوتاری مەرگدۆستیو کوشتار بەرهەمدێنێتەوە و دواجار لەدەستدانی دەسکەوت و بنەماکانی پێکەوەژیانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لێدەکەوێتەوە و ژیان بەرەو کەنارەکانی تیاچوون راپێچ دەکات.

## باسی یەکەم:

## پێناسەکردنی چەمکی نەفامی لای:

**( ئەبوعەلای مەودودی و سەیدقوتب و گرفتی خوڵقاندنی گوتاری توندتیژیی ئاینی )**

لە باسکردنی تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامیدا ناکرێ باس لە بیروڕاکانی هەر یەکە لە (ئەبوعەلای مەودودی و سەید قوتب)نەکەین لە دوو ژینگە و لە دوو قۆ ناغی جیاوازدا، چونکە بیروڕاکانی ئەم دووکەسایەتییە ئیسلامییە گەورەترین کاریگەرییان هەبووە لەسەر برەودانی هێزە ئیسلامییەکان بە تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامی و گرتنەبەری هەموو

**ڕێوشوێنێك بە ڕێوشوێنی توندوتیژیشەوە بۆ گێڕانەوەی حاکمیەت و دەسەڵاتی ئیسلامی بۆ کۆمەڵگە و زەوی واقیع، لەلایەکی ترەوە ئەم دووکەسە بیر و راکانیان یەکجار توندووتیژن دەربارەی تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامی و بابەتە پەیوەندیدارەکانی ناوی، بە شێوەیەك پێناسەکردنی ئەم دووکەسایەتییە بۆ چەمکی نەفامی و تەکفیر و ڕەفزکردنەوەی پێکەوە ژیان، ئایدۆلۆ جیای زۆرێك لە هێزە ئیسلامییەکانی دوێنی و ئەمڕۆش پێك دێنیٚ و لەخۆدەگرێت هەرچی( ابو علای مەودودی)یە کە لە ( ئاورنگ ئاباد ) لەسالی** (1903 **ز) لەدایك بوە ئەو بارودۆخانەی لە هندستان مسوڵمانانی تێدا ژیاوە و چەوسێنراوەتەوە لەلایەن هندۆسەکانەوە و هاوکات هەژمونێکی گەورەی کۆڵۆنیالیزمیشان لەسەر بووە، ئەمان پاڵنەری سەرەکی بوون بۆ داڕشتنی بیر و راکانی مەودودی، بە جۆرێك مەودودی لەپێناسەکردنی نەفامیدا (جاهلیەت) کەوەك چەکێکی مەعریفی بەکاری هێناوە بۆ ڕەفز کردنەوەی فیکر و فەلسەفەی خۆرئاوا و ئەو ژیانە کۆمەڵایەتییەی کە لە هندستاندا باو بووە. دواتر ئەم پێناسەکردنە سەری کێشاوە بۆ ئەوەی کەبڵیٚ:"فیکری مسوڵمانان، فیکرێکە ، بەویراسەت و پشتاوپشت ماوەتەوە و فیکرێکی نەفامییە و هەموو ئەو شتانەش کە لە شارستانییەتی خۆرئاوا وەرگیراوە، بریتیە لە نەفامییەکی نوێی هاو چەرخ"، هاوکات ئەو شارستانییەتەش کە موسڵمانان لە قورتوبە و بەغداد و دەلهی و قاهیرە هەیان بووە، لای مەودودی ڕەفز دەکرێنەوە و بڕوای وایە کە ناکریٚ لەمێژوودا بە ئیسلامی ناو ببرێن، بەڵکو دەبێت لە تۆماری ستەمکاری و ڕەشەکوژیدا تۆمار بکرێن و مەودودی وا دەبینیٚ کە هیچ جیاوازیەکیش لە نێوان هاوەڵدانان بۆ خودا و نەفامیدا لە روووە زانستییەکەیەوە نییە و هەموو شارستانییەتی خۆرئاواش بە نەفامیەکی رووت دەداتە قەڵەم.**(17)

**بۆیە ئەم پێناسەکردن و هەڵسەنگاندنەی مەودودی بۆ چەمکی نەفامی، یەکجار هەڵسەنگاندنێکی ترسناکە و کاردانەوەی دەبیٚ لەسەر سەرهەڵدانی**

سەرە تاکانی توندوتیژی و تیرۆری ئاینی، چونکە ئەم پێناسەکردنە تائێستاش زۆر هێزی ئیسلامی پشتی پێدەبەستن.

بەدەر لەمەش مەودودی قەناعەتی وایە کەواقیعی ئیسلامی بریتییە لەو واقیعەی کە تێکەڵییە کە لە ئیسلام و نەفامی زۆربەی مسوڵمانان ئاینەکەیان دڵسۆزانە بۆ خودا نییە بەو شێوەیەی کە مانای ئاین داوای دەکات و ئەیگرێتەخۆی، تەنانەت توندتر دەڕوات و ئەوە رەفزدەکاتەوە کە ئیسلام لە هەندێ کۆمەڵگەدا لە 99٪ ی لە موسڵمانان پێکهاتبێت. ئەم دید و تێڕوانینە بۆ پێناسەکردنی چەمکی نەفامی و کۆمەڵگە، ئاسۆکانی توندوتیژبوونی گوتاری ئیسلامی فراونتر دەکات و شەرعییەتی پێدەدات. چونکە ئەگەر هاتوو کۆمەڵگە نەفام وجاهیل بێت، ئەوا شەڕکردن لە دژی ئەو نەفامییە کە لە ناوەڕۆکیشدا لە تێڕوانینی مەودودیدا بریتییە لە هاوەڵ دانان بۆ خودا دەبێتە واجب و پێویستی سەرشانی مسوڵمانان، چونکە لەلایەکیتریشەوە مەودودی دەڵێ: " هەموو ئەو کۆمەڵگایانەی حاکمیەتی خودا و شەریعەتی ئیسلامی و فەرزە کۆمەڵایەتیەکان پراکتیك ناکەن، ئەوا بریتین لە کۆمەڵگای نەفامی" (18).

هەرچی تێڕوانینی (سەید قوتب)یشە بۆ پێناسەکردنی نەفامی، ئەوا دەتوانێن بڵێین کە توندوتیژترە، چونکە سەید قوتب کاتێك دەستی پێکرد کە مەودودی کۆتایی هات، یاخود بە شێوەیەکی تر سەید قوتب لەو جێگایەوە لە تیۆری دەسەڵاتخوازی ئسلامیدا بیروڕاکانی داڕشت کە مەودودی کۆتایی پێهێنابوو سەید قوتب دەربارەی پێناسەی نەفامی دەڵێ: " کۆمەڵگەی نەفامی هەموو ئەو کۆمەڵگایانە دەگرێتەوە کە تەنها بەندایەتی و ملکەچی بۆ خودا ناکات"، بەمەش هەموو کۆمەڵگەکانی ئێستای سەرزەوی دەگرێتەوە و تەنانەت سەید قوتب توندوتیژتر لەمە دەڕوا و پێیوایە کە هەموو ئەوانەی لە دەور و بەمان دەژین و بوونیان هەیە هەموویان نەفامین، ئەمەش بەپاڵپشتی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ:( ومن لم يحكم بما انزله الله فا ولئك هم الكافرون )الما ئدە/44، ئەوەی زیاتر بیروڕاکانی سەید قوتب بەرە و توندوتیژی ئاینی

دەبات ئەوەیە کە سەید قوتب بەکارهێنانی هێز بۆ نەهێشتنی ئەو نەفامییەی کە سەراپای کۆمەڵگەی گرتوەتەوە بەرەوا دەزانیٚ، بەجۆرێك دەڵیٚ :" بێگومان بۆ دامەزراندنی مەملەکەتی خودا لەزەویدا پێویستمان بەتێکشکاندنی مەملەکەتی مرۆۊ هەیە، مەملەکەتی خودایش لە زەویدا دانامەزریٚ کەحاکمیەتی خودا تیایدا بالاٌدەست نەبێت و سەروەرێتی شەریعەتی خودا بالاٌدەست بێت و یاسا مرۆییەکان هەڵبوەشێنرێنەوە" ( 19 ) بەدەرلەمەش سەید قوتب بۆ گێڕانەوەی حاکمیەتی خودا لە نێوکۆمەڵگە، ڕەوایەتی دەدات بەپێکهێنانی گروپی ئیسلامی و دەبیٚ ئەو گروپە سەرجەم سەرچاوەکانی نەفامی رەفز بکاتەوە و سەرەتا لەو کۆمەڵگایانەدا کۆچ بکەن، کە نەفامی تیایاندا بالاٌدەستە و دواتر لە رێگەی جیهاد و هێزەوەکاربکەن.

## باسی دووەم

## ( تەکفیرکردنی کۆمەڵگە و دابەشکردنی جیهان بۆ بەرەی کوفر و بەرەی ئیمان، گرفتی رەوایەتیدان بەتوندوتیژی و کوشتار )

هەر لەدیدی مەودودی و سەید قوتبدا، کاتێك چەمکی نەفامی ساغدەبێتەوە و زەرورەتی نەهێشتنی ئەو نەفامیە بەپێوست و ئەرکی سەرشان دادەنریٚ هەر لەڕیزی ئەو پێناسەکردنەی نەفامیدا رووە و کۆمەڵگە، پاشان تەکفیرکردنی کۆمەڵگە و دەسەلاٌت دێتە ئاراوە و کۆمەڵگە بۆ دوو بەرەی سەرەکی دابەشدەکرێت، چونکە پاشئەوەی بیرۆکەی حاکمیەتی خودا جێی خۆدەگریٚ، بیرۆکەی بە کافردانانی دەوڵەت و پاشتر بە کافردانانی کۆمەڵگە دێتە ئاراوە، بەدوای ئەوەدا ئیتر خراپبوونی بارودۆخ بەردەوام دەبێت و بیرۆکەیەکی توندوتیژ پەیدادەبێت، دەربارەی رووبەروبونەوە لەگەڵ دەوڵەتو دەسەلاٌتی کافردا و دواتر کۆمەڵگەی کافر لەم نێوەندەشدا توندوتیژی و

**تۆقاندنی ئاینی لە شێوەی تۆڵەسەندنەوەدا دەگوێزرێتەوە بۆ شێوەی کودەتایەك(20) دەکرێ لێرەوە ئەوە ڕوون بکەینەوە کە پرۆسەی تەکفیر کردن بڕیارێکی قیامەتی نییە، بەڵکو بڕیارێکی دنیاییشە و گەلێك سامناکە، بە کافرکردن، تۆمەتبارکردنێکی سەرتاپاگیرە، حەڵاڵکردنی خوێن و مانە، سڕینەوەی کەسی بە کافرکراوە لە بووندا، بنەبڕکردنی کەسێکە، هەرکە ئەم ئاوەڵناوەی پێوەلکێنرا. بە کافرکردن بڕیاردانە لەسەر لەداردان و جێبەجێکردن و ویژدانێکی خۆشنووە، لەبەر ئەوە دەبێتە واجبێکی ئاینیو لە دنیادا پاداشتی دەدرێتەوە و لە رۆژی دواییشدا بەرەو بەهەشت دەکەوێتەڕێ، مادەم ئەو کافرەی کوشتووە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە تەکفیر یەکێکە لە مافەکانی خودا و هەرگیز مافێکی بەشەر نییە. بۆیە هەر کاتێك کەسێك بە هەر پاساوێکەوە تەکفیر دەکات، ئەوە لە بنەڕەتدا مافێکی ئیلاهی و خودایانەی بە خۆی بەخشیوە و لە هەمان کاتیشدا مافێکی خودای زەوتکردووە (21). مەسەلەی تەکفیرکردنی کۆمەڵگە لای مەودودی ئاستێکی توندوتیژ لە خۆدەگرێت، بە جۆرێك نامسوڵمان کافرنییە، بەڵکو هەموو کۆمەڵگە ئیسلامییە هاوچەرخەکان بە درێژایی قۆناغە مێژووییەکان بە کافر دادەنێ. تەنانەت مەودودی بیرۆکەی نەتەوایەتی و نیشیمانپەروەری رەتدەکاتەوە و بە نەفامی لە قەڵەمی دەدات و پێیوایە بەتەواوی لەگەڵ پرنسیپەکانی ئیسلامدا جیاوازە و تێکەڵکردنی وشەی موسڵمان و نەتەوەیی کارێکی سەیرە. بەوەش رادەی توندوتیژی بیروڕاکانی (مەودودی)مان بۆ دەردەکەوێت. کاتێك دەڵێ:"دوژمنی بانگەوازی ئیسلام، بریتیە لە شەیتانی جنس و نیشتمان". (22)**

**هەرچی تێڕوانینی (سەید قوتب)ە، دەربارەی تیۆری تەکفیرکردن، ئەوا دوورتر و فروانتر ئەم تیۆرە بە کاردێنێت، بە شێوەیەك لای سەید قوتب هەموو ئوممەت، نەك تەنیا کۆمەڵگە، تەکفیردەکات. ئەگەر هاتوو بەتەواوەتی ملکەچ نەبن بۆ حاکمیەتی خودا. کاتێك دەڵێ:"ئەو خەڵکانە، موسوڵمان نین، هەروەك بانگەشە دەکەن، بەڵکو بە ژیانێکی نەفامییانە ژیان بەسەردەبەن، ئەمە**

ژیانێکی ئیسلامی نییە و ئەوانەش موسوڵمان نین."(23)، چونکە لای سەید قوتب هەموو خەڵك لە کوفری بیروباوەڕی و عەقیدەدا نغرۆ بوون، بەمەش لێرەوە دابەشکردنی جیهان و کۆمەڵگە دێتە ئاراوە کە لە دنیابینی سەیدقوتبدا ئەو زەویەی کە ملکەچ نابێ بۆ حاکمیەتی خودا بریتییە لە(دار الکفر و دار الحرب )، بەچاوپۆشین لەو ئاینەی کە دانیشتوانەکەی پەیڕەوی لێدەکەن، کاتێکیش زەوی ئیسلام، یاخود دەوڵەتی ئیسلامی دروستدەبێت کە حاکمیەتی تێیدا بۆ خودا بێت و سیستەمێکی ئیسلامی تێیدا پراکتیك بکرێ. بەمەش سەید قوتب پێکهاتە ناکاتە پێوەر، بەڵکو پەیرەوکردنی حاکمیەتی خودا دەکاتە پێوەر بۆ ئەوەی ئەو کۆمەڵگە و زەویە بە (دارالسلام یاخود دار الاسلام) بناسێنێ. بەوەش دوای قوتب و مەودودی کەسانی تری وەکو (سەعید حەوا و فەتحی یەکون و کەسانیتر) هاتن کە بایەخی زیاتریان بە تیۆری تەکفیرکردندا بە جۆرێك کوشتن و کاری توندوتیژییان شەرعیەت پێدا، بە جۆرێك (فە تحی یەکون) بوونی بزوتنەوە ئیسلامییەکان بە پێویست دەزانێ بۆ کوشتاری سیستەمەدانراوە فەرمانڕەواکان، ئەمەش بەربەست و ڕزگاربوونە لە فەرمانڕەوایەتی کردنی شارستانییەتی خۆرئاوا کەپڕە لە کوفرو ستەم (24). تەنانەت ڕەوایەتیدان بە کوشتاری دوژمن لەنێو تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامیدا وردتر کراوەتەوە و سیستماتیزە کراوە لە نێوکاری ڕێکخستنی هەندێ لە هێزە ئیسلامییەکاندا و ڕێوشوێن و دەزگای تایبەتی بۆ دانراوە. ئەگەر بڕوانینە کۆمەڵی برایانی موسڵمان (اخوان مسلمین) لە میسر، کە بە دایکی حیزبە ئیسلامییەکانی جیهان بە گشتی دادەنرێت، تێبینی بوونی دەزگای نهێنیو تایبەت دەکەین، کە ئەرك و وەزیفەی ئەم دەزگایە کوشتن و تیرۆرکردنی نەیارانی کۆمەڵە بووە و چەند بەڵگەنامە و ئیعترافی کارە توندوتیژیەکانی ئەم دەزگایە هەیە و بڵاویش کراوەتەوە بە جۆرێك( محمود الصباغ ) کە یەکێك بووە لەسەر کردەکانی ئەم دەزگایە دەڵێ: "ئەندامانی دەزگای تایبەت مافی ئەوەیان هەیە بێ ئەوەی پرس بەکەس بکەن، هەر

دوژمنێکی سیاسی خۆیان بیانەوێت تیرۆر بکەن، چونکەئەندامان هەموویان ئاگاداری فەرمانی پێغەمبەری خودان لە حەلاڵکردنی خوێنی دوژمنانی خودا و پێویستیان بە فەرمانێك نییە لەلایەن سەرکردە ( حسن البنا )وە دەربچێ"(25).

هاوکات رێگەدراوە بەم دەزگایە ئەم مافانەی هەبێ:

1.کوشتنی مرۆڤی کافر.

2.تیرۆرکردنی هەموو کەسێ یارمەتی مادی و مەعنەوی کافران بدا.

3. سیخوریکردن دروستە بەسەر دوژمنانی موسڵمانانەوە.

4. دروستە بڕیاردان بە گوێرەی بەڵگە و نیشانە.(26)

مەترسی ترسناکی رەوایەتیدانی کوشتن لەلایەن ئەم دەزگایەوە بۆ دامەزراندنی دەسەلاتی ئیسلامی دەگاتە رادەی رەوایەتیدان بە کوشتنی کەسی موسلمانیش بەجۆرێك رێنماییەکان دەڵێن: "ئیمە لەسەر ئەو سیاسەتە دەڕۆین کە دروستە موسلمانیش بکوژرێت، ئەگەر بەرژەوەندی هەبوو لەو کوشتنەدا، ئەگەر دەسەلاتی ئاینی نەبوو بەو کارە هەستێ، ئەوا ئەو کەسانەی خۆیان تەرخانکردووە بۆ خزمەتی ئیسلام دەبێ ئەو کارە بکەن و یاسای ئیسلام گوێنادات بەوەی ئەگەر کوژرانی موسلمانێك دێتە ئاراوە، ئەگەر بەرژەوەندی تێدابێت(27). لێرەوە تێبینی دەکەین، کەچەندە ڕەوایەتی دراوە بەکوشتن، تەنانەت موسڵمانیش دەگرێتەوە، لە کاتێکداخودا بۆخۆی کوشتنی ناڕەوای موسڵمانی بە تاوانی زۆر گەورە وەسف کردووە، کاتێك دەفەرموێ: "ومن یقتل مومنا متعمدا فجزائە جهنم وبئس المصیر" یان دەفەرموێت:" من قتل نفسا بنفس او فساد فی الارچ، فکانما قتل الناس جمیعا".

## باسی سێیەم

## ( تێڕوانینی سەلەفیانە بۆ ئاین و ژیان .. ڕەفزکردنەوەی پێکەوەژیان .. کوشتنی گوتاری نوێبوونەوە.. برەودان بە عەقڵیەتی شەڕانگێزی )

دەشێت تێڕوانینی سەلەفیانە بۆ ژیان و خودی ئاینیش، ڕەنگدانەوەی هەبێ لەسەر ڕەفزکردنەوەی پێکەوەژیان و سەرهەڵدانی توندوتیژی ئاینی، چونکە کورتکردنەوەی هەموو ئاین لە چوارچێوەی کۆمەڵە سروت و پەرستشێکدا، یاخود تەنها لە دەسەلاتی سیاسی و فەرمانڕەوایەتیدا، کاریگەری نیگەتیفی لەسەر لایەنەکانی ژیانی مرۆڤایەتی بەجێدێڵێت، چونکە ئەگەر هەموو وەزیفەی ئیسلامی دەسەلات بێ، ئەوا وەزیفەی موسڵمانان جیهاد و تێکۆشان دەبێ بۆ هەرچی زووتر و خێراتر گێڕانەوەی ئەو دەسەلاتە و گرتنەبەری ڕێوشوێنەکان بە کردەوەی توندوتیژیشەوە. ئەم دیدە سەلەفیانە دەبێتە هۆی کوشتنی هەموو ماناکنی تەساموح و لێبوردەیی و پێکەوەژیان، لە بنەڕەتەوە ئیسلام بۆ بلاوکردنەوەی ئەم چەمکانە هاتووە و ئامانجی رزگارکردن و ئاسودەکردنی مرۆڤەکانە. هاوکات سەپاندنی ئەم دیدە سەلەفیانە دواجار سەپاندنی تاکڕەوی و فەردانییەتی ئاینییە و نەهێشتنی دەرفەتی پێکەوەژیانە بۆ هەموو ئەوانیتر کە لە دەرەوەی سەلەفیەتی ئاینی بیردەکەنەوە، چونکە بەهیچ جۆرێك ڕێگەنادەن بە لێبوردەیی و فرەیی و پلورالیزم و پێکەوەژیانی ئاشتیانە، گرفتی ئەم دیدە سەلەفیانە لەدروستکردنی توندوتیژی ئاینیدا، پاش ڕەفزکردنەوەی پێکەوەژیانو لێبوردەیی، لەوەدایە کە تێڕوانینێکە بۆ ئیسلام و بایەخی پلە یەك دەداتە خوێندنەوەی حەرفی قورئان، نەك بە فراوان سەیرکردنی قورئانو فەرموده (29 ). هەروەها تاوتوێکردنی ژیان و واقیعی کۆمەڵگەکان لە کۆنەوە تا ئێستا. جگە لەوەی کە بالادەستبوونی ئەم دیدە

سەلەفیانە لە نێو تیۆری پەروەردەی هەندێ لە هێزە ئاینییەکاندا زەیینەی کوشتنی رۆحی نوێبوونەوەی گوتار و پەیامی ئیسلامی بەرتەسکتر دەکاتەوە ئەوەی لەمڕۆدا دەیبینین ئیسلام پەیامی نوێبونەوەی خۆی لەدەستداوە، هۆکارەکەی زاڵبونی ئەقڵیەت و بیر کردنەوە و تێروانینی سەلەفیانەی ئەبیسترا کە هەم بۆ ئاین و هەم بۆ ژیانیش، کە ئیسلام تەنیا لە عیبادەت و دەسەڵاتی سیاسیدا دەبینێتەوە و دەروازەکانی ئیجتیهاد و نوێبوونەوەی ئاینی هێندەی تر دادەخات و بەمەش بانگەشەکردنی رووت بۆ دەسەڵاتی سیاسی، لە راستیدا جۆرێکە لە راکردن لە واقیع و کێشەکانی کۆمەڵگە(30).

گوتاری دەسەلاتخوازی ئیسلامی لەمرۆدا و پێشتریش لە شاخەکانی (تۆرابۆرا)ی ئەفغانستانەوە بە زمانی عەرەبی و جیهانی و ئیسلامی پێمان دەڵێ: "شەڕی کوفر و ئیمانە و کەچی حسابەکەش لە وڵاتی عێراق یەکلاییدەکەنەوە بە گشتی مەغزاکانی شەڕەکە زۆر لە یەکەوە نزیکن، رەفزکردنەوەی پێکەوە ژیان و زیندووکردنەوەی دیالۆگ شارستانیانەیە و برەودانە بە عەقڵیەتی رەشەکوژی و تیرۆر(31) بۆیە درێژەدان بەم ئەقڵیەتە شەڕانگێزییەش لە خزمەتی بەرژوەندی هێزە ئاینییەکاندایە، کە هێندەی تر میتۆدی پەروەردەیی خۆیان پڕدەکەن لە گوتاری دەسەڵاتخوازی و رەوایەتیدان بە گرتنەبەری کرداری توندوتیژی لەم نێوەندەشدا تەنها مرۆڤە هەژارەکان زیاندەکەن و مەوداکانی پێکەوەرژیان و گفتو گوَی شارستانی و بەرەو تیاچوون دەچێت بۆیە پێویستمان بە فراوانکردنی بازنەکانی یەکتر قبوڵکردن و نوێبونەوە و پێکەوە ژیان هەیە. هەروەك تیۆری دەسەڵاتخوازی ئیسلامیش پێویستی بە تەفسیرکردنەوە و خوێندنەوەی نوێ هەیە بۆ ئەوەی دەرفەتی فراوانی توندوتیژی ئاینی لەمڕۆدا کەم بکرێتەوە و هەموو پەیامی گەورەی ئیسلام لە چوارچێوەی دەسەڵاتی سیاسیدا بچووك نەکرێتەوە و ئیسلام مایەی ئاسوودەیی بێت نەك تۆقاندن کە دژی ژیانی مرۆڤایەتیە.

## دەر ئەنجام:

لەم توێژینەوەیدا پاش تاوتوێکردنی تەوەرە و بابەتەکانی، گەشتین بە چەند زانیارییەك تیایدا:

*تیۆری دەسەڵاتخوازیی ئیسلامی لە بنەڕەتدا سیمایەکی دنیایی پەیوەست بە ژیانی خەڵك و کۆمەڵگاوە هەیە و جێهێلراوە بۆ مرۆڤەکان بۆ ئەوەی خۆیان جۆری دەسەڵات و شێوازی فەرمانڕەوایی دیاریبکەن نەك بنەمایەکی ئاینی هەبێت و سەپێنرابێ بەسەریاندا بەوەی شێوازێکی دیاریکراو لەسیستەمی فەرمانڕەوایەتی قبوڵبکەن.

* مێژووی سەرهەڵدانی تیۆری دەسەڵاتخوازی ئسلامی مێژوویەکە لە نێو کلتور و ململانێی سیاسیی و مەزهەبگەرای گروپە ئاینییەکاندا سەریهەڵداوە نەك لەنێو دەق و تێکستەکانەوە سەرچاوەی گرتبێت بۆیە دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتی کایەکی موقەدەس نییە ئەوەندەی کاروبارێکی دنیایە.

* ڕەنگدانەوەی ئەم تیۆرە دەسەڵاتخوازیە بەوخوێندنەوە کلاسیکیەی کە هەم لە مێژوو و کلتوری ئیسلامیدا ئەنجامی ململانێی هێزە ئاینییەکاندا کە بۆی کراوە و بە ڕەفزکردنەوەی چەند تەوەرەیەکی گرنگی مرۆڤایەتی وەك دیالۆگی شارستانی و پێکەوەژیانی ئاشتیانە کاریگەری دەبێ لەسەر سەرهەڵدان و بەرهەمهێنانی توندوتیژی ئاینی و تیرۆر.

* دەکرێ بڵێن بیروڕاکانی مەودودی و سید قوتب کاریگەریان هەبووە لەسەر بەرنامەی سیاسی گروپە ئیسلامییەکان و گوتارێکیتوندوتیژیان بەخشییە تیۆری دەسەڵات بە شێوەیەك چەمکی نەفامیان دابڕی بەسەر کۆمەڵگاکاندا بەو کۆمەڵگایانەشەوە کە زۆرینەیان موسلمان بوون و دواتر هەستان بە

تەکفیرکردنیان و شەرعیەتیان دا بە دژایەتی و کوشتار لەپێناوی گەڕانەوەی دەسەڵاتی ئاینیدا.

* تێروانینی سەلەفیانە بۆ ئاین و ژیان و کورتکردنەوەی ئاین تەنها لە فۆرمی چەند پەرستشێك و چوارچێوەی دەسەڵاتدا کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر کوشتنی رۆحی نوێبونەوەی ئاینی و برەودان بە ئەقڵیەتی شەڕانگێزی تەنها لەپێناوی بەرجەستەکردنی دەسەڵاتی ئاینیدا، بەمەش بنەماکانی پێکەوەژیانیان رەفزکردەوە و دەرفەتێك نەما بۆ دیالۆگ دواجار ئەم خوێندنەوە تەسکە بۆ ئاین و تیۆری دەسەڵاتخوازیی ئیسلامی کاریگەری هەبوو لەسەر بەرهەمهێنانی ئەقڵیەتی توندوتیژی و تیرۆری ئاینی چونکە شەرعیەت درا بە کوشتنی تەنانەت موسلمانانیش ، ئەگەر هاتو بەرژەوەندی ئاینی هەبوو هاوکاتناکریێ زاڵبوونی ئەقڵیەتی شەڕەنگێزی و چارەسەرکردنی کێشەکانی جیهان لە رێگەی چەك و کوشتارەوە.

لەمڕۆدا لەلایەن ئەمریکا و چەند هێزی جیهانی ترەوە بە پاڵنەرێکی تر نەزانین هەم لە توندوتیژبوونی هێزە ئاینییەکان و سەرهەڵدانی تیرۆر بەگشتی و تیرۆری ئاینی بەتایبەت کە هەموو دەرفەتەکانی پێکەوەژیانی مرۆڤایەتی بەرەو کەنارەکانی تیاچوون بردووە.

***

## پەراوێز و سەرچاوەکان:

1.د. عبدالغنی عماد: حاکمیة اللة وسلطان الفقیة ، قراءة فی خطاب الحرکات الاسلامیة المعاصرة، دارالطلیعة، بیروت، الطبعة الاولی ، حزیران، 1997 ، ص 9 ، 10

2. هەمان سەرچاوە، ص 11، 12

3.سورەتی (النساء) ئایەتی 54

4.سورەتی ( الشوری ) ئایەتی 38

6. عبدالجواد یاسین: السلطة فی الاسلام، الطبعة الا ولی ، 1998، المرکز الثقافی العربی، بیروت، ص 347

7.د. محمود اسماعيل: الاسلام السياسى بين الاصوليين والعلمانين، موسسة الشراع العربى، طبعةالاولى،1993، ص 77
8.موحازەرەكانى د. دلێر ئەحمەد بۆ خوێندكارانى قۆناغى چوارەمى بەشى مێژوو لە زانكۆى سلێمانى لەسەر مادەى ( بیرى سیاسىهاوچەرخ) بۆ ساڵى خوێندنى2001، 2002
9.نياز سعيد على: البحث عن الاسلام السياسى، 2005، ص 50 ، من منشورات مكتب الفكر والتوعية فى الا تحاد الوطنى الكردستانى .
10.ئوميد قەرەداغى : گوتارى ئاين و دەسەلأت ، گۆڤارى ژيار، ژ 1، سالى يەكەم ، 1999، ل67
11.د. حسن ابراهيم حسن: تاريخ الاسلام السياسى والدينى والثقافىو الاجتماعى، طبعة ثانية، ص 204، 205
12.عبدالكريم فتاح: وەستانێك لەسەر مێژووى ململانێى سياسيى و فيكرى لە سەدەى يەكەمى كۆچيدا، گۆڤارى ژيار ، ژ 2، ساڵى يەكەم،2000ز، ل ( 246 )،
13.د. رجب بو ديوس: الا سلام و مسالة الحكم، طبعة الاولى، 2001، تالة الطبعة ولنثر، طرابلس، ص 17
14 ايمن عبد الرسول: فى نقد الاسلام الوضعى، ميريت للنشر والمعلومات، القاهرة ، 2002 ، ص 106
15.د. رجب بو ديوس: الاسلام مسالة الحكم، سەرچاوەى پێشوو، ص 45
16.عەلى محەممەد زەڵمى: خوێندنەوەيەك بۆ دەوڵەت لە كەلتورى ئاينيدا، گۆڤارى ژيار، ژ 1، ساڵى يەكەم، 1999، ل40
17د. عبدالغنى عماد: حاكيمة اللة وسلطان الفقية، سەرچاوەى پێشو ، ص 19،18
18.هەمان سەرچاوە ،ص 20، 22
19.هەمان سەرچاوە، ص 39
20.د. رفعت السعيد: بەناو ئيسلامەكان، تيرۆر و ئاژاوە لەنێو پەيرەوانى ئاينييەكاندا، وەرگێرانى، حەسەن عەبدولكريم، چاپخانەى روون، چاپى يەكەم سليمانى، 2004، ل 75
21.ئەرسەلان تۆفيق محەممەد: مرۆڤ، بەربەرييەت، مۆدێرنيتە، گۆڤارى كاروان، ژ 194، مانگى 5 سالى 2005، ل 111
22.د. عبدالغنى عيماد : حاكمية اللة وسلطان الفقية، قراءة فى خطاب الحركات الاسلامية المعاصرة، دار الطليعة، بيروت، الطبعة الاولى،1997 ، ص23
23.هەمان سەرچاوەى پێشو، ص 42

24.هەمان سەرچاوە. ص 55

25.د. رفعت السعيد: بەناو ئيسلامەكان، سەرچاوەی پێشوو،ل 102

26.هەمان سەرچاوە، ل 103

27.هەمان سەرچاوە، ل 104

28.نياز سعيد على: البحث عن الا سلام السياسى، 2005 ، ل 50، من منشورات مكتب الفكر والتوعية فى الاتحاد الوطنى الكودستاني

29.عەبدوڵڵا قەرەداغی: ئوسوڵیەت: چەمك ، سەرچاوە و ئاسۆ، سليمانی، 2003، ل 53، لە بڵاوەكراوەكانی مەكتەبی بیر و هۆشیاری ( ی. ن. ك)

30.رجب بود بوس: الاسلام ومسالةالحكم، طبعةالاولى، 2001، تالة للطباعة والنشر ، طرابلس، ص 8 پێشەكی

31.ئەرسەلان تۆفيق محەممەد: مرۆڤ، بەربەريەت، مۆدێرنێتە، سەرچاوەی پێشو، ل 111

## تاک و کۆمەڵگا ..... کۆمەڵگا و تاک

**نووسینی**

**نادر رووف**

زانست توانیویەتی ئەوە بسەلمێنێت کە مێشك بە بەهاترین ئەندامە بۆ مرۆڤ ، هەر مێشکیشە بووەتە مایەی هۆشمەندی تاکەکان، ئایا ئەو مرۆڤەی مێشکی بەجێیهێشتووە ئەتوانین بڵێین هۆشمەندە..؟ بەدڵنیاییەوە نەخێر. کەواتە هەموو جەستەی مرۆڤ بەستراوە بە مێشکەوە هەر ئەویشە بووەتە رێخۆشکەر بۆ دروستبوونی ژیانێکی کۆمەلأیەتی و هاوچەرخ ومۆدێرن. بۆیە ناتوانرێت هیچ ئامرازێك بەراورد بکرێت بە مێشکی مرۆڤ، ئایا چ ئامرازێك دەتوانێت وەك مێشکی مرۆڤ بیر بکاتەوە و گۆڕانکاری ورد و بنەڕەتی لە ژیانی تاك و کۆمەڵگا و جیهاندا بکات..؟

بڕوانینە هەر مرۆڤێکی ئەم جیهانە قەبارەی مێشکیان وەك یەکە. پاراوی وکامڵی بەستراوە بە رادەی هۆشمەندی و رۆشنبینی و جوان بیرکردنەوەی تاکەوە. لەبەر ئەمەیە تاکەکان لە تێڕوانینیان بۆ شتە ورد و گەورەکان لە هەر روانگەیەکەوە بێت جیاوازە ئەم جیاوازییە وایکردووە کۆمەڵگای نابەرامبەر دروست ببێت ئەمەش هۆکارێکە بۆ گۆڕانی جیهان لە هەموو روویەکەوە کۆمەلأیەتی، ئابووری، سیاسی.. هتد ئەوەی گرنگە بتوانی توانای هۆشمەندی خۆت بسەلمێنی بۆ دەوروبەرە نزیك ودوورەکان بە تایبەتی لە رۆژگاری ئەمڕۆدا کە سەلماندنی رۆشنفکری کارێکی تا رادەیەك ئاستەم و سەختە. لەبەر ئەوەی جیهانبینی کارێکی وایکردووە کە جیهان مەبدەئی شەفافیەت بکات بە دروشمێك و بەرزی بکاتەوە بە رووی هەموو ولأتانی دنیادا. چاکی و خراپی ئەم درووشمی شەفافیەتەش

بەستراوە بە رادەی رۆشنبیری مرۆڤەکانی ناو کۆمەڵگا جیاوازەکان. ناوەرۆکی بابەتەکانیش بەستراوە بە ناوەرۆکی هۆشەوە، دیارە هۆش پەیوەندییەکی راستەوخۆی هەیە بەراستییەکانەوە چ لە رووی فەلسەفی و چ لە رووی سیاسی و کۆمەڵایەتیشەوە. هێزی تێگەیشتن دەبێتە هێزێکی کارا لە لێکۆلینەوەی بنەما سەرەکییەکانی سروشت بۆ زیندووبوونەوە و بیرروونی خود. گەشەکردنی عەقل هەمیشە دوا نەهاتووە، بۆیە ناتوانین بڵێین عەقل شتێکە دوایی بوونی یان کۆتایی هەیە لە گەشەکردن و لە درککردنی بە گۆڕانکارییە سروشتی و مرۆییەکان و ناتوانێت لەچوارچێوەی بازنەیەکی داخراودا یاری بکات. یاریکردن لەو بازنە سنووردارەدا یاریکردنە بە خودی بیرکردنەوەی مرۆڤ بەڵام ئەمە کارێکە ناتوانرێت بە سانایی ململانێی لەگەڵدا بکەین، چونکە هەنگاوتان بەرەو خواستەکان لێدانە لە هەورازێکی سەخت کە هەزاران نەهامەتی و دەردەسەری لەو رێگایەدا یەخەت پێدەگرێ و زۆر جار مرۆڤ شەکەت ئەبێ. گەیشتنە لووتکە بەرەو ئاسودەیت دەبات و نەخۆشییە دەرونیەکانی ناو کۆمەڵگاش بەرەو پووکانەوە دەچێت ونامێنێت.

لێرەدا مەبەستەکان دەیانەوێت خۆیان شەفافتر بخەنە پێش چاوی خوێنەر. ئەویش فەلسەفەیەکی لێڵ ونادیار نییە بابەتێکی زیندوو و واقیعی ئەمڕۆی تاك وکۆمەڵگا تازە فراژووبووەکانی دنیایە بەتایبەتی کۆمەڵگای کوردی. ئەگەر تاکەکان بکەونە گفتوگۆ زۆر بەوریاییەوە باس لەم قەیرانە ئەکەن، بەڵام ئێمەی مرۆڤ وا راهاتووین و مێژوویەکی دوورمان هەیە کە زۆر جار خۆمان لە راستییەکان ئەشارینەوە. خۆدزینەوە لە واقیعیش کە کۆمەڵگا بەرەو ئاقارێکی خراپ نشیودەکاتەوە، ئەمەوێت لێرەوە تیشك بخەمە سەر بابەتەکە ئەویش ئەوەیە کە ئەمڕۆ کۆمەڵگا تووشی نەخۆشیەکی باوی زەق بووە و چارەسەریشی دروستکەرانی کۆمەڵگا دکتۆرن بۆی، بەڵام تاکەکان زۆر جار ترسنۆکانە مامەڵە لەگەڵ

ڕۆژگاردا دەکەن بۆیە تا بەو زیهنەوە بیر بکەینەوە نابرێینەوە و بە دۆڕاوی ئەکەوینە دوای دەریا نەوەستاوەکەی ڕۆژگار.

گومان لەوەدا نییە کە تاك کۆمەڵگا دروستدەکات، هەرجۆرە کۆمەڵگایەك بێت، گۆڕانی گۆمەڵگاش گۆڕانێکی سروشتی و کتوپڕ نییە میکانیکی وئۆتۆماتیکی نییە شتێك لە دەرەوەی کۆمەڵگادا بێت ئاستەمە بتوانێت گۆڕانکاری لەناو ئەودا دروستبکات کەواتە لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت تا ئەو کاتەی تاك نەیەوێت گۆڕانکاری لە عەقڵی خۆیدا بکات ناتوانێت کار بکاتە سەر ئەو ژینگەیەی کە تیایدا هەڵدەسوڕێت، جا بۆیە دەبێت بیر لەو ڕێگایە بکەینەوە کە بەرەو ئاسودەییمان دەبات، بەردەوامبوون لە ڕێچکەکانی خۆشگوزەرانیمان نزیك ئەکاتەوە، دەبێت ئەو بەردەوامییە بەرەو هاندانمان بەرێت نەك ساردبوونەوە. دەبێت کێ بە ئەرکی خۆی بزانێت..؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەبێت بڵێین بە هەموو مانایەك تاك واتە کۆمەڵگا و کۆمەڵگاش واتە تاك ئەم کارلێککردنی کۆمەڵگا و تاکانە یان تاك وکۆمەڵگایانە دەتوانێت گۆڕانکاری ریشەیی دروستبکات. ئامانجی دروستبوونی کۆمەڵگاش دروستبوونە بە هەموو مانا رەها و تەواوەکانییەوە، ئەگەر تاك بخوازێت کۆمەڵگایەك دروستبکات بە هەموو واتایەك جوان بێت بە مانای جوانی و هەنگاونان بێت بۆ ئاییندە و دووربین و ڕۆشنبین بێت نەك گەڕانەوە بێت بۆ رابردوو، دەبێت بە پێی خواستەکانی کاری تێدا بکات نەك خواستی زۆر و هەنگاوی کورت یان بیەوێت بێتە سەر مێزی رەفایی، چونکە ئەتوانم بڵێم... مێژوو یاریگایەکی کراوەیە من وتۆ و ئەوانیش ئەگەر توانامان هەبێت ئەتوانین جوانترین نمایشی تیا تۆمار بکەین کە بۆ هەتاهەتایی لە زیهنی هاندەراندا ئەمێنێتەوە و ون نابێت و نامرێت.

ئەمە لەلایەك و لە لایەکی تریشەوە درکنەکردنی تاکی کورد بە مەسەلە خودییەکان، لە بەر ئەوەی ئێمە ناتوانین بچینە ناو خودی خۆمانەوە بەکەمترین شێوە نەبێت زۆرترین کاتەکانی ژیانمان بەوە گوزەر ئەکات کە لە دەرەوەی خۆماندا گەمە دەکەین بەتایبەتی گەمەی سیاسی، من پێم وایە تاك کە نەیتوانی تەواو لە خۆی بچێت هەرەسهێنانی لە رووی عەقلی و دەرونیشەوە نزیکە و زۆر جار لە کردارەکانی خۆی ناڕازی دەبێت ئەمەش کاریگەری یان رەنگدانەوەی خراپی دەبێت لەسەر دەوروپشت و کۆمەڵگا. کاتێك کۆمەڵگاو تاك ئەخەینە سەر هێڵێکی راستی لێکۆڵینەوە دەبینین نوێبونەوە و گەشەکردن هەیە دەبێت لە کامیانەوە دەست پێبکەین بۆ ئەوەی گەشەکردنی بنەڕەتی بنیادبنێین. بەدڵنیاییەوە دەبێت لە تاکەوە بێت. بۆیە کە لە تاکەوە دەستمان پێکرد شتی نویٚ سەفەر ئەکات بەرەو دنیای هەبوون و تازەگەری دەتوانێت خۆی بنوێنێت بە مەرجێك ئەوانەی دەخوازن بەپێی خواستەکانیان تێبگەن لە مانای فەنتازیای تازەگەرێتی. کەواتە نابێت بازبدەین بەسەر مەسەلە ناوەکییەکاندا بەو مانایەی لە دەروونەوە دەست پێبکەین تا ئەوکاتەی دەگەینە دەرەوەی دەروون و دەروونەکانی تریش، ئینجا دەتوانین هەنگاو بنێین بۆ کردارەکانی عەقلانییەت، زاراوەی عەقلانیەتیش کاریگەری راستەوخۆ دروستدەکات لەسەر کۆمەڵ و دەرهاویشتەی ئەکتیڤی لێدەکەوێتەوە و ئاشنایەتی دروستدەکات لە نێوان تاك و کۆمەڵگای مەدەنی. بۆیە مرۆڤ دەتوانیٚ بە خاڵی دەستپێکردنی لە جیاوازییەکانەوە شتەکان یاخود بابەتەکان هاوێر بکا. (مرۆڤ پێشتر لە لۆجیکی ئەرستۆدا جیاوازی دەبینی). بەڵام دەتوانین بڵێین جیاوازییەکان بەهەموو جیاوازییانەوە دەبنە وەڵامدانەوەی ئەو رۆژگارەی پێیدا تێپەڕ دەبێت ئەگەر ساتەوەختەکانیش هەمە جۆربن لە دیدگەلێکی تاکێك و کۆی تاکەکانی تریشەوە. ئێمەی تاکی کورد کە لە هەرێمێکدا دەژین تازە خەریکە پێدەگریٚ بۆ هەنگاو نان و نزیکبوونەوە لە

**سەرەتای جیهانی نوێگەرایەتی و مۆدێرن پێویستی زۆرمان هەیە بە تێگەیشتن لە مانای ئەو ستراتیجەی کە کاری بۆ دەکەین لە مانای ئەو یاسایەی کە لە سایەیدا کاری بۆ دەکەین.**

**دەبێت زیندووبوونەوە دەوری کاریگەری هەبێت لەسەرمان بۆ ئەوەی بە ئایدۆلۆژیایەکی لۆجیکی کاربکەین بۆ نزیکبوونەوە و گەیشتن بە هەموو جوانیەکانی ژیان ئەو جوانیەی کە هەموومان لە پێناویدا دەجەنگین بە هەموو واتاکانیەوە یان کە لە پێناویدا دەمرین.**

***

## کورتەیەک سەبارەت بە
## هۆزەکانی ناوچەی کەلار و دەوروبەری.

**ئەحمەد باوەڕ**

### سیستەمی هۆزایەتی لە گەرمیان و ناوچەکەدا:

سەبارەت بە مێژوو و نیشەجێبوونی ئەو خێڵ و هۆز و عەشیرەتانەی کە لەدێر زەمانەوە و تا ئێستا کەوتبێتە تەوەری گەرمیان بە تایبەتی قەزای کەلار و دەوروبەریەوە بە هەموو گوند و شارۆچکە و ناوچەکانیەوە. دەبێ لەوەوە دەسپێبکەین و بزانین بنەمای ئاوەدانی و نیشەجێبوون بە شێوازێکی سەرەکی لەم تەوەرە گرنگەی گەرمیان و ناوچەکەدا لە چ سەروبەندێکەوە دەستێپێکردووە و بەزۆری ئەو کارلێك و دەرئەنجام و سەرچاوە گرنگانەی ژیوار و پەیوەستبوونی خەڵك کامانەن کە وایان لە دانیشتوانی ئەم ناوچانە کردبێ کە هەریەکە و بەپێی هەلومەرج و بارودۆخی خۆی لەم دەوروبەرەدا گیرسابێتەوە و پێداویستی و سەرچاوەکانی ژیانی خۆی دەستەبەر کردبێ لە کاتێکدا دەکرێ ئەمەیان لە دوو خاڵی سەرەکیدا یا لە دوو تەوەری سەرەکییەوە قسە و جەختی لەسەر بکرێ:

یەکەمیان: بارودۆخی سروشتی ناوچەکە و لە باری و گونجانی بۆ هەلومەرجی ژیان و نیشتەجێبوون.

دووەمیان: بارودۆخی سیاسی و بریاری سیاسی – شۆڤێنی دەسەلأت و حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق سەبارەت بە ناوچەکە.

بۆ خاڵی یەکەمیان  بە پلەی یەکەم لەوەوە سەرچاوە ئەگرێ ناوچەیەکی وەك  کەلار و دەوروبەری بەو پێیەی رووباری (سیروان) بە ناوەندیدا گوزەری کردووە هاوکات (گەرمیان)یشی کردووەتە دوو بەشی سەربەخۆوە وەك ناوچەی (گەرمەسێر) کە دەوروبەری شاری خانەقی و هەموو دێهاتەکانی دەشتی (بنکورە – بنکدورە)(1) دەگرێتەوە و لەگەڵ ئەوەشدا بەیەکێك لە دەشتە بەپیتەکانی کوردستان دادەنرێ چ  لە رووی ئاوەدانی و چ لە رووی سامانی کشتوکاڵی بە هەموو بەشەکانیەوە ئەمەش بۆ خۆی هەلومەرجێکی لەباری گونجاوی دروستکردووە کە بە درێژایی مێژوو دانیشتوانەکەی بەم دیو و بەو دیوی (سیروان)دا بلأوببنەوە ودێهات و سەرچاوەکانی ئاوەدانی بە دەوروبەریدا پێکبهێنن، دواتریش ئەو خێڵ و هۆزانەشی گەرمیان و کوێستانیان کردبێ بە یەکجارەکی نیشتەجێ بن و ئەم دەوروبەرە بکەنە جێ هەواری خۆیان. لای رۆژئاوای (سیروان)یش کە دەکاتە دەشتی کاکی بە کاکی گەرمیان بە هەمان شێوە دانیشتوان لە دێر زەمانەوە تیایدا نیشتەجێبوون و ژیانی کشتوکاڵی و ئاژەڵداریان دەسپێکرد و تا رادەیەك وازیان لە ژیانی کۆچەری و رەوەندی هێنا.

سەبارەت بە خاڵی دووەم: واتە بارودۆخی سیاسی و بڕیای سیاسی بۆ ئەمەیان دەتوانین لە: "رێکەوتننامەی ئاشتی (زەهاوی) ساڵی 1639ه وە دەسپێبکەین کە لە نێوان ئێرانی سەفەوی و عوسمانیدا مۆرکرا" (2) تا دەگاتە بانگەشەکردنی بەیانی 11ی ئازاری ساڵی 1970 لەلایەن دەسەلأتدارانی (بەعس)ەوە لە عێراقدا، چونکە لە رێکەوتننامەی زەهاو بەدواوە هەر دوو حکومەتی ئێران و دەوڵەتی عوسمانی لەسەر ئەوە رێکەوتن کە سنوورێکی دیاریکراو خاڵەکانی نێوان هەردوو قەڵەمڕەوەکەیان لێکدی جودابکاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا بنەماکانی ئەم رێکەوتننامەیە سنوورێك بۆ هەموو ئەو خێڵ و

هۆزانە دابنیٚ کە بەبیٚ هیچ کۆسپ و تەگەرەیەك لە نێوان ئەم دوو قەڵەمڕەوەدا هاتووچۆیان دەکرد و پابەندی ئەو بنەما و یاسا نێودەوڵتیانە نەدەبوون کە پێشتر هەر دوو وڵاتی ناوبراو لە ڕێکەوتنامەکانی نێوانیاندا لەسەری ڕێکەوتبوون، ئەمەش وایکرد ئەو خێڵ و هۆزانەی نێوان هەر دوو وڵاتی ناوبراو ببنە دوو بەشەوە و تەنها بۆیان هەبیٚ لەو سنوورانەی کە بۆیان دیاریکراوە کۆچەرایەتی ژیانی نیشتەجێبوون و ئاژەڵداریان بەرێوەبەرن بۆ نموونە هۆزێکی گەورە و بەناوبانگی وەك (جاف) کە لە نێوان هەر دوو وڵاتی عێراق و ئێراندا دەژیان بوون بە دوو بەشی سەرەکییەوە. وەك دەبینی ئەو (جاف)انەی لە ڕێکەوتننامەی زەهاوی 1639 بەدواوە کەوتنە وڵاتی ئێران و دەوروبەری شاری (جوانرۆ) و دەشتی (زەهاو)ەوە بەجافی( جوانرۆ) ناسراون و ئەوبەشەشیان کەوتنە بەشی کوردستانی باشووری (عێراق)ەوە هەر لە زنجیرە چیای (حەمرین)ەوە تا دەگاتە ناوچەی شارەزوور و هەڵەبجە ناوی (جافی‌موڕادی) (3) یا (جافی بابان) یان لێنرا، واتا بە ناوی سوڵتان موڕادی عوسمانییەوە کە لە سەردەمی ئەمدا ڕێکەوتنامەکە مۆرکرا ئەمەش وایکرد ئەو هۆز و خێڵانەی بەردەوام سەرگەرمی ژیانی کۆچەرایەتی بوون بیریان لە ژیانی نیشتەجێبوون دەکردەوە. وێرای پابەندبوون بە بنەماکانی ئەو ڕێکەوتننامانەی کە بۆ مەسەلەی سنوور لە نێوان هەر دوو وڵاتدا هاتبوونە کایەوە. هەرچەندە شانبەشانی ئەمانەش گەلێك خێڵ و هۆزی تری کورد بەزۆری سەرەتای هاتن و نیشتەجێبوونیان لە کوردستانی باشووردا لە وڵاتی(ئێران)ەوە دەسپێدەکا لە وانە خێڵ و هۆزەکانی (زەنگنە، لەك، کەلوڕ، زەن، پالأنی، ڕۆژبەیانی، مەنگۆڕ، باجەلان...تاد) لەو کاتەشەوە لە وڵاتی کوردستاندا (بە هەموو پارچەکانیەوە) نیشتەجێبوون وەك دەشبینی ئینتمایەکی تەواویان بۆ کورد و وڵاتی کوردستان هەیە و بەدرێژایی مێژوو داکۆکیان لە خاکی کورد و وڵاتی خۆیان کردووە، هەر چەندە گەلێك جار ئەم خێڵ و هۆزانە بە هۆی ئەوەی کە تا ئەو سەروبەندەی هەستی نەتەوایەتی لە ناو گەلی کوردا بەشێوازێکی فراوان

نەهاتبووە کایەوە لە دووبەرەکایەتی و دژایەتیکردنێکی بەردەوامی یەکابوون. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لە مێژوونوسانی رەگەزپەرستی عەرەب بنەچەی گەلێك لەم هۆزە رەسەنانەی کورد دەگێڕنەوە سەر عەرەب و دەڵێن: (ئەو هۆزە زۆرەی عەرەبیش کە لە باکووری عێراق نیشتەجێبوون لە سەردەمی پێش ئیسلام و دوای ئیسلام تێکەڵی کوردەکان بوون و لەو ژینگەیەدا سازاون تا رادەی ئەوەی بنەچە و رەگەزی عەرەبی خۆیان لە یادچووەتەوە)(4) بەم پێیە و بە بۆچوونی ئەم شۆڤێنیانەی عەرەب بێ کوردان عەرەبیان کردووە بە کورد و نەژاد و رەسەنایەتی ئەوانیان سریبێتەوە وەك لە شوێنێکی تری هەمان بابەتدا دەنووسن: (هەندێ بەڵگەی تر هەیە ئەوە دەگەیەنێ کە هۆزی (باجلان) لە بنەرەتا لە (بجیلە)ی عەرەبییەوە بەرە بەرە گۆڕاوە و بووە بە (بجیلان) دوا جاریش بووە بە (باجەلآن) کە مانای(بجێلێکان) دەگەیەنێ)(5).

لە بارەی هۆزی بە ناوبانگی زەنگنەشەوە وایان لێکداوەتەوە کەیەکێ: (لە هۆزە عەرەبییە سەرەکییەکان کە کەوتنە ناوچە شاخاوییەکانی عێراق (بنو اسد) بوو کە لقێك لەم هۆزە گەیشتە ناوچەی نێوان کەرکوك و سلێمانی گوندیان پێکەوەنا و لە ناوچەکە پێیان وترا (زەنگنە) لەبەر زەنگینی و دەوڵەمەندییان بەو ناوە ناسران)، (6) کاتێکیش باس لە تاڵەبانییەکان دەکا دەنووسێ: (تاڵەبان – گالبان ئەمەش وشەیەکی عەرەبییە مانای دێی قوتابیان دەگرێتەوە نزیکی چەمچەماڵ نیشتەجێبوون بە تاڵەبانی ناسران)(7) ئەمانە و گەلێك لێکدانەوە و شێواندنی رەسەنایەتی و ئەسالەتی کورد، هەر یەکە و بەپێی بۆچوون و ئەو هاندانە ناڕەوایانە قسەیان لەسەر کردووە کە رژێمی شۆڤێنی عەرەب بەتایبەتی (بەعس) لە پشتی ئەو پرۆسەیەوە بووە و ئاسانکاری شۆڤێنیانەی خۆی بۆ کردووە. بە هەرحاڵ لێرەدا نووسینەکەم یا ئەوکتێبەی کە بۆ ناوچەی کەلار و دەوروبەری تەرخانم کردووە لەم بەشەیاندا زیاتر جەخت لەسەر مێژوو و بنەچە و رەسەنایەتی ئەو خێڵ و هۆزانە دەکەم کە لە دێر زەمانەوە لەم ناوچەیەدا نیشتەجێبوون و باری ئاوەدانیان بەرەشماڵ،

گوند، شار و شارۆچکە دەسپێکردووە و بە بەردەوامی برەویان پێداوە و لە هەموو هەلومەرجێکی رۆژگاردا هەر یەکە و بەپێی شوێن و پابەندبوونی بۆ ناوچەکە داکۆکی کردووە. هەرچەندە ئەو بارودۆخ و رەوشە نائاساییەی بەسەر کوردستان و ناوچەکەدا هاتووە گەلێك هۆز و خێڵی تری کورد لەم شارە و دەوروبەری ئەم شارەدا کۆکردووەتەوە و بەوەش سیماو خەسڵەتێکی ئەوتۆی پێببەخشێ کە ئەمڕۆ شاری کەلار بەوە ناوزەد بکرێ کە خاوەنی تایبەتمەندیەکی ئەو تۆبێ کە زۆر لە شار و شارۆچکە و ناوچەکانی تری کوردستان جیاوازبێ وەك لە بەشەکانی تری ئەم کتێبەدا ئەو خەسڵەت و ئەو دیاردەیە بە روونی سەرنجی لێدەدرێ بەجۆرێ هەڵدەگرێ بۆ هەریەکەیان لێکۆڵینەوەیەکی تایبەت یا کتێبێکی تایبەتی لەسەر بنوسرێ و لایەنە شاراوەکانی تەتەڵە بکرێ، بەڵام وەك دەلالەت و راستییەکی مێژوویی سەرەتا کەلار و ناوچەی کەلار لەلایەن خێڵ و هۆزەکانی وەك: گێژ، زەندو رۆژبەیانییەوە ئاوەدانکراوەتەوە و: (جافەکان دەگێڕنەوە کە قادر بەگی کوڕەزای زاهیر بەگ لە سەدەی نۆزدەیەمین ناچار بوو بەشەڕ خێڵە کۆنەکانی سەر قەڵای شێروانەی رۆژهەڵاتی کفری کە گێژ و رۆژبایانی و زەند بوون دەرپەرینێ تاکوماڵەکانی لێدامەزرێنێ)(8) چونکە تا ئەم دەمانەش هۆزی جاف وەکو وتم بە ژیانی گەرمیان و کوێستانەوە خەریکبوون.

لەم بارەیەشەوە ساڵنامەی عوسمانی ساڵی 1310 کۆچی بەرامبەر 1892زاینی وا باس لە جاف ئەکا کە ئەمانە:(خێڵێکی کۆچەری بوون و لەوەرزی زستاندا لە شێروانە و سەیدخەلیل و کوڵەجۆ ماونەتەوە و لە بەهاریشەوە بەرەو شارەزوور بوونەتەوە، پێش ئەوەی بەرەو مەریوان ببنەوە بۆ ماوەیەك لەو دەوروبەرەدا ماونەتەوە)(9). لەم بارەیەشەوە هەر بەگزادەکانی جاف خۆیان دان بەو راستییە دەنێن و تەنانەت بە خۆم ئەم رایەم لە خوا لێخۆشبوو (حەمە سەعید بەگی جاف)ەوە بیستووە و کاك خەسرەو جافی کوڕیشی لە کتێبی (وڕێنە)دا باس لەوە دەکا: "دێی کەلار لەپێشدا ئاوەدان

کرابوویەوە لەلایەن جەماعەتی حەمەی حاجی ئەڵماس" ەوە(10) کە بە بنەچە ئەچنەوە سەرهۆزی گێژو سەرەتای ئەو ئاوەدانییەی کەلاریش لەنێوان کەلاری کۆنی ئێستا و تاڕادەیەك (سەید خەلیل)دا بووە، تەنانەت زۆر لە بەسالاچوانی کەلار و ناوچەکەش دان بەهەمان راستیدا دەنێن کە ئەمەش دەڵێم: ئەوە ناگەیەنێ هەموو جاف کۆچەری بووبێتن بەڵکو گەلێك لە تیرەکانی تا ئەوکاتەی وازیان لە ژیانی کۆچەری هێناوە و لە چەندین گوندی سەر رووباری سیروان و شارۆچکەی خورماڵی هەرێمی شارەزووردا نیشەجێبوون، لەم بارەیەشەوە ساڵنامەی عوسمانلی ئاماژەی بۆ هەمان را کردووە و وای تۆمار کردووە کە: (هەموو عەشیرەتی جاف کۆچەری نەبوون بەڵکو هەندێ لەوانە وەك یەزدانبەخشییەکان لە چەند گوندێکی رۆخی رووباری (دیالە واتە سیروان ا — ب)و قەزای گوڵعەنبەر گیرسابوونەوە و بە کشتوکاڵەوە خەریك بوون) (11).

لە کاتێکیشدا جاف بەزۆری لە ناوچەی گەرمیان و کەلاردا دەستیان بە نیشتەجێبوون کردووە هاوکات لەبەر ئەو هێز و توانایەی کە هەیانبووە توانیویانە جێ بەوانیتر لێژ بکەن و بەتەواوی جێگایان بگرنەوە بە حوکمی ئەوەی ئەوانی پێشوو چەند هۆزێکی لاواز و بێ توانا بوون و نەیانتوانیوە لە رووی ئەو هەموو تیرە و بەهێزییەی هۆزی (جاف)دا بوەستن لە هەمانکاتیشدا نەیانویستووە بچنە ژێر رکێفی جافەوە بۆیە ناوچەکەیان بەجێهێشتوە و کەوتوونەتە ئەو ناوچانەوە کە تا رادەیەك جاف ئەو هێز و توانایەی تیانەبووە بۆ نموونە بەشێکی زۆر لە (گێژ و زەند و پالانی) بەرەو ناوچەی زەنگاباد و دەوروبەری ناحیەی (قەرەتەپە)ی ئێستا بوونەتەوە و رۆژبەیانییەکانیش کەوتوونەتە دەوروبەری (قەرەحەسەن)ی کەرکوك و بەشێکی کەشیان لە ناوچەی (بنکورە)و قەزای خانەقین نیشتەجێ بوون. هەرچەندە خێزانێکی زۆری ئەم خێڵ و هۆزانە بەشێوەیەکی پەرتوبلاو بە ناوچەکانی تری کوردستاندا بلاوبوونەتەوە. لەوانە هۆزی زەند بەشێکیان بەرەو ناوچەی زەنگنە و گوندی (فەقێ مستەفا) بوونەتەوە. بەشێکی تریشیان کەوتوونەتە

(حەفتەغار)ی کەرکوکەوە. بەشێکی تری گێژ لە ناوچەکانی سەر بە موسڵ دەژین. جگە لەمانە و لە کاتی بەیانی (11)ی ئازاری (1970)ەوە واتە لەو کاتەوە کەلار بە بڕیارێکی سیاسی لەلایەن حوکمەتی عێراقەوە کرایە قەزا و دواتر لەگەڵ کۆتاییهێنانی شۆرشی ئەیلول و مۆرکردنی رێکەوتننامەی جەزائیری 1975 دەسەلاتدارانی عێراق بەشێوەیەکی چڕوپڕتر دەستی دایە پرۆسەی پاکتاو کردنی رەگەزی و هەر لەو سەروبەندەدا هەردوو (قەزای کەلار و چەمچەماڵی لەسەر پارێزگای کەرکوك لابرد و خستنیە سەر پارێزگای سلێمانی لەساڵی 1975)دا(12) . واتە بۆ ئەو ناوچەیەی کە بەخۆی ناوی (ئۆتۆنۆمی)لێنا. لێرە بەدواوە دانیشتوانی قەزای کەلار و دەوروبەری بە رادەیەکی چاوەرواننەکراو زیادیکرد. وەك ئەوەی دەتوانریٚ بەیەکیٚ لە قەزا گەورەکانی عێراق و کوردستان دابنریٚ. ژمارەی دانیشتوانیشی بە هەردوو ناحیەی (پێباز) و (تیلە کۆ)ی جاران و (رزگاری) ئێستاوە خۆی دەدا لە نزیکەی (150) هەزار کەس. جگە لەدەرکردنی ئەو کوردانەی کە لە ناوچە و شارە کوردنشینەکانی ژێر دەسەلاتیدان بەرەو ناوچە رزگارکراوەکانی کوردستان و باشووری عێراق بە بەردەوامی. ئەمەش وای لەکەلار و ناوچەکانی دەوروبەری کرد لە هەموو هۆزو خێڵ و بۆچوونێکی جۆربەجۆری تیا کۆببێتەوە. سەرەرای ئەو وێرانکاری و سیاسەتی جینۆساید و (ئەنفال)کردن و ئەو راگواستنەی بەسەر گەلی کورد و دانیشتوانی لادێنشینی کوردا هات بەتایبەتی لە کۆتایی هەشتاکانی سەدەی بیستەمی رابردوودا بەرەو چارەنووسێکی نادیار بەرەو ئەو شوێن و مەکۆ (مجمع)ە زۆرەملیانەی کە پێشتر رژێمی عێراق نەخشە و پلانی بۆ دارشتبوو کۆیکردنەوە.

ئەمەش ناوی زۆرینەی ئەو هۆز و خێڵ و عەشیرەتانەیە کە بە پێکهاتەی کەلار و ناوچەکانی قەزای کەلار لە رووی دانیشتوانەوە پێکدەهێنن:

## یەکەم: هۆزی جاف

ئەم هۆزە گەورەی کورد لە سالآنی سەدەی حەڤدەیەم و بگرە سالآنی پێشووترەوە لەنێوان هەردوو ولآتی ئێران و عێراقی ئەمڕۆدا لەسەر بنەمای کۆچەریدا دەژیان و گەرمیان و کوێستانیان کردووە، ناوەندی سەرەکیشیان شاری جوانرۆ و ئەو هەرێمە بووە کە ئەمڕۆ (دەکەوێتە بەینی هەڵەبجە و کرماشان)ەوە (13). ئەمەش لە کاتێکدا بووە کە ئەم هۆزە بە هیچ جۆرێ ملکەچی هیچ کام لە ولآتی ئێرانی سەفەوی و دەوڵەتی عوسمانی نەبوون تا ئەوکاتەی عوسمانییەکان بوونی خۆیان لە ناوچەکەدا سەلماند و رێکەوتننامەی زەهاوی (1049کۆچی بەرامبەر بە 1639زاینی) لە نێوانیاندا مۆرکرا بەپێی بنەماکانی رێکەوتننامەی ناوبراو.

وەك پێشتر باسم لێوەکرد هۆزی جاف دابەشبوون بەسەر دوو ولآتی (داگیرکەری وەك سەفەوی 1501-1736و عوسمانی 1299-1922)دا (14) و بوون بەچوار بەشی سەربەخۆوە کە دەکرێ لەمانەی خوارەوەدا بەکورتی لەسەر هەربەشێکیان بدوێین:

1.جافی زەینەدینی یا(چیاوالدینی) (15) و هارونی وەك لە بنەماکانی رێکەوتننامەی زەهاودا ناویان هاتووە ئەمانە سەر بە ولآتی ئێران بوون، بەلآم ئەمڕۆ زەینەدینییەکان هیچ پاشماوەیەکیان لێنەماوەتەوە و تەنها (هارونی)یەکان نەبێ کە یەکێکن لە (تیرەگەورەکانی جاف)(16) و شوێنی نیشتەجێبوونیان لە کوردستانی باشووردا دەکەوێتە دەوروبەری شارۆچکەی خورماڵ- گوڵعەنبەر و گەرمیانەوە بە تایبەتی لە دەربەندیخان و شارۆچکەی پێواز-باوەنور و گوندەکانیدا نیشتەجێن.

2-جافی ئێران (جوانرۆ): ئەم بەشەیان زۆرجار (جافی زەهاو)(17) یشیان پێ وتراوە و دەکەونە باکووری رۆژئاوای (ئێران)ەوە واتە ئەو ناوچانەی

کوردنشینن لە کرماشان و سنە و بەشێکی کەشیان دەکەونە کوردستانی باشوورەوە  واتە هەر لە سنوورەکانی قەزای (خانەقین)ەوە تادەگاتە هەڵەبجە و ناوچەی هەورامانی ئەم دیو لە تیرەکانی ئەم بەشەی جاف بەرچاودەکەون لەوانە: (قادرمیروەیسی، نێرژی، کۆکۆیی، زەردۆیی، تایشەیی، بێیانی...تاد)، بەلاّم کەریم بەگی جاف 1889-1949/7/1 (18) لە یادداشتەکانی خۆیدا کە بەناوی (تەئریخیجاف)ەوە نووسیویەتی زۆر بە وردی لە هەموو تایەفە و فیرقەکانی هۆزی جاف دواوە و کاتیّ باس لە جافی ئێران یا(جوانرۆ) دەکا وا دەسنیشانی کردوون کە ئەم تیرانەبن: (قوبادی، باوەجانی، ئیمامی، یەناخی، قادرمیروەیسی، تایشەیی، کۆیك، نێرژی، دەروێشی، وەڵەدبەگی، دەلەژێری، کۆکۆیی، زەردۆیی، عەلیئاخەیی، دووروویی و کوێرەکی) (19) بەلاّم پارێزەر عەباس عەزاوی تیرەی تری لەگەڵ (جافی جوانرۆ)دا دەسنیشانکردووە بە رادەیە زۆریان  ئەمڕۆ شوێنی نیشتەجێبوونیان ئەو گوند و ناوچە سنووریانەیە کە دەکەونە نێوان عێراق و ئێرانەوە لە کوردستاندا و بەشێکی زۆریشیان دەکەونە سنووری قەزای کەلارەوە وەك (بێیانی و گوێکوڕی) بەشێکی کەشیان هەر لە کوردستانی باشوور و لە ناوچەکانی ترا نیشەجێبوون لەوانە (گەشکی، یوسفیارئەحمەدی، رۆستەمبەگی و مەنوچەری) و(20) هیتر، وێرای ئەوە ئەو فیرقە و تیرانەی (جافی جوانرۆ) کە بەو شێوەیە باسم لێوەکردن هەر یەکە و بۆ خۆیان لقی سەربەخۆیان لێدەبێتەوە.

3-جافی مورادی (بابان):

سەبارەت بەم بەشە سەرەکیەی جاف کە بە زۆری دەکەونە بەشی کوردستانی باشوور (عێراق) ەوە. کەریم بەگی جاف بە (جافیبابان)یان (21) ناو دەبا و زۆربەی تیرەکانی بەوردی دەسنیشانکردووە، بەلاّم عەباس عەزاوی لە بارەیانەوە نووسیویەتی: (ئەم جافانە لە دێرزەمانەوە لە عێراقدان و مێژوویان ئەگەڕێتەوە بۆ پێش سوڵتان موراد)ی(22) عەسمانی و شوێنی نیشتەجێبوونیان هەر لە ناوچەی گەرمیانەوە دەسپێدەکا تا دەگاتە هەڵەبجە و

ناوچەی شارەزوور و هەورامانی ئەمدیو. بەشێوازێکی چڕوپڕ لە دەوروبەری شارەکانی کەلار، کفری و هەڵەبجە نیشەجێبوون. پێشتر و دوای تێکچوونیان لەگەڵ ئەردەڵانییەکانی و پەناهێنانیان بۆ ئەو ناوچانەی کە لەژێر دەسەڵاتی میرنشینی بابان و دەوڵەتی عوسمانیدا بووە، هەندێ سەرچاوەش جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە مێژووی سەرهەڵدانی جاف لە ناوچەی (شارەزوور) و (بانیخێڵان)ی گەرمیان لە کۆچکردنی (زاهیربەگ)ەوە دەسپێدەکا کە لەگەڵ (100)سەد دەوارنشینی جاف لە ناوچەی جوانرۆوە هاتبنە ئەم هەرێمانە لە کاتی حکومدارێتی ئەحمەد پاشای باباندا(23) پاشان ئەم زاهیر بەگە لەگەڵ (39) کەس لە دەست و پێوەندەکانیدا کوژراوە بە تۆمەتی ئەوەی سەرکردایەتی کارێکی یاخیگەری کردووە لە ناوچەی شارەزووردا، دواتر کوڕەکەی قادر بەگ جێگای گرتووەتەوە و لەلایەن بابانیەکان و حکومەتی عوسمانییەوە دان بەو دەسەڵاتەی قادر بەگدا نراوە و ڕێگاشیان بە جاف داوە لەوە بەدواوە ژیانی کۆچەرایەتی و ئاژەڵداریان لە ناوچەی پێنجوێن، شارەزوور و گەرمیاندا درێژە پێبدەن، تەنانەت ئەو ناوچانەش کە ئاماژەم بۆکرد بە شوێنی سەرەکی و تەواوی (جافی مورادی – بابان) دادەنرێ. لە کوردستانی خواروودا بە هەموو تیرەکانییەوە و بەپێی لێکدانەوە و ئەو خشتەیە بێ کە هەریەك لە مێجەرسۆن و دواتر محەممەد ئەمین زەکی پشتی پێبەستووە بەشی جافی مورادی (24) لە هۆزی جاف لە سالانی پێش هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهانیدا لە رووی ژمارەی خێزان، هێزی سوارە، پیادە و شوێنی نیشتەجێبوونیان و سەرگەرمییان بەژیانی کۆچەرییەوە بەم شێوەیەی خوارەوە پۆڵێنی کردوون:

خشتەیەك سەبارەت بە بارودۆخی جاف و تیرەکانی لە ساڵانی پێش جەنگی یەکەمی جیهانی 1914–1918دا بە پێی لێکدانەوە و پۆڵێنکردنی مێجەر سۆن:

| ژ | ناوی تیرە | ژمارەی | هێزەکانی | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- | --- |

| | | خێزان | سوارە | پیادە | |
|---|---|---|---|---|---|
| 1 | هارونی | 800 | 300 | 400 | کۆچەرن |
| 2 | سمایل عوزێری | 1500 | 700 | 1500 | کۆچەرن |
| 3 | میکایەڵی | 2000 | 700 | 1500 | کۆچەرن |
| 4 | ڕەشوبۆری | 1000 | 500 | 400 | (250)خێزانی نیشتەجێن لە تەپە چەرموو وئەوانی تریان کۆچەرن |
| 5 | تەرخانی | 500 | 200 | 200 | کۆچەرن |
| 6 | شاتری | 1800 | 800 | 900 | بشێکیان لە سیدخلیل نیشتەجێن وئەوانی تریان کۆچەرن |
| 7 | سەدانی | 300 | 100 | 100 | کۆچەرن |
| 8 | باداغی | 250 | 100 | 100 | کۆچەرن |
| 9 | باشکی | 300 | 100 | 100 | کۆچەرن |
| 10 | عەمەڵە | 400 | 100 | 200 | کۆچەرن |
| 11 | یەسوجانی | 500 | 100 | 200 | کۆچەرن |
| 12 | نەوڕۆڵی | 1500 | 400 | 500 | لەشارەزوور نیشتەجێن |
| 13 | کەماڵەیی | 500 | 150 | 200 | کۆچەرن |
| 14 | یەزدانبەخشی | 900 | 100 | 400 | کۆچەرن |
| 15 | تاوگۆزی | 200 | 30 | 70 | لەتاوگۆز نیشتەجێن |
| 16 | گلاڵی | 2000 | 700 | 1400 | کۆچەرن (چارەکێکیان سەربەپشتدەرن) |
| 17 | پشتماڵە | 50 | 10 | 20 | کۆچەرن |
| 18 | بێسەری | 200 | 50 | 150 | کۆچەرن |
| 19 | یاروەیسی | 200 | 100 | 100 | کۆچەرن |
| 20 | شێخسمایلی | 1000 | 100 | 700 | کۆچەرن |
| 21 | عیسایی | 300 | 70 | 250 | کۆچەرن |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| 22 | سۆفیوەند | 60 | 10 | 20 | ئەکەونە نزیک سەلاحییە کفرییەوە لەشوێنێك کە بە خانەی ئیمام عەلی بەناوبانگە |

هاوکات بەپێی ئەو زانیاری و سەرچاوانەی تائێستا سەبارەت بە جاف و هۆزەکانی تری کورد دەستم کەوتوون. جافی مورادی تیرەکانی لە کوردستانی باشوور و بە تایبەتی لە ناوچەی گەرمیان و کەلاردا بەم جۆرەن و شوێنی نیشتەجێبوون و کاری رۆژانەیان دەکەوێتە ئەم ناوچە و گوندانەی کە لێرەدا باسیان لێوە دەکەم. هەرچەندە هەندێ لەم تیرە و فیرقانە بە خۆیان لقی سەربەخۆیان لێدەبێتەوە، بەلاّم بە رەگەز هەر هەموویان دەچنەوە سەر هۆزی گەورەی جاف لەوانە:

* شاتری(25): یەکێکن لە تیرە گەورەکانی هۆزی جاف، دەبنە چوار لقی سەرەکی: میروەیسی، ئیبراهیمی، وردە شاتری و یوسوجانییەوە، سەرەتا تیرەی شاتری لە وەرزی زستاندا لە ناوچەی کفری نێوان شێروانە و سەیدخەلیل و باوەنور ژیاون و (26) چەندخێزانێکی کەشیان کەوتوونەتە هەرێمی شارەزوور لە خورماڵ و سەراوی سوبحان ئاغا بە تایبەتی یۆسوجانییەکانیان(27) لەگەڵ ئەوەشدا لە هەموو تیرەکانی تر (ئارەزووی ئەوەیان کردووە دەس لە ژیانی کۆچەری هەڵگرن و نیشتەجێبن)(28).

ئەو دێهات و گوندانەشی کە لە ناوچەی گەرمیان و کەلاردا شاتری: بە تایبەتی برایمی و وردە شاتری و نەژوێنی تیا نیشتەجێبووە بریتییە لە گوندەکانی (کیژۆك، تووەقوت، گەرمك، خاڵەبەگ، تورکە و ئەحمەد ئاوای شاتری) و(29) دەکەونە سنووری ناحیەی تیلەکۆەوە واتە (رزگاری ئێستا)، بەلاّم سنووری ناحیەی (پێوان)و ئەو گوندانەی سەر بەناوەندی قەزای کەلارن لە

(ژاڵەی سەفەر، گەرمکی حاجی عەلی، هەرسێ سەیدخەلیل، قاسم ئاغا، حەسەن محە، زەماوەنگە، تازەدێ، قولەسووتاو، قەڵاتەوزان، سۆفیڕەحیم، تورکەی رۆبیتەن، گلاڵکەوە، عومەر ئاغاجان، ژاڵەی حاجی قادر و بێرەش)دان(30).جگە لەوانەیان کە لەگەڵ تیرە و هۆزەکانی تێکەڵن، دوو باڵەکەی کەشی لە ناوچەی شارەزوور لە سەراوی سوبحانئاغا و ناحیەی سەید سادق دامەزراون. (31)

* گلاڵی: شوێنی نیشتەجێبوونیان دەکەوێتە نێوان: (گوڵعەنبەر و شارباژێر)ەوە و (33) لقێکی گەورەی هۆزی جاف پێکئەهێنن. کەریم بەگی جاف ئەڵێ: ئەمانە ئەبن بە حەوت کۆمەڵەوە و(34) کەچی دکتۆر ناجی عەباس جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەمانە: (لە بنەرەتدا جافی مورادی) (35) نەبن هەرچەندە بە زۆری لە هەردوو بەشی کوردستانی باشوور و رۆژهەلاتدا بە رادەیەکی دیار بەرچاو دەکەون. لە هەموو تیرەکانی تر زیاتر سەرگەرمی ژیانی کۆچەری و گەرمیان و کوێستان بوونە. لەگەڵ ئەوەشدا بە باڵێکی سەرکێش و شەڕانی ناوبراون لە نێوەندی خێڵ و هۆزەکانی کوردا. لە تەوەری گەرمیان و دەوروبەری کەلاریشدا چەند خێزانێکیان کەوتوونەتە ناو شارەوە و ئەوانی تریان لەگەڵ تیرە و هۆزەکانی تری ناوچەکەدا لە گوندەکانی: (سەیدە، عەلەومحە، مچەشەل و تمتمە)دان (36) ئەوانیکەیان دەکەونە ناوچەی شارەزوورەوە.

* رۆغزایی: بەشێکی دیارن لە: (تیرە رەسەنەکانی هۆزی جاف)(37) کەریم بەگی جاف کردوونی بە چوار کۆمەڵەوە و عەباس عەزاویش لەشەش کۆمەڵەی سەرەکی: (حەمەجانی، ئیسماعیلی، سەرحەدی، کۆمەڵی رۆغزاد، شاوەیسی و شێخ عەلیوەیسی)دا(38) ئاماژەی بۆ کردوون و لە ناوچەی قەرەداغ و ناحیەی خورماڵی شارەزوور نیشتەجێن. بەشێکیشیان کەوتوونەتە کوردستانی رۆژهەلات (ئێران)ەوە. لە کوردستانی باشووریشدا کۆمەڵەیەکی گرینگیان لە ناوچەی کفری و لە ناحیەکانی سەرقەلا و پێوازی سەر بە کەلاردان. وێرای ئەو

ژمارە خێزانانەی لە شار و شارۆچکەکانی ناوچەکەدا دەژین و کۆمەڵێکی تریان لە گوندەکانی: (سەرکەلی مارف، سەرکەلی عەزیز و سەرکەلی خەسرە و لەگەڵ گامەخەڵ، خەڵوە ، هەوارەلارە، ناوە، سەرناوە، هەوارە قووڵە، ئەحمەدئاوای رۆغزایی، پەلەوشك، تووڵەبی، سێخڕان، کونەکۆتر و ژالآن)دان(39) لە ناحیەی تیلەکۆ (رزگاری)ی سەر بە قەزای کەلار، بەلآم ئەوانی تریان دەکەونە گوندەکانی (مراوە، کێلەسپی، زەردەلیکاو، ئیمام محەممەد، کوردەمیری حەمەیمارف، کوردەمیری حەمەی سلێمان و بارامەوە)(40) لە ناحیەی پێوازی سەر بە قەزای کەلار.

* تەرخانی: لە بارەی ئەم تیرەیەوە هەریەك لە فەرمانگەی فەرمانڕەوایانی بەریتانی بۆ کاروباری شانشینی (ملکی)، عەباس عەزاوی و کەریم بەگی جاف جەختیان لەسەر ئەوە کردووەتەوە کە بەشێك بن لە تیرەی (رۆغزایی)(41) شوێنی نیشتەجێبوونی پێشوویان لە (بلەبیسان Beleh Bisan ی ناوچەی فارس بووە)(42)، بەلآم لە رووی کۆمەڵەوە کەریم بەگ بەسەر دوو لقی (ئەلکی و قاچۆڵ) وعەزاوی بەسەر چوار لقی (ئەلکی، باوەیسی، حەسەن عەلی و قەرەنی ئەلیجان)دا(43) دابەشی کردوون. شوێنی ژێوار و نیشتەجێبوونیشیان لە کوردستانی باشووردا ناوچەی قەرەداغ و ناحیەی (وارماوا) لەگەڵ ناحیەی شێروانە و سەرقەلآدا بوون، لە ژیانی کۆچەرایەتیشیاندا بەرەو ناوچە سنوورییەکانی وڵاتی ئێران بوونەتەوە. لە ناوچەی گەرمیان و کەلاری ئێستادا جگە لەوەی بەشێکیان دەکەونە ناو شارەکانەوە لە ناحیەی (تیلەکۆ) و لە گوندەکانی (ژالآن، قرژاڵە، پیازەجار، زەردی حەمە، زەردی مەحمود، زەردی قادر، زەڕین، ملەسوورە، تەیمانە، تەپە سەوز، گۆڕی مسقاڵ، قرژاڵەی حەمە و قرژاڵەی رۆستەم)(44) نیشتەجێن و لە چەند گوندێکی ناحیەی (پێوان)یشدا لەگەڵ هۆز و تیرەکانی تردا بەتێکەڵی دەژین.

* کەماڵەیی: لە بنەچەدا ئەبن بە چوار کۆمەڵی سەرەکی (شیروانی، سووسکی، کەچەڵی و مەحمودخانی)یەوە(45)، بەلآم عەزاوی کۆمەڵەی (شاوەیسی)(46)

خستوونەتە سەر و وا باسی لێوەکردوون کە ئەمانە بە خواپەرستی و عیبادەت کردنەوە خەریکن و هەر یەکەش لە ناویاندا واز لە نوێژ و عیبادەت بهێنێ بە چاوێکی سووک سەیر دەکرێ. شوێنی ژیان و نیشتەجێبوونیان سەرەڕای ئەوانەیان کە ئەکەونە( سەقز)ی کوردستانی رۆژهەلاتەوە لە بەشی کوردستانی ئەمدیودا دەکەونە سنووری ناحیەی خورماڵ و تانجەرۆوە. لە گەرمیان و دەوروبەری کەلاریشدا لە گوندەکانی (گۆبان، قەرەچێل، قەڵەم، سەیدخدر، حاجی قازی، گۆمە زەردی گەورەو دوومیلان)(47) نیشتەجێن.

* هارونی: یەکێکن لەو تیرانەی جاف کە بە پەرتوبلاوی لە هەر دوو بەشی سەرەکی و سەرهەڵدانیان (ناوچەی هارون ئاباد)ە (48) لە سنووری کرماشان تەنانەت لە رێکەوتننامەی زەهاوی 1639/5/20دا کە لە نێوان سەفەوی و عوسمانیەکاندا مۆرکرا ناویان هاتووە و لە چەند کۆمەڵەیەکی وەك) سەلیمی، هارونی خۆی، قارەمانی، قەیەفەری وخولامی...)پێکدێن. سەردەمانێکیش لەگەڵ (مەریوانی)یەکاندا ئاژاوە و دوژمنایەتیان لە نێوانیاندا بووە، جگە لەوەی ژمارەیەکی زۆریان لە ناوچەی شارەزوور و هەڵەبجە و ناحیەی خورماڵدان، کۆمەڵەیەکی تریان لە تەوەری گەرمیان و کەلاردا دەکەونە ناحیەی (پێوان)ەوە، گوندەکانی (پونگڵە، دەرەدۆین، تازەدێی حاجیحەسەن، دڕکەی خواروو، دڕکەی سەروو، بەرکەل و بساکان)یان(49) بەدەستەوەیە.

* میکایەڵی: بە رادەیەکی کەم لە ناوچەی گەرمیاندا بەرچاو ئەکەون تەنها ئەوە نەبێ چەند خێزانێکیان ئەکەونە (ناوچەی سەنگاو لە ئاوی باسەرەوە تا ئاوەسپی) و (50) ناوچەی شارەزوور، هەشت کۆمەڵەی سەرەکین بەڵام تەنها چوارکۆمەڵەی (محەممەد ئەلیوەیسی، رەشوبۆری، شوانکارە و ئاڵیبەگی) شۆرەت و ناوبانگیان هەیە کەچی ئەوانی تری وەك (میرەیی، رژدەیی، کاکلی و ئاخەسووری)(51) لە بۆتەی بەشەکانی ترا تواونەتەوە، ئەو تایبەتمەندییەیان نییە، لە ناویاندا زانا و خاوەنی تەریقەتی نەقشی مەولاناخالیدی میکایەڵی شارەزووری 1778- 1826و(52) شاعیری گەورەی کورد خدری کوڕی

ئەحمەدی شاوەیسی میکایەڵی شارەزووری (نالی) 1800-1856 هەڵکەوتوون. (56)

* بداخی: یان بەداخی دوو کۆمەڵەی: (بداخی و ئێرنگەیی)ن(54) لە بەشی کوردستانی باشوور (عێراق)دا، دەکەونە ناوچە سنوورییەکانی: (ناحیەی قۆرەتوو، هۆرین وشێخان)ەوە(55). جگە لە وانەیان کە لە هەرێمی شارەزوور و (هەڵەبجە و خورماڵ)(56) دەژین. لە گەرمیان و کەلاردا چەند خێزانێکیان دەکەونە سنووری ناحیەی پێوازەوە.

*سەدانی: بنەچەیان ئەگەرێتەوە بۆ (سەهان) کە: (شوێنێکی نزیك بە جوانرۆیە)و(57) ، دەکرێنە سێ بەشی: (سەیدمرادی، ناودێری لەگەڵ سەدانی خۆیدا). شوێنی نیشەجێبوونیان لە کوردستانی باشوور و ناوچەی شارەزوور: قەزای هەڵەبجە، ناحیەی خورماڵ و گوندەکانی: شیرەمەڕ، گێلەك، شێخ مووسا، ولۆسێنان و چەقلاوەیە (58). لە ناوچە سنوورییەکانی ناحیەی قۆرەتوو و مەیدان دەکەنە گوندەکانی: (قەرەچەم، عەلیپەکان، خوڕخوڕ و بانەبۆر)ەوە و(59) ژمارەیەکیشیان دەکەونە کەلار و ناحیەی پێوازەوە.

* عیسایی: گەلێ جار وەك بەشێ لە (شاتری) ناو دەبرێن (60). هەندێ جاریش وەك تیرەیەکی سەربەخۆ و لە هەر دوو کۆمەڵەی: (ئەمیرخانی و مرادوەیسی)دا (61) کۆیاندەکەنەوە. شوێنی نیشتەجێبوونیان لە گەرمیاندا. سەرووی کەلاری ئەمڕۆیە لە ناحیەی (پێوان)و لە گوندەکانی: (ژاڵە، عیسایی، باوەنوور، ماميل سەید مەحمود و بیەڕەش)(62)دا دەژین.

* سۆفیوەند: سەرەرای ئەوەی (سۆفیوەند) وەك کۆمەڵەیەك لە هۆزی (هەمەوەند) باسیان لێوە دەکرێ. کەچی لە ناو (جاف)یشدا بەشێکی سەربەخۆ بەهەمان ناوەوە هەیە و شوێنی نیشتەجێبوونیان ئەکەوێتە ناوچەی گەرمیانەوە. لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی رابووردوودا: (بیست خێزانیان کەوتبوونە گوندی تەپەسپی و پەنجای تریشیان لە زاوت)(63) بوون. کەریم بەگ لە بارەیانەوە نووسیویە: (نزیکی شەست ماڵێکیان وان لە ناحیەی

قەڵخانلوو و بیست ماڵیان وان لە هووانە نزیکی سلێمانی)(64)و، چەند خێزانێکیان بە پەرت و بڵاوی کەوتوونەتە کەلارەوە.

* تیلەکۆ: دابەش بوون بە سەر دوو لقی: (بەگزادە و حەمەوەیسی)ەدا(65). ئینگلیزەکان لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی رابووردوودا ژمارەیانیان بە 150 خێزان (66) خەملاندووە لە سنوورەکانی تیرەی رۆغزایی و تەرخانیدا دەژین، هاوکات بەشێك لەمانە دەکەونە کوردستانی رۆژهەلاتەوە:( لە مەحاڵی خورخورە و باشماخا دائەنیشین)(67). ئەو گوندانەشی لە گەرمیاندا ئەم تیرەیەی لێ نیشتەجێیە لە: (ناساڵح، وەلی هەیەر، تیلەکۆی گەورە و تیلەکۆی بچوك)(68) پێکهاتوون بەلام پێش ئەوەی وەك تیرەیەك لە جاف باسیان لێوەبکرێ. ئەمانە لقێك بوونە لە هۆزی (قەرەوڵس)ی کورد (بروانە: مژکرات مامون بگ)ص(65).

* عەمەڵە: لە هەر دوو بەشی کوردستانی باشوور و رۆژهەلاتدا بەرچاودەکەون و دەکرێنە سێ لقی: (جامبازی، ئاخەوەیسی و هۆزیحەمە)ەوە. لەو سنوورانەدا ژیاون کە لە ژێر دەسەلاتی بەگزادەکانی جافدا بووە لە قەزای کفری و کەلار و دێهاتەکانی سەرسنووری سیروان بەرەو پێواز لەگەڵ ناوچەی زەنگاباد. سەرەرای ئەوانەیان کە ئەکەونە سنووری شارەزوور و قەزای هەڵەبجەوە. ئینگلیزەکان ژمارەی خێزانەکانی لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی رابووردوودا بە (200)(69) دووسەد خێزان داناوە.

* یەزدانبەخشی: بە زۆری ئەمانە بە دێهاتەکانی رۆخی سیرواندا دابەشبوون سەرگەرمی کشتوکاڵ کردنن (70). یەکێکی ترن لە تیرە گەورەکانی جاف و دەبن بەسێ لقی وەك: (کۆمەڵی خاڵە، کۆمەڵی بەگزادە و کۆمەڵی مامەشی)(71). کەچی عەزاوی لقەکانی ئەم تیرەیەی لە: (یەزدانبەخشی، بەگزادە، سڵتان ئەحمەدی و مامەشی)دا (72) کۆکردۆتەوە لەسنووری شەمێران و قەزای هەڵەبجەدا بەنزیکەی (1000)هەزار خێزان خەملاندوونی

لەگەڵ بەشێك لەو دێهاتانەی کە تێیدانیشتەجێن. لە سنووری کەلاریشدا بە پلەیەکی کەم نەبێ بەرچاو ناکەون.

* تاوگۆزی: دەکرێ ئەمانە وەك دووبەشی سەرەکی قسەیان لەسەر بکرێ ئەوانەیان کە دەکەونە سنووری کوردستانی رۆژهەڵات (ئێران)ەوە وەك تیرەیەك لە جافی (جوانرۆ) باسیان لێوەدەکرێ ئەوانەشیان کە لە پەیماننامەی زەهاوی 1639ەوە بەر جافی مورادی کەوتن، شوێنی نیشەجێبوونی ئێستایان ناوچەی شەمێران و تاوگۆزییە لە نێوان هەردوو قەزای دەربەندیخان و هەڵەبجەدا لە دیارترینی ئەو کەسایەتیانەی لەناو تاوگۆزیدا هەڵکەوتبێ شاعیری گەورە مەولەوی تاوگۆزی (1806 –1882) یە (73).

* نەوڕۆڵی: بە رادەیەکی زۆر کەم نەبێ لە ناوچەی گەرمیان وکەلاردا بەرچاوناکەون. هەرچەندە بەشێکی گەورەی هۆزی جاف پێکئەهێنن. لەگەڵ ئەوەشدا لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانی و تا ئەوکاتەی رەوشی گەرمیان و کوێستان ولە ناوهۆزەکانی کوردا باو بووە هاتوونەتە گەرمیان و دەوروبەری کفری، بەشێکی تریان دەکەونە ناوچە سنوورییەکانی هۆرێن و شێخانەوە لە قەزای خانەقی و لە ساڵانی پێش جەنگی یەکەمدا (1914-1918)لە کوردستاندا ژمارەیان (1500)(74)خێزان بووە.

* شێخ سمایلی: بەشێك لەمانە خۆیان دەبەنەوە سەر شا ئیسماعیلی سەفەوی (1501 –1524)و(75)، دەبنە دوو لقی سەرەکی: (شێخ سمایلی سوورەجۆ و شێخ سمایلی بنەجووت)(76).

یەکەمیان لە دەوروبەری شانەدەری ئێستا و دووەمیان دەکەونە سنووری گرێزەوە. زیاتر ناوچەکەیان دەکەوێتە نێوان (موان) و (کەوڵۆس)ەوە(77)، لە ناحیەی خورماڵ لەدیارترین دێهاتەکانیان: (شانەدەری سەروو، شانەدەری خواروو، ماو، کەچەڵی، مزگەوتە، کێلەکەوە، حاجیناميق، گرێزە و کانیپانکە...)یە (78) لە ناوچەی شارەزووردا.

* پشتماڵە: بەوەی بەگزادەکانی جاف بوون بە سێ بەشی: (بەگزادەی بەهرام بەگی، کەیخەسرەوبەگی و وەڵەدبەگی)یەوە(79) ئەمانیش واتە (پشتماڵە)کان زیاتر لە خزمەتی ئەم بنەماڵانەدا بوون و لەلایەن ئەوانیشەوە هەموو خەرجی و مەسروفێکیان لە ئەستۆگێراوە. هەر لەو کاتەشەوە: (بەگزادەکان دانیشتوون ئەوانیش بە خزمەتکاری بەگزادەکان دانیشتوون)(80) لە دەوروبەری قزرابات، کەلار، هەڵەبجە و ناوچەی شارەزوور.

4-جافی گۆران: وەك پێشتر باسمان لێوە کرد، ڕێژەیەکی گەورە لە هۆزی جاف لە وڵاتی ئێران و کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا ماونەتەوە، بەڵام بەشێك لەوانە چوونەتە ناو (گۆران)ەکانەوە و بوون بە جافی گۆران. بە زۆری تیرەکانی ئەم بەشەی جاف وەك: (میرزا غولام حسێن شیرازی)81 واتە (مێجەرسۆن) باسی لێوە کردوون و زۆریشان دەکەونە بەشی کوردستانی باشوورەوە. بەتایبەتی ئەو گوند و دێهاتانەی ئەکەونە سنووری قەزای خانەقین و ناحیەی هۆرێن و شێخان و لەگەڵ ناحیەی قۆرەتوو و مەیداندا، دیارترین تیرەکانیشی ئەمانەن:

1.قادر میر وەیسی.
2.تایشەیی.
3.قەڵخانی.
4.یوسفیار ئەحمەدی.
5.کۆیك.
6.نێرژی (نێرژەیی)
7.کرکایش (گورگ کایش)

## دووەم: هۆزی زەنگنە

به پێی زۆرینەی ئەو سەرچاوانەی باسیان لەم هۆزە کردووە بنەچە یا رەچەڵەکیان دەبەنەوە سەر کەسایەتیەك بەناوی: (شێخ عەلییەوە و لای یەکێ لە شایانی سەفەوی گەیشتووەتە پلەی وەزیر)(82). بۆ ئاشکرابوونی زیاتر سەبارەت بەو رایە مێژووناسی گەورەی کورد شەرەفخان لە بارەی فەرمانڕەوایانی زەنگنەوە نووسیویەتی: (لە رۆژگاری دەسەڵاتداری شا ئیسماعیلی سەفەویدا زۆریان گەشە کردو و پلەوپایە و سایە و هایەی فرەیان بۆ پەیدابوو لەوانە بوون کە نزیکیان ئێرەییان پێ دەبردن)(83). ئەمانیش وەك جاف دەبن بە دووبەشی سەرەکی یەوە. واتە ئەوانەیان کە ئەمڕۆ دەکەونە ولأتی ئێرانەوە لە دەوروبەری کرماشان، فارس، خۆزستان و ماهی دەشت دان و بەشێکیشیان بە ناوچەکانی ترا پەرتوبلأو بوونەتەوە، بە رادەیەك کاتێ باس لە کرماشان و دەوروبەری کرماشان دەکرێ لەگەڵ ئەوەشدا باس لە دوو هۆزی دێرین و ناودار دەکرێ و بەتەواوی هەموو هێزو توانای ناوچەکەیان بەدەستەوەیە کە ئەوانیش بۆ خۆیان هۆزی زەنگنە و کەڵوڕن (84). کەلیموڵڵای تەوەحودی لەو نووسینەی خۆیدا کە لە بارەی هۆزی زەنگنەوە نووسیویە، رای گەلێك لە مێژووناسان و روناکبیرانی ئێرانی لە بارەیانەوە هێناوەتەوە و لە بڕگەیەکیدا و توویە: (زەنگنە چوارسەد خێزانن و لە شارەکانی کرماشان و گەیلانی رۆژئاوا دان لە دوو تیرەی فارس ئاغا و رۆستەم ئاغا پێکهاتوون)(85) لە شوێنێکی کەشدا وای دەگێرێتەوە : زەنگنە دووسەد و پەنجا خێزانیان لە ناحیەی کەرکوك، خانەقین، کفری، ئیبراهیم خانچی و سۆماك دان، ژمارەیەکیشیان دەکەوێتە خۆراسانی ئێران و ئەفغانستانەوە(86). واش باسی لێوەکردوون. ئەمانە گەلێ پیاوی زانا و ئەدیب و کەسایەتی سیاسیان تیاهەڵکەوتووە و گەیشتوونەتە پلەی دەسەلأت و فەرمانڕەوایەتی لە سەردەمی سەفەوی (1501 –1736)و قاجاری (1797–1925)یەکانی ئێران و تەنانەت رای واش هەیە کە (سنجاوی)یەکانیش لقێك بن لە زەنگنە (بڕوانە: مژکرات مامون بیگ بن بیگەبگ، ص23) بەلأم بەشی دووەمی هۆزی زەنگنە دەکەونە

کوردستانی باشوور (عێراق)ەوە و، ئەمانیش بۆ خۆیان لە دوو ناوچەی سەرەکی گەرمیاندا دوای دەستهەڵگرتنیان لە ژیانی کۆچەری نیشتەجێبوون. ئەوانەیان بەم دیو و بەو دیوی (ئاوەسپی)دا دابەشبوون بە ئیبراهیم خانچی ناسراون و بەشەکەی تریان دەکەونە سنووری کفری و(87) بناری گل و قەزای کەلاری ئێستاوە جگە لەوە بەشێك لە نووسەر و شۆڤێنییەکانی عەرەب وەك پێشتر قسەم لەسەر کردن، ئەم هۆزەی کورد دەبەنەوە سەر (بنی اسد)ی عەرەب، لەو کاتەشەوە کەوتوونەتە کوردستانی باشوورەوە گەلێ کەسایەتی و سوارچاکی بەناوبانگیان لێهەڵکەوتووە بۆ نموونە یەکێك لە دوانزە سوارەی مەریوان کە لە مێژووی نەتەوایەتی کوردا شۆرەت و ناوبانگییەکی دیاری هەیە: (فەرامورزی زەنگنە)(89)بووە و لە کاتی فەرمانڕەوایەتی عوسمانییەکاندا توانیویانە میرنشینێك پێکەوەبنێن لە ناوچەکەی خۆیاندا کە بە (میرنشینی قەیتول)(90) ناسراوە وەك چۆن لە کوردستانی رۆژهەڵات و کرماشاندا میرنشینێکی تریان هەبووە. تا ئێستاش هۆزی زەنگنە لە رووی ئاخاوتن و قسەکردنیانەوە شێوازی تایبەت بە خۆیان هەیە کە زۆر لە شێوەزاری (هەورامی، باجەلانی و کاکەیی)دەچێت. لەم سەرو بەندەشدا هۆزی زەنگنە سەرەرای ئەوشوێن و ناوچانەی پێشتر باسم لێوەکرد لە سنووری قەزای کەلار و ناحیەی تیلەکۆ (رزگاری)دا دەکەونە ناوچە و گوندەکانی: (توکن، عەزیزقادر، قولیجان ئەمین، قولیجان سەرحەد، بنزیخاڵ، بنەکەی خەپەکوێر، عەلیان گەورە، عەلیان بچووك، خان رۆستەم، خان رەئوف، کانی عوبێد و سەرڕەش)(91)جگە لەوانەشیان کە دەکەونە ناو شاری کەلاری ئەمڕۆ و گوندی گردە گۆزینەوە.

سێهەم: هۆزی باجەلان

مامۆستا گیوی موکریانی لە فەرهەنگی کوردستاندا لە بارەی باجەلانەوە ئەڵێ: (پارچە خاکێکە لە نێوان مەندەلی وخانەقیندا و لەسەر ئاوی ئەڵوەندێیە). لە بارەی (باجەلانی)شەوە دەنووسێ: (تیرەیەکی کوردە لە خێڵی لوولوو لە خاکی باجەلانی دادەنیشێ. راوێژی ئاخافتنیان زۆر لە هەورامی

دەچێ)(92)، بەڵام کاتێ باس لە هۆزی باجەڵان دەکرێ زۆر لە مێژووناسان واپێ دادەگرن کە ئەمانە لە: (دوو بەشی سەرەکی پێکهاتبن)و (93) هەر یەکە لەوانەش بووبێتن بە چەند تیرەیەکەوە. ئەو بەشانەش بۆ خۆیان: جمور و قازانلوون. هەمان سەرچاوە کاتێ دێتە سەرباسکردنی (جمور) لە بارەیانەوە دەنووسێ: (لیست من اصل باجلانی)(94). کەچی عەباس عەزاوی وای باسی لێوە کردوون (باجەڵان) لە پازدە تیرە پێکهاتوون شوێنیان لە وڵاتی: (عێراقدا ئەکەوێتە بنکورەوە لە ناحیەی قۆرەتوو)(95) تیرەکانیشی: (قازانلوو، چوارکڵاو، قەریبەوەن، فەلەوەن، شێرەوەن، خدرەوەن، زوزەوەن، قەسرەوەن و جوگرلوو)ە. فەرمانگەی شانشینی (ملکی) بەریتانی لە زمانی (قازانلوو)ە کانیانەوە وایدەگێرێتەوە کە: (قازانلووەکان وای بۆ دەچن کە ئەوان لە بنەماڵەی(سلالە)خێڵێکی تورکن و لە سەرەتادا نزیك بە شاری هەمەدان نیشەجێبوون)(96). لەگەڵ ئەوەشدا لە بارەی بنەما و رەسەنایەتیانەوە گەلێ را و بۆچوونی هەیە. هەندێ ئەو رایە ئەسەلمێنن کە رەچەڵەکیان لە چیاکانی ئۆڕاڵەوە هاتبێ و هەندێ بە توورك و لە شوێنی کەشدا رەسەنایەتی و ئەساڵەتیان دەبەنەوە بۆ وڵاتی ئێران، لە لایەکی کەشەوە (باجەڵان)ەکان خۆیان وا یدەگێڕنەوە کە ئەمان لە کوردستانی باکوور و لە (دیاربەکر)ەوە هاتبێت. ئەمەش بۆ خۆی رەنگە زۆر لەو راستییەوە نزیکبێ کە لە سەردەمی (عەبداڵبەگی باجەڵان)دا و لە: (ساڵی 1630زایینییەوە) کەوتبێتە ناوچەی زەهاو کە لەو دەمانەدا لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا بووە و: (سوڵتان موارادی چوارەمی عوسمانی ئەم ناوچەیەی خستۆتە ژێر دەسەڵاتەوە و ساڵانە 300000 لیرەی)ی (97) ئەوکاتەی بۆ بڕیوەتەوە. دیارە هەر لەم سەروبەندەشدا بووە. بۆ یەکەمجار (میرنشینی باجەڵان) لە ناوچەی زەهاودا هاتبێتەکایەوە. هەرچەندە ئەم ناوچەیە پێش مۆرکردنی رێکەوتننامەی زەهاوی 1639 لەژێر دەسەڵاتی گۆرانەکاندا بووە. ( لای هەموو رۆژهەڵاتی زەهاویش شوێنی نیشتەجێبوونی کەڵوڕ بووە)، بەڵام دوای ئەوەی عەبداڵبەگ

گەیشتووەتە ئەم ناوچەیە. بە رازیبوونی سوڵتانی عوسمانی هەمووی خراوەتە ژێر دەس و لە خێڵ و هۆزەکانی تر پاککراوەتەوە. ناوچەکەش تا ئەوکاتەی قاجارییەکان (1797–1925)(98) فەرمانڕەوایەتی ئێرانیان کەوتووەتە دەستەوە. لەلایەن ئەمانەوە بەڕێوە براوە و لە رێکەوتننامەی ناوبراو بەدواوە هۆزی باجەلأن بوون بە دوو بەشەوە واتە ئەوانەیان کەوتنە سنووری ولأتی فارس (ئێران)ەوە (99). بەشی دووەمیان ئەوانەیان دەگرێتەوە کە لە رێکەوتننامەی زەهاو و دواتر لە رێکەوتننامەی ئەرزرۆمی دووەمی 1847ەوە هاتنە سنوورەکانی قەزای (خانەقین)ی ئێستا و لە ناوچەکانی (بنکورە) نیشەجێبوون، بەلأم ئەمڕۆ باجەلأن لە کوردستانی باشووردا جگە لە وانەیان پێشتر باسم لێوەکرد دەکەونە سنووری (موسڵ، کۆیە و کەرکوك)ەوە و ئەمەش وایکردوە و کە (ناوچەکانی دیالێکتی باجەلأن بەم شێوە بلأوە و لە یەکتر دووربن، بەلأم ئەو دیالێکتەی پێی دەدوێن چونیەکە. ئەوەندە هەیە کرمانجی ناوەڕاست بەهۆی تێکەڵییەوە، کارێکی تەواوی تێکردووە) (100).

لە کۆتای حەفتاکانی سەدەی بیستەمی رابردووەوە تا ئێستا لە سنووری قەزای کەلاردا نزیکەی (1000) هەزار خێزانی باجەلأنی تیا نیشتەجێیە. لە سنووری (بنکورە) و قەزای (خانەقین)یشدا. بە شێوازێکی گشتی دەتوانرێ گوند و دێهاتەکانی: (گاکوڵ، کانیماسی، وەلیئاغا، شێرەوەند، ئاوایی گەورە، پشتپەنگ، تازەشار، سەوزبلأخ، حاجیلەر، عالیاوە و باوەپلأوی)(101)بەشوێنی ژیان و نیشتەجێبوونی تەواوی هۆزی باجەلان دابنرێ.

چوارەم: هۆزی دەلۆ:

شوێنی سەرەکی وسەرهەڵدانیان ئەکەوێتە ئاجداغ و بەرگەچەوە لە رۆژئاوای زنجیرە شاخەکانی (قەرەداغ) لە کوردستانی باشوور جگە لەوە تا ئێستا هیچ بەڵگە و دەلالەتێکی سەلمێنراو و باوەڕپێکراوی مێژووی نییە کە زیاتر لە رەسەنایەتی و شوێنی دێرینتریان بدوێ و ئەوەمان بۆ ساغبکاتەوە

داخۆ ئەم هۆزەی کورد تەنها لە کوردستانی باشووری (عێراق)دا بوون یا شوێنی سەرهەڵدان و هاتنیان بۆ ئەم ناوچەیە لە جێگەیەکی ترەوە سەرچاوەی گرتووە، بەڵام ئەمانە لە رۆژگاری حکومڕانیەتی بابانەکاندا پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان لەگەڵیاندا هەبووە. هەر ئەم فاکتەرەش بووە کە وای لە فەرمانڕەوایانی بابان کردبێ زیاتر بایەخیان بدرێتێ و لە ناوچەکەی خۆیان و دەوروبەری سەنگاودا نیشتەجێ بن. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا بە سەرۆکایەتی (سەلیم بەگی دەلۆ) پاشان بەهۆی لاوازی دەسەڵاتی بابانەکان و ئەو(ئاژاوە و دووبەرەکایەتییەی لەگەڵ هۆزەکانی دەوروبەردا هەیانبوو هۆزی دەلۆ شوێنی خۆیان لە (سەنگاو)ی سەرووی کفرییەوە)(102) گواستەوە و بەرەو ناوچەکانی نزیك کفری، سەرقەڵا و بەشێکیان بەرەو خانەقین و دەوروبەری بوونەوە بۆ نموونە ئەو دووبەرەکایەتییەی کە لە نێوان هۆزی (دەلۆ و زەنگنە) دا بووە و(103) هەندێ لە مێژوونووسان قسەی لەسەر دەکەن. لەگەڵ ئەوەدا گەلێك کەسایەتی و پیاوی ناسراوی وەك: (کەمەرخان و حسین خانی دەلۆ)یان(104) تیا هەڵکەوتووە کە دژ بە دەسەڵاتدارانی عوسمانی خەباتیان کردووە و لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا شەهیدبوون، دواتریش قۆناغی ئەو خەبات و راپەڕینە بەناوبانگەی ئیبراهیم خانی دەلۆ(105)دێت کە تیایدا توانی بۆ ماوەیەك کفری و دێهاتەکانی دەوروبەری لە دەسەڵاتی ئینگلیزەکان رزگاربکات. ماوەتەوە بڵێین: هۆزی دەلۆ وەك لە ناوەکەیدا دیارە لە (10)دە تیرەی (جامڕێزی، ئەوڕەحمان بەگی، سەلیموەیسی، خوبیاروەندی، گەچی (گاشی)(106)، تەنکەوەندی، پێنجئەنگوستی، ئالینەزەری، تائیشەیی و چەرمەوەی) پێکهاتوون و بە رادەیەکی دیار لە تەوەری گەرمیاندا لە شاری کفری و شارۆچکەی سەرقەڵا و دێهاتەکانی (ئیبراهیم خان، کارێز، گلاّبات، قنگربان، تەپەچەرموو، جەبارە، هەمزەگمت، عەینشوکر، وەلی هەیەر، بەکرەشەل و سەیجەژنی)(107) بەرچاو دەکەون و چەند خێزانێکیان دەکەونە سنووری قەزای خانەقین و ژمارەیەکیشیان لە حەفتاکانی سەدەی رابووردوو بە دواوە لە

سنووری قەزای کەلاردا دەژین. لە کەسایەتیە ناسراوەکانیشیان بەتایبەتی لە سەدەی بیستەمی رابردوودا (فەتحولاّبەگ، خەلیل بەگ و شەریف بەگ)ی(108) دەلۆ بوون.

**پێنجەم: ساداتی کاکەیی (کاغانلو)**

هەرچەندە ناکرێ کاکەییەکان یا( کاغانلو)(109) لە ناو کوردەواریدا وەك هۆز یاخێڵێك قسەیان لەسەر بکرێ بەڵکو ئەمانە خاوەنی بیروڕایەکی ئایینی (تا رادەیەك) نهێنی تایبەت بە خۆیانن و لە رووی بنەما و رەسەنایەتیشەوە لە ناو کۆمەڵگای کوردا بەشێکی تەواوی ئەم کۆمەڵگایە پێکدەهێنن و لە زۆربەی پارچەکانی کوردستانی دابەشکراودا بەرچاودەکەون، بەلاّم لە بەشی کوردستانی باشووردا (زۆربەیان لە پارێزگای کەرکوك و قەزای خانەقی و ژمارەیەکی کەمتریان لە سلێمانی و نەینەوا)دان (110). لە هەموو هەلومەرج و گۆڕانکاریەکدا کە بەسەر کوردستان و ناوچەکەدا هاتبێ ئەمانە توانیویانە پارێزگاری لەبیروڕاو بۆچوونی خۆیان بکەن و داکۆکی لێبکەن. بە بۆچوونی ئەدمۆندز شوێنی سەرەکی کاکەییەکانی عێراق وەکو پێشتریش ئاماژەم بۆ کرد ئەکەونە نزیکەی (هەژدە گوندەوە لە ناوەندی ناحیەی تاوغ) (111) لە لیوای کەرکوك. ئەوانەشیان کە دەکەونە سنووری (خانەقین)ەوە لە حاجی قەرە و (112) نزیکی قزڕەباتدان، لە قەزای مەندەلی (113) و لە گەرەکی (قەڵەم حاجی)یشدا کۆمەڵێك خێزانی کاکەیی تیانیشتەجێبووە و زۆری کەشیان ئەکەونە گوندەکانی ناوچەی هاوار و قەزای هەڵەبجەوە. وەك حەمەئەمین هەورامانی لە نوسینێکی مێژوونوسی شەهید مەلا جەمیلی رۆژ بەیانییەوە (1910-2001) وەریگرتووە ئەڵێ: (کاکەییەکان لە رووی بیروڕای ئاینییەوە ئەبن بە چوار چینی سەرەکی (سەید، باوە، مام و دەروێش)ەوە و (114) بە شێوازێکی گشتی بە( ئەهلی هەق)و خاوەنی کتێبی پیرۆزی (سەرەنجام)ن. لەگەڵ دابونەریتی تایبەت بە خۆیاندا (وەك لە شوێنی تردا بە درێژی لەسەریم نووسیوە ا - ب نوسەر). ئەوانەشیان کە دەکەونە کەلار و

**دەوروبەریەوە لەوانەن کە لە ناوچەکانی ترەوە، بە هۆی سیاسەتی راگواستن و بارودۆخی نائاسایی کوردستانەوە بەرەو ئەم ناوچەیە بوونەتەوە و ژمارەی خێزانەکانیان بە هەموو چینەکانییەوە (سەید، باوە، مام، دەرویش)دەگەنە نزیکەی (200-250) خێزان. زۆربەشیان لەوانەن کە لە دوای سالأنی حەفتای سەدەی رابووردووەوە لە خانەقین و گوندەکانی (دولێ بەگزادە، کەرەپوولە، گەبیە، باوەسمایل، سەیبەرزوو قەڵەمە، کەنیزەرد، مێخاس، چەمەچەقەڵ، ئاوایی هاجەر، کونە ئەمنیە، ئاوایی دەروێش، باوەپلأوی و ئیبراهیم ئاوا)ەوە (115). هاتوونەتە ئەم سنوورەوە، بە جۆرێ ئەم ئاوارەکردن و دوورخستنەوەشیان لە ناوچەکەی خۆیان لە سۆزی یەکێتی و یەکرێزی دووری نەخستوونەتەوە و بە مەبەستی هاوکاریکردن و دەسگرۆییکردنی یەکتر لە سالأنی دوای راپەرینی (1991)ەوە. ئەنجومەنێکیان پێکەوەناوە بە ناوی (ئەنجوومەنی ئاینی و کۆمەلأیەتی کاکەیی) کە لە هەشت ئەندام و لەم کەسایەتیانە پێکهاتوون:**

1. **باوە رەشید باوە سمایل**
2. **سەید هەیاس سەید عەباس**
3. **سەید عادل سەید حەسەن**
4. **ئەکبەر ناوخاس ئەحمەد**
5. **عەزیز مراد مایەخان**
6. **ئەلیاس بابا**
7. **عەلی مراد**
8. **حەمەخان حاتەم.**

**سەرەڕای چەند ئەندامێکی (یەدەگ) لەگەڵ لیژنەیەك بۆ بە رێوەبردنی کاروباری دارایی و کارگێڕی و بۆ هەموو کەسێکی کاکەیی هەیە لە کاتی پێویستیدا پرس و رای خۆیان ببەنە بەردەم ئەو لیژنەیە بە مەبەستی چارەسەرکردن.**

**شەشەم: هۆزی گێژ**

**یەکێکە لەو هۆزە دێرینانەی کە شەرەفخانی بەدلیسی لە (شەرەفنامە)دا(116) ناوی بردوون و ئەبن بە دوو بەشی سەرەکییەوە. ئەوانەیان کە ئەکەونە بەشی ئێران و کوردستانی رۆژهەڵاتەوە، ئەوانەشیان کە لە کوردستانی باشوور و لە چەند ناوچەیەکی ئەم بەشەدا نیشتەجێبوون، بەڵام وەکتر تا ئێستا مێژوو و کاتی سەرهەڵدان و نیشتەجێبوونیان بەتەواوی ساغ نەبووەتەوە، بەڵکو بە شێوەیەکی پەرتوبڵاو لە دەوروبەری دهۆك و موسڵ کە بە (عشائرالسبعه) ناو دەبرێت، لەگەڵ ئەوانەیاندا کە لە سنووری گەرمیان و ئەکەونە نارێن، کفری و ناحیەی سەرقەڵاوە هاوکات یەکێکن لەو هۆزانەی شانبەشانی هۆزەکانی (زەند و رۆژبەیانی) (117)بۆ جاری دووەم کەلاری ئەمرۆیان پێش هەموو هۆزێکی تر ئاوەدان کردووەتەوە. ئەوانەش بۆ خۆیان بنەماڵەی (حاجی ئەڵماسی عەباس جەلیل کولیلی گێژ)ن(118). پێش ئەو دەمانەش گوندێکیان هەبوو بە ناوی (کاکولی)یەوە لە خواروی گوندی (چاڵە سورك)ی ئەمڕۆ و ئێلانچییەوە، (کاکولی)ش بۆ خۆی زۆر لە ناوی (کولیل)ی باپیرە گەورەی حاجی ئەڵماسەوە نزیکە و هیچ بە دووریشی نازانم ناوەکەی لە (کولیل)ەوە گۆڕابێ بۆ کاکولی و هەر ئەمان بنیادنەری ئەویش بووبێتن، بەڵام دواتر هۆزی گەورەی جاف کە لە ناوچەکەدا نیشەجێبوون و دەستیان لە ژیانی کۆچەری هەڵگرت. جێ پێیان بەوانی پێشوو لێژکردووە و ئەوانیش بە ناچارییەوە کەوتوونەتە ناوچەی نارێن و ناحیەی قەرەتەپە و قەزای کفری ئێستاوە و لە گوندەکانی (فەککە، وەرقە، جەبارە، تلیشان، عزە، باڵقۆز، سەید مدری، تازە شار، گومار، چەتاڵ، زەرداوی خوارو، وەلی هەیەر، سەیجەژنی، زنانە)(119) گیرسانەوە بەڵام (هیچ لق و تیرەکیان لێنەبووەتەوە). کە بە پێکهاتەی هۆزەکە دابنرێ. لەکاتی ئێستاشدا بۆجارێکی تر بەشێکی گەورەی هۆزی گێژ ئەکەونە سنووری قەزای کەلارەوە.**

**حەوتەم: هۆزی داودە**

هۆزێکی گەورەی کوردن، لە بەشی کوردستانی باشووردا و بە رادەیەکی دیار ئەکەونە سنووری گەرمیان و لیوای کەرکوکەوە، عەباس عەزاوی لە سەرەتای چلەکانی سەدەی بیستەمدا وای باس لێوەکردوون. پێشتر بەشێك بوونە لە هۆزی کەڵوڕ. (120) لەو کاتەشەوە کە ئەو باسی لێوەکردوون نزیکەی150 ساڵێك بووە هاتوونەتە کوردستانی ژێردەسەڵاتی (عێراق)ەوە و تا رادەیەك ناکۆکی و بشێوی لە نێوان میر و فەرمانڕەواکانیاندا هەبووە، بەڵام لەو کاتەوە کە لە شوێنی ئێستایان واتە سنوورەکانی هۆزی زەنگنە و رۆخی( ئاوەسپی و دووزخورماتوو)(121) نیشەجێبوون. بە ئاژەڵداری و کشتوکاڵەوە خەریك بوون. واش پێشبینی دەکرێ سەرهەڵدانی یەکەمین دامەزرێنەر و سەرۆك هۆزیان لە ساڵی 1710ی زاینیدا کەسایەتیەك بووە بە ناوی حەقی بەگەوە و لێرە بە دواوە لق و بەشەکانی تری بڵاوبوونەتەوە. بە جۆرێك ئەمین زەکی بەگ بە پێی بۆچوونی (مێجەر سۆن) لە ساڵانی پێش جەنگی یەکەمی جیهانی (1914-1918)دا ژمارەیان بە (1000)هەزار خێزان و(122) (ئەی. جەی. ئار و فیلد)یش بە( چوار هەزار خێزان) یانیان (123) لە قەڵەمداون. سەرەڕای ئەوەی بە (هۆزێکی کوردی جەنگاوەری نیمچە کۆچەری)ناویان بردوون و لە چوار تیرەی  (عەلی ئاغایی، ئیبراهیم بەگی، باقرئاغایی و ناسر ئاغایی)(124)پێکهاتوون، هەر تیرەیەکیشیان چەندین گوند ودێی تایبەت بە خۆیان لە ژێر دەسەڵاتدابووە. وەك لە تەوەری گەرمیاندا بنەی داوێ یا ناوداوێ یەکێکە لەو بەشە گرنگەی ناوچەی کوردستانی باشوور کە دەیان دێهاتی ئاوەدان لەخۆ دەگرێ بەڵام هۆی ئەم شاڵاوە دڕندانەی ئەنفالی حکومەتی (عێراق)ەوە کە لە کۆتاییەکانی هەشتای سەدەی بیستەمی رابردووەوە کردیە سەر ناوچەکە ژمارەیەکی زۆر لە خێزانی ئەم هۆز و ناوچەیە بەرکەوتن و هەر لە چوارچێوەی ئەم پرۆسەیەدا ژمارەیەکیشیان لە ناوەندە سەرەکیەکەی خۆیان سەرنگون و دوورخرانەوە و زۆریشییان تا ئێستا بە پەرتوبڵاوی دەژین.

**هەشتەم: هۆزی لەك**

**هەر دوو مێژووناس و گەریدەی ئینگلیز (ئەی. جەی. ئار و هینری فیلد. بەپێی راپۆرتێکی (Houtum-schindlar) کە لەساڵی 1892بلاۆکراوەتەوە ژمارەی (لەك)ی کوردیان (بە (135) هەزار خێزان) (125)داناوە و دەبن بە دوو بەشەوە. ئەوانەیان کە دەکەونە کوردستانی رۆژهەلاَت و ئێرانەوە بەتایبەتی لە باکووری لوڕستاندا (ناوچەیەك هەیە لەکستان و خێڵەکانی (لەك)ی تێدا جێنشینە و بریتین لەم لقانە: زەمد، مافی، باجەلان، تەزحان، سەلسەلە، دەلوەند و زەندەگیلی)(126) هەروەها ژمارەیەکی تر لەم (لەکانە لە ناوچەی ئەردەلاَن لە نزیك لەیلاخەوە جێگیربوون و ژمارەشیان لەم ناوچەیەدا هەزار خێزانێك ئەبێ و لوڕەکان بە کوردەکان ئەڵێن لەك)(127). هەر خۆشیان واتە لوڕەکان کوردەکانی لەك بە بەشێك لە لوڕ دەزانن، بەلاَم شێخ محەممەدی مەردۆخی بە تیرەیەکی لوڕیان دادەنێ و دەڵێ: ژمارەیان سەد هەزار کەسە و کردوونی بە پێنج بەشی (سەلسەلە، لالە، دلفان، تەرهان و دالوەندەوە و بەزۆری شیعەن و لە خانەقین، خورەمئاباد، والشتەر و لوڕستان نیشتەجێن)(128) جگە لەوە وای باسکردوون کە بەشێکی تریان لە (کولیایی، هەمەدان، ئەسفەهان و لە نێوان دەوڵەتئاوا و سوڵتانئاوا)دان و (129) لە دەوروبەری سنەش لە (ئەسفەندئاباد و لەیلاخ)دان. چەند خێزانێکی کەشیان ئەکەونە: (قەزای سەڵماس و ئازەربایىنجان)ەوە. وا پێشبینی دەکرێ ئەمانەی دوایی پێشتر لە باشوری ئێران و لە شیرازەوە هاتبن. سەبارەت بە وانەشیان کە دەکەونە عێراق و کوردستانی باشورەوە رەنگە ئەمانیش لەگەڵ شەپۆلە خێڵەکانی تری کوردا لە ولاَتی ئێرانەوە هاتبنە ئەم هەرێمەوە و لە زۆر شوێن و جێگای وەك(130) (هەولێر، کەرکوك، چەمچەماڵ، خانەقی و لە قەزای کفریشدا: (چەند گوندێکیان هەبوەو بەناوی سەرۆکەکانیانەوە ناونراوە)(131). بێ لەوانەش ژمارەیەکی زۆر لەخێزانی (لەك) دەکەونە سنووری کەلارەوە و لە گوندەکانی: چاڵەڕەش و سەید مەحمود دان.**

**نۆیەم: هۆزی پالاَنی**

بەپێی ئەوزانیاریانەبێ کە ئینگلیزەکان لە ساڵانی پێش جەنگی یەکەمی جیهانیدا سەبارەت بە خێڵ و هۆزە کوردەکان تۆماریان کردبێ نزیکەی (100)ساڵێك بووە لە وڵاتی فارسەوە هاتوونەتە کوردستان و لە (ناوچەی شێروانە)و(132) کەلاری ئێستا جێگیربوون. دواتر بە هۆی فشار و نیشەجێبوونی هۆزی جافەوە لەم ناوچەیەدا جێیان بەمانە و چەند هۆزێکی تر لێژ کردووە و ئەوانیش بە ناچارییەوە بەرەو ناوچەی زەنگاباد و شوێنانی تر بوونەتەوە. لەم سنوورەشدا هەر یەك لە شێخ مەحەممەدی مەردۆخی ئەمین زەکی بە( نزیکەی 350خێزانیان)(133)داناون و شوێنی نیشتەجێبوونیشیان بە ناوچەکانی (نێوان زەنگاباد و قەرەتەپە و رۆژهەڵاتی سیروان و دەککە)ی(134) سەربەقەزای خانەقین دەستنیشانکردوە و دانیشتوانی ناوچەکەش بە کشتوکاڵ و باخدارییەوە خەریك بوون. گوندەکانیش لە (بنەباخ، عەلوەش، تەپەچەرموو، سێڵەوەنی، قەلاّ، ئەحمەدگوڵە، ئاواییگەورە، ئاوایی فەدعەم مەعروف و ئاوایی فەرەج)(135)پێکهاتوون. دوای راگواستنی دانیشتوانی ناوچەکە لە ناوەڕاستی حەفتاکانی سەدەی بیستەمی رابردوودا بە هۆی سیاسەتی بە عەرەبکردنەوە بەشێکیان کەوتوونەتە باشووری عیراقەوە ژمارەیەکی تریشیان لە قەزای کەلار نیشتەجێن. جگە لە وانەیان کە دەکەونە دەوروبەری (مەخمور و هەولێرەوە).

**دەیەم: هۆزی ورمزیار**

سەبارەت بەمانەش عەباس عەزاوی ئەیانباتەوە سەر بڵباس)(136) و شێخ محەممەدی مەردۆخی دەڵێ: (گوایە تیرەیەکن لە هۆزی گەڵباخی)(137) بەلاّم (خودی ورمزیارەکان خۆیان لەوان بە جیا ئەزانن و ئەبن بە دوو بەشەوە (ورمزیاری زەڕینە)و ورمزیاری مەرەدەر). هەردووکیان لە دەوروبەری (دیواندەرە) نیشتەجێن)(138). بۆچوونی کەش لەگەڵ ئەوەدایە ناوی ورمزیار لە دوو برگە پێکهاتبێت هورمز، ئاهورا مەزدا، یەزدان، خودا + یار ئەویش بە واتای پیر، هاوەڵ دێت و (هەردوو بڕگەکە پێکەوە واتای پیری خودا، یارانی

خودا، خوداپەرستان دەبەخشێت ویان دەبێت هورمز لە ئاهوراوە هاتبێ و سوابێ. کە واتای خواوەندی رۆژ دەبەخشێت)(139)ئەمانەش بۆ خۆیان هۆزێکی گەورە و بەسەر زۆربەی پارچەکانی کوردستاندا دابەش بوون. بە تایبەتی لە شەڕی چاڵدێرانی 23ی ئابی 1514بە دواوە کە لە نێوان سەفەوییەکان و عوسمانیەکاندا دروستبوو. لە ناویاندا روناکبیر و کەسایەتی وەك محەممەد عەلی ورمزیاری خاوەنی دەسنووسی (روچە الورود لسعدی شیرازی)یەوە تائێستاش لە چوارچێوەی ئەو دەسنووسانەدا پارێزراوە کە دەکەونە خانەی (المخگوگات السریانیە والعربیە فی قرانە الرهبانیە)(140)ی بەغداوە و بۆ یەکەمجار لەساڵی 1130کۆچیدا نووسیویەتییەوە، بەڵام لە بەشی کوردستانی باشووردا گەورەترین بەشیان ئەکەوێتە پارێزگای هەولێرەوە کەچی لە سلێمانیدا بە رادەیەکی کەمتر و لە کەرکوك و دەوروبەری لەگەڵ خانەقی، کەلار، کفری و ناوچە سنوورییەکان ناحیەی (قۆرەتوو) و (مەیدان)دا ئەو رێژەیە بەرزتر دەبێتەوە و تەنانەت موکەڕەم تاڵەبانی کەسایەتیەکی وەك ئیبراهیم خانی دەلۆی بە رەچەڵەك گەڕاندووەتەوە سەر هۆزی ورمزیاری دەوروبەری قەڵاچەرمە و پیرەمۆنی ناوچەی گەرمیان.

یازدەیەم: هۆزی شەرەفبەیانی.

وا دەردەکەوێت زۆرینەیان بکەونە هەرێمی کوردستانی باشوورەوە، چونکە شێخ محەممەدی مەردۆخی شوێنی نیشەجێبوونیانی وا دەستنیشانکردووە کە (نزیکەی حەوسەد خێزان بن و لە دەوری کەرکوك و خانەقی و لە نێوان چیای شەواڵدڕە و سیروان)دا بن جگە لەوەی بەشێکی کەیان ئەکەونە (قۆرەتوو و هۆرێن و شێخان)ەوە. لە وەرزی هاوینیشدا بەرەو چیای بەمۆ دەبنەوە و(141) لە چەند تیرەیەکی سەربەخۆی وەك (کوێرەکی، ئەمیر خانبەگی، عەزیزبەگی، گاخار و نادری) (142) پێکهاتبن. واش پێشبینی دەکرێ (شەرەف بەیانی)یەکان لقێك یا تیرەیەك بن لە هۆزی جاف لە کاتێکدا دیارترین و گرینگترین لقەکانی (عەزیز بەگی وئەمیرخانبەگی)ن و بەپێی ئەو لێکۆڵینەوە

مەیدانیەی کە محەممەد هادی دەفتەر و عەبدوڵڵا حەسەن لەسەرەتای پەنجاکاندا و لە کوردستانی عێراقدا ئەنجامیانداوە. گەورەترین بەش لە دانیشتوانی ناحیەی (هۆرێن و شێخان)یان پێکهێناوە. سەرۆك و دەمڕاستەکانی ئەو کاتەشیان (عوسمان بەگی شەرەفبەیانی)(143)بووە. لەم کاتەشدا وێڕای ئەوەی چەند خێزانێکیان دەکەونە سنووری قەزای کەلار و دەربەندیخانەوە لە هەمان شوێنی پێشوویان و لە دێهاتەکانی ناوچەی (هۆرێن و شێخان)و ناحیەی (بەمۆ)دان.

دوانزەیەم: هۆزی کەڵوڕ

به شێوازێکی گشتی بەسەر دوو بەشی کوردستانی رۆژهەڵات (ئێران)و باشووری (عێراق)دا دابەشبوونی بەپێی لێکدانەوە و خەمڵاندنی شێخ محەممەدی مەردۆخی لە لیوای کرماشاندا (نزیکەی دە هەزار خێزانن و لە ماهیدەشت، هارون ئاباد، قەڵاشابین و دەوری قەسری شیرین و کرند) نیشتەجێن (144) و ناوەندەکەشیان (گەیلان)ە، لە دەوروبەری سەقزیشدا هەندێکیان نیشتەجێن و ژمارەیان 300 خێزانێك ئەبێ(145). سەبارەت بە وانەیان کە دەکەونە ئەم بەشەی دواییەوە واتە (سەقز) مەردۆخی دەنووسێ (200 خێزانێك دەبن لە رۆستەمانی خوڕخوڕە و دەوروبەری سەقزدا نیشتەجێن)(146)و هەموو هۆزەکەی کردووە بە بیست تیرەی (خالیدی، شیانی، سیاسیا، کازم خانی، خەمان، تڵش، گورگا، کلەپا، کولەجو، شوان، قوچمی، مەنسوری، ئەلوەندی، ماهیدەشتی، هارونئابادی، شاهینی، موشگیر، بداق بەگی، زەینەڵخانی و کمرە)ەوە، بەڵام وەك فەرمانڕەوایەتی میر شەرەفخانی بەدلیسی لە( شەرەفنامە)دا دابەشیکردوون بەسەر سێ لقی:

1. فەرمانڕەوایانی پڵنگان (کەسەربەلیوای سنەی ئێستایە)
2.فەرمانڕەوایانی دەرتەنگ (پێشتر ناوچەی حەلوانیان پێوتووە)
3.فەرمانڕەوایانی ماهیدەشت(148). (بەجۆرێ زولفەخارخانی کوڕی ئەخوەت خانی بەناوبانگ کە لە رۆژگاری فەرمانڕەوایەتی سەفەوییەکان (1501-

1731)دا هاتەشاری بەغدادەوە و بۆ ماوەیەك حوكمڕان بوو لە كەسایەتییە ناودارەكانی سەر بەم فەرمانڕەوایەتییە ا–ب نووسەر).

سەبارەت بەو كەڵوڕانەش كە كەوتوونەتە ناوچەی (كرماشان)ەوە بە (5000)هەزار خێزان و بگرە زیاتر خەملێنران و( بەشێكیان كۆچەر و ئەوانی تریان نیشتەجێن)(148) لە وەرزی هاویندا لە سەرویی رۆژئاوای چیاكانی پشتكۆدا بوون و بۆ زستان گەڕاونەتەوە دەشتی زەهاو و قەسری شیرین لەگەڵ ناوچە سنووریەكانی نێوان عێراق و ئێراندا.

وا شیان باس لێوەكردوون كە (ئەم خێڵە عەلیئەڵلاهی وشیعەی ئێجگار زۆر)(149)یان تێدایە. لە بەشی كوردستانی باشووریشدا دەكەونە زۆر جێگای وەك (لیوای سلێمانی، كەركوك و دیالە)و (150) ئەو ناوچە سنووریانەوە كە لە ئێرانی ئێستا و بەشی باشووری كوردستانی رۆژهەڵاتەوە نزیك دەبنەوە بە بۆچوونی عەباس عەزاویش هۆزی كەڵوڕ دەبن بە دوو بەشی:

1. مەنسوری151: كە دوانزە تایەفەن.
2. شابازی 152: ئەمەشیان بوون بە (35) تایەفەی سەربەخۆوە.

لەگەڵ ئەوەدا شوێنی نیشتەجێبوونی هەندێ لەو تایەفەی كە سەر بە هەر دوو بەشی (مەنسوری و شابازی)ن. دەستنیشانكردووە و لە كاتێكدا باس لە تایەفەی (سەلیمی) سەر بە بەشی (مەنسوری)دەكا ئەڵێ: ( دەكەونە (هەرسەم)ەوە و لێشیان لە دەوروبەری خانەقی و بنكورە دان، ئەوانی كەشیان دەكەونە كرند و زەهاوەوە)(153) جگە لەو خێزانانەیان كە دەكەونە سنووری قەزای كەلاری ئێستاوە.

**سیازدەیەم: خێزانی تاڵەبانی**

زۆر جاربە (بنەماڵە) (154)و لە شوێنی كەشدا بە( خێزانی تاڵەبانی)(155)ناو دەبرێن. وەك ئەوەی هەریەك لە ئەمین زەكی و شێخی مەردۆخی بە (1050 هەزار و پەنجاخێزان)یان(156) تۆماركردوون شوێنی نیشتەجێبوونیان ئەكەوێتە لیوای كەركوك و خانەقین و ناوچەكانی

دەوروبەریانەوە. ناوەکەشیان لە ناوی ئەو گوندی (تاڵەبان)ەوە هاتو کە (لەلایەن باپیرەگەورەیانەوە بنیادنراوە)(157) ئەمانیش سەر بە شێخانی (تەریقەتی قادرین و شێخ عەبدولڕەحمانی کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ مەحمود لە ناودارترین شێخانیانە)(158)و خاوەنی تەکیەی تایبەت بەخۆیان بوونە بەتایبەتی لە کەرکوك و بەغداد بەلآم بە بنەچە ئەگەرێنەوە سەر هۆزی زەنگنە و شێخ ئەحمەدی تاڵەبانی بە خۆی کوڕی مەلامەحمودی زەنگنەیە.

تەنانەت عەباس عەزاوی دەڵێ: (ئەمانە لە زەنگنەن وەك ئەوەی زۆر لە سەرۆکەکانیان ئەم جەختکردنەوەیان بۆ دووپات کردوومەتەوە لەوانە شێخ وەهابی*کوڕی شێخ حەمید کە لە (بنکورە)دا دەنیشێ و چەند جارێك بووەتە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران)ی (159) عێراق. لە سەردەمی پاشایەتی (1921-1958)دا. لەلایەکی کەشەوە دکتۆر نیوری تاڵەبانی بە رادەی خۆی دەیانباتەوە سەر (کاکە سووری ناوچەی بۆکان) و (160) لە بەرەی دایکیانەوە دەیانباتەوە سەر مەلا مەحمود و هۆزی زەنگنە، بەهەر حاڵ ئەمڕۆ ئەم هۆزە یا بنەماڵەیە لە چەند ناوچەیەکی کوردستانی وەك کەرکوك، کۆیە و لە ناوچەی (بنکورە)ی سەر بە قەزای خانەقین و گوندەکانی قەرەبلآخ و زەرداو، بەشێکێشیان دەکەونە سنووری کەلارەوە.

چواردەیەم: هۆزی زەند

دوای داڕمان و لە ناو چوونی بنەماڵەی زەند لەساڵی (1794)و(161) لە کاتی فەرمانڕەوایی (لوتف عەلیخان)ی زەند بە دواوە. ئەمانەشبوون بە دوو بەشەوە. ئەوانەیان کە تا ئێستاش لە وڵآتی ئێراندا ماونەتەوە، ئەوانەشیان کە لەو ماوەیە بە دواوە پەڕاکەندەی کوردستانی باشوور و ناوچەکانی تربوون وەك لە باسی هۆزەکانی جاف و گێژدا باسم لێوەکرد. سەرەتا بەرەو رۆژهەڵآتی کفری و سەرقەڵآ و شوێنی کەلاری ئێستا بوونەتەوە و دواتر بەرەو ناوچەی زەنگابادی سەر بە لیوای کەرکوك و لە (نێوان رێگای کفری سیروان نیشەجێبوون) (162). بە جۆرێ پێشتر ئەم ناوچەیە واتە زەنگاباد لە کاتی

فەرمانڕەوایەتی عوسمانیەکان (1299-1922)ە لە سەردەمی سوڵتان سلێمانی یەکەم/قانوونی(1520-1566)(163) (بنکەی لیوا –قاعدە لواو)(164) بووە، دوایی ئەو بایەخەی پیشووی لە دەستداوە.

سەرەتا زەن لەم دەوروبەرەدا (نزیکەی 600شەش سەد خێزان بوون)(165) و لە چەند تیرەکی (تاهیرخانی، عەلیان و حەمەساڵح ئاغایی...)پێکهاتبوون، تەنانەت کەریم خانی کوڕی ئیناك خانیزەند 1750-1779) (166) وەك زۆر لە مێژوونوسان ئەیانبەنەوە سەر هۆزی (لەك) لە تیرەی یاخود قۆڵی (عەلیان)یان بووەوە و هەمووشیان ئیسلام و سەر بە زاینگا واتە (مەزهەبی سونی)(168) بوون و لە گوندەکانی (کوڵەجو، بانسنوق، کۆکس، سێتەپان، تەپەعلی، حاجیلەر، قووبە، تەپەقەوی، تەبەکزن، هۆدەلی، لەلبن، تازە شاروقچقرخ)دا (169) دەنیشن. زۆربەی ئەندامانی ئەم هۆزەش بە گوێرەی هەلومەرجی ناوچەکەیان بە ئاژەڵداری، کشتوکاڵ و باخدارییەوە خەریکن. جگە لەوەی بەشێکیان ئەکەونە دەوروبەری کەرکوك و گوندێکیشیان لە سنوورەکانی هۆزی زەنگنەدایە بە ناوی (فەقێ مستەفا)ەوە، چەند خێزانێکیان هەمیسان بە هۆی سیاسەتی راگواستن و (تەعریب)ەوە لە شوێنی خۆیان وەدەرنراون و هاتوونەتە سنووری قەزای کەلارەوە.

**پانزەیەم: هۆزی هەمەوەند**

هەمەوەند بۆ خۆی (گوندێکی گەورەی سەر بە ناحیەی بازیانە لە پارێزگای سلێمانی، لەسەر زنجیرە شاخی قەرەداخە. لەم ناوچەیەدا پێی ئەوترێ (دەربەندی بازیان)و بە دووری 3کم لە رێگای هاتووچۆکردنی نێوان کەرکوك و سلێمانی، گوندەکەش ئەکەوێتە نێوان دەربەندی بازیان و (تەنیاڵ)ی ناحیەی بازیانەوە. لەم ماوەی دواییەدا (لە چارەکی سێیەمی ئەم سەدەیەدا واتە (سەدەی بیستەم ا-ب نووسەر). حکومەت لەسەر داوای هۆزی هەمەوەند بنیادی ناوە)(170). وەك دەردەکەوێ ناوەکەی لە هەمان ناوی هۆزەکەوە هاتبێ. لە ساڵنامەی عوسمانی ساڵی 1310ی کۆچی بەرامبەر بە 1892ی

**زاینیی کاتێ باس لە هۆزی هەمەوەند ئەکا نووسیویە: (لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەمی زاینیدا لەئێرانەوە هاتوون و لە دێهاتەکانی بازیاندا نیشەجێبوون)(171). جگە لەوەش وەك هۆزێکی سەرکێش و یاخی لە دەسەلاٌتی دەوڵەت لەسەریاندواوە. هەر ئەو یاخیبوون و سەردانەنواندنەیان بووە کە وا لە دەسەلاٌتدارانی عوسمانی بکا (بەشێکی گەورەیان دووربخاتەوە بۆ باکووری ئەفەریقا)و (172) (تەرابلس)ی خۆرئاوا لە ولاٌتی (لیبیا)ی(173) ئێستا. هەر ساڵنامەکە لەو کاتەدا ژمارەیانی لە قەزای بازیان و (سنجق)ی شارەزوور (کەرکوك)دا بە نزیکەی (150)(174) ماڵ داناوە و وا شۆرەتیان رۆیشتووە کە (سوارچاکی بەناوبانگن)(175).**

**بە شێوازێکی ورد تر وایان لە بارەوە وتراوە کە (بنەچەیان لوڕستان بێ و شوێنەکەیان پێی ئەوترا چەمچەماڵ شارەکەشیان لە نێوان سلێمانی و کەرکوکی (ئێستادا ناوی ا-ب نووسەر)لەوەوە هاتووە)(176)، بەلاٌم ئەمانە (هیچ پەیوەندیەکیان بە هۆزی ئەحمەدوەند)ەوە (177) نییە وەك شێخ محەممەدی مەردۆخی باسی لێوە کردووە(178)، بەڵکو ئەمانە سەرەتا هۆزێکی سەربەخۆی نیمچە گەڕۆك بوون و پێکهاتبوون لە (9) تیرە، پێنجیان بە هەمەوەندی رەسەن دادەنرێت و هەر یەکەیان بە ناوی سەرکردەکەیانەوە ناونراوە وەك (بەگزادە، سەفەر وەند، رەمەوەند، رەشەوەند، سیتابەسەر)(179)، بەلاٌم چواری دواییان بە هەمەوەندی لادێی رەسەنی (کافرۆشی، چنگی، پیریادی، وسۆفی وەندە)(180)دادەنرێن، جگە لەوە بەشێکی تر لە هۆزی هەمەوەند: (لە شیراز نیشەجێبوون و شۆرەت و ناوبانگیان بە هەمەوەندی شیراز)(181) بلاٌوبووتەوە، وێرای ئەو بەشەیان کە لە (ناوچەی کرماشاندا گیرسانەوە و ژمارەیان 200 خێزانێك)(182)بووە. وەکو وتم بەپێی زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکان هەمەوەند هۆزێکی لێهاتوو و بەردەوام توانیویانە داکۆکی لە خۆیان و دەسەلاٌتی خۆیان بکەن و بۆ ئەوەش هەرچەندە (سەروەختێك وەکی جەردە و تەریدە ناسرابوو، نێو و نێو بانگی**

بەخراپی ڕۆیشتبوو، لەشکرێکی گوێرایەڵ و پڕ دیسپلینی هەبوو)ە (183).
کەچی زۆر بەسادەیی و نزمییەوە سەیری جوتیار و مسکێنی خۆیان کردووە.
ئەمڕۆش لە کوردستانی باشووردا بە پلەی یەکەم لە شار و شارۆچکە و گوندەکانی گەرمیاندا بەرچاو دەکەون.

شازدەیەم: هۆزی ڕۆژبەیانی

پێدەچێ بنەچەی ئەم هۆزە بگەڕێتەوە سەر کەسایەتی (ڕۆژبەیانی کوڕی خورشید) ی (184) دەیلەمی و وەك ئەوەی لەساڵی 333کۆچی بەرامبەر بە 943ی زاینی واتە لە کاتی فەرمانڕەوایی خەلیفەی عەباسی (ئەلموستەکفی بییللا)دا کە ویستی پایەی (میری میران – امیر الٲمراو) کە ئەو کاتە (سەرۆك وەزیران)ی ئێستا پێ بسپێرێ لە فەرمانڕەوایەتی عەباسیدا ئەگەر لەلایەن بۆیهیەکان و (میعزولدەولە)ی بۆیهیەوە لە کاروباری خەلافەتی عەباسی دوور نەخرایەتەوە. هەرچەندە ئەمیش واتە( روزبەهانی کوڕی ونداد)دواتر نێوانی لەگەڵ (میعزولدەولە)ی بۆیهیدا تێکچوو. بەپێی پیلانێك خۆی و( ئیبراهیم)ی برای لەلایەن بۆیهیکانەوە کوژران لەکاتێکدا پەیوەندی کۆمەڵایەتی و خێزانی پتەو لەنێوان هەردو بنەماڵەی (بۆیهی) و( رزبەهانی)دا هەبوو. بەوەی کچی (روزبەهانی ونادی کوڕی خورشید) خێزانی (بەختیاری کوڕی میعزولدەولە)185ی بۆیهی بوو. لەم کاتەشەوە بە تەواوی نێوانیان داویە لە کزی و بنەماڵەی (ڕۆژبەیانی)بەرەو شوێن و ناوچەیتر بوونەتەوە. وەك ئەوەی بەشێکیان لە عێراق و کوردستانی باشوور بەتایبەتی لە کەرکوك و دەوروبەری سەرەڕای ئەوانەیان کە ئەکەونە ناوچەی (بنکورە) و (186) (خانەقین)ەوە.جگە لەوە پێشتر هۆزی ڕۆژبەیانی لە کەلاری ئێستا و بەشێك لە دێهاتەکانیدا بەیەکێ لەو هۆزانە دادەنرێن کە وەك بنیادنەری (کەلار)ی ئەمڕۆ باسیان لێوەبکرێ و(187) ئاوەدانیان خستبێتە( ناوچەی شێروانە)و(188) تەنانەت لە

گوندەكانی (میلقاسم، شاكەل, زەردوو توران)(189) ژیابێتن. شانبەشانی ئەوەش بە گشتی گەلێك پیاوی زانا و ناسراویان تیاهەڵكەوتوە و(190) لە گەلێك شوێن و ناوچەی وەك كەركوك، قەرەحەسەن و دەوروبەری لەگەڵ ناوچەی بنكورە و بەشێكیشیان دووبارە دەكەنەوە سنووری قەزای كەلاری ئەمڕۆوە.

**حەڤدەیەم: ساداتی بەرزنجە**

بە گشتی ساداتی بەرزنجە لە( شێخانی قادری)و(191) سەر بەو ڕێبازەن كە لەلایەن شێخ عەبدولقادری گەیلانی( نیق 470ك - 1077ز/بەغدا 561 ك 1165ز)(192)یەوە لە زۆربەی ناوچە و وڵاتانی ئیسلامیدا بڵاوی كردووەتەوە، گەلێك مورید و دووكەوتی بۆ پەیدابووە، بە جۆرێ بووەتە مایەی كردنەوەی سەدان (ناوەند و تەكیە)ی(193) گەورە لە سەرتاسەری ئەو وڵاتانەدا بە كوردستانیشەوە، بەڵام (بەرزنجە)واتە ئەو شارۆچكەیەی سەر بە شارباژێری شاری سلێمانی)یەو (194) سەرەتا لەلایەن (شێخ عیسا شێخ موسا)ی(195) كوڕانی (شێخ بابا عەلی هەمەدانی) یەوە (196) لەساڵی (760ك-1359ز)دا لە هەمەدانی كوردستانی ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ناوچەی شارەزوور هاتوون و ئەم شوێنەیان بۆ نیشەجێبوونی خۆیان ئاوەدانكردووەتەوە (197). دواتر پەلوپۆیان بۆ زۆر ناوچەی تر لە كوردستان و دەرەوەی هاویشتووە. دەبینی مێژوونووسێكی وەك شێخ محەممەدی مەردۆخی بەرزنجیەكانی تەنها لە دەوروبەری كەركوك و سنە و خانەقین بە نزیكەی(1500) هەزار و پێنج سەد خێزان (198) لە قەڵەم داوە و لەگەڵ ئەوەدا وتوویە (سادات بەرزنجە از یٔنها خارج اند) (199)، بەڵام بە زۆری تۆكمەی و فراوانی دەسەڵاتیان لە ڕۆژگاری شێخ محەممەد مارفی نۆدێ و پاشان شێخ كاك ئەحمەدی شێخ (1207ك 1792ز/1305ك -1887ز) ی (200) كوڕیەوە تایبەتمەندی لە خۆدەگرێ و وەك دەسەڵاتێكی (ئاینی -كۆمەڵایەتی)دێتە

**کایەی کۆمەڵگای کوردەواری ئەو کاتەوە و (تەکیٚ)کانیشیان ئەبیٚتە خانە و مەڵبەندیٚکی (زانستی –ئاوەدانی) ئەوتۆ لە زۆربەی پارچەکانی کوردستانەوە رووی لیٚبکریٚ. کەچی وەك دەسەلاٚتی سیاسی و خەباتی کوردایەتی ئەو ملوانکە (ئایینی–سیاسی)یەی شیٚخانی بەرزنجە لە رۆژگاری شیٚخ مەحمود بەرزنجی(حەفید)ەوە زیاتر ئاویٚتەی دڵ و دەروونی گەل و نەتەوە و کۆمەڵگای کوردەواری دەبیٚ و توانیویە وەك سەرکردەیەکی ئایینی–سیاسی جیٚگای خۆی تا رادەیەك لە هەموو کوردستاندا بکاتەوە و بتوانیٚ هەموو چالاکییەکی خۆی لە هەموو شار و شارۆچکە و دیٚهاتیٚکی کوردستانی باشوردا دریٚژە پیٚبدا.**

***

**سەرچاوە پەراویٚزەکان:**

1. مذكرات مأمون بط بن بيطةبةط، ترجمة: محمدجميل روزبياني وشكر مصطفى،بغداد1980،ص.31

2. الدكتور ابراهيم خليل احمد، الدكتور خليل علي مراد: ايران وتركيا دراسه في التآريخ الحديث والمعاصر، الموصل 1992،ص.36

3. عباس العزاوي: عشائر العراق (الكرية)، بغداد 1947،ص.43

4. **ئەم هۆزە کوردانە لە بنەچەدا عەرەبن:گۆڤاری رۆشنبیری نویٚ، ژمارە** 124، **کانونی یەکەمی** 1989، **ل.**16

5. **هەمان سەرچاوەی پیٚشوو، ل.**17

6. **ئەم هۆزە کوردانە لە بنەچەدا عەرەبن: بابەتیٚك بوو لە گۆڤاری رۆشنبیری نویٚ، ژمارە** 142**دا بلاٚوکرایەوە کە لە گۆڤاری (الوگن العربی)ژمارە**648**و** 649**ی** 21،1989/7/14**ەوە. چەند زۆڵە کوردیٚك وەریانگیٚرابووە سەر زمانی کوردی و هەر بە ناوی گۆڤارەکە واتە( الوگن العربی)یەوە بلاٚویانکردبووەوە بە هاندانی فەرمانڕەوایانی بەعس، بە مەبەستی سڕینەوەی مۆرکی نەتەوایەتی کورد و لە چوارچیٚوەی پرۆسەی تەعریبکردنی کوردستان و گەلی کوردا. وەك لە بیرم بیٚ ئەو کاتە ئەمە بووە هۆی ناڕەزایی کۆمەلیٚك لە روناکبیرانی کورد لەو کاتەدا. بۆیە حکومەتی بەعس بڕیاری دا کە هەوڵبدریٚ ئەو نووسینە پیٚش بلاٚوبونەوە و دابەشکردنی گۆڤارەکە بە کتیٚبخانەکاندا لە چاپخانە دەسی بەسەراگیرا و ئەو لاپەڕانەیان لیٚکردەوە کە نووسینەکەی گرتبووەخۆ و دواتر بلاٚویانکردەوە، بەلاٚم ئەو (نسخە)یەی کە تا ئیٚستا لای منە لە ریٚگای نووسەری کۆچکردوو مامۆستامستەفا نەریمان** (1924–

**1994/5/25)ەوە دەستمکەوت کە ئەو کات سەرنووسەری گۆڤاری (رەنگین)بوو لە دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی.**

7. **ئەم هۆزە کوردانە لە بنەچەداعەرەبن: هەمان سەرچاوە،ل.**17

8. **دکتۆر ناجی عەباس ئەحمەد:کۆچەری و ترانس هیومانس لە پارێزگای سلێمانی و هەولێر، گۆڤاری کۆری زانیاری کورد، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم 1974،ل376(هەروەها)بروانە (سی. جی. ادموندز، مستشار وزاره الداخليه فى العراق، كرد و ترك و عرب، ترجمه: جرجيس فتح، بغداد1971، ص.**132

9. عبدلفتاح على يحيى: سالنامات الموصل العثمانية مصدرآ لدراسة تأريخ السليمانيه، مجله (زانكويادهوك)، القسم العربى، العدد2 المجلد 1تشرين الثانى 2000،ص.52

10. **خەسرەو جاف: وڕێنە، بەغدا1999،ل**102.

11.عبدلفتاح على يحيى: سالنامات الموصل العثمانية، المصدر السابق، ص.52

12. خليل اسماعيل محمد: انماط الأستيطان الريفى في العراق، بغداد1982، ص4

13. **دکتور ناجی عەباس ئەحمەد: کۆچەری وترانس هیومانس، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل.**37

14. الدكتور إبيراهيم خليل أحمد، الدكتور خليل على مراد: أيران و تركيا دراسة في التأريخ الحديث والمعاصر، المصدر السابق ، ص343-.346

15. **عباس العزاوى: عشائر العراق**، 2، **الكرديه ، بغداد** 1947، **ص.**43

16. **دکتۆر ناجی عەباس ئەحمەد: کۆچەری و ترانس هیومانس، هەمان سەرچاوە، ل**374

17. **عباس العزاوى: عشائر العراق، نفس المصدر السابقه، ص**68

18. **کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف: پێشەکی: محەمەد عەلی قەرەداغی، بەغدا**1995**، ل ل** 94-.101

19. **کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف : هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل.**124

20. **عباس العزاوى: عشائر العراق،نفس المصدر، ص**72–73–.75

21. **تەئریخی جاف: هەمان سەرچاوە، ل.**124

22. **عباس العزاوى: المصدر اسابقا، ص .**44

23.العشائرالكرية، ترجمة: فوادحمه خورشيد، بغداد1979، الهامش، ص79.

24.محمد امين زكى: تأريخ السليمانية وانحائها، ترجمه: الملاجميل الملا احمد الروزبيانى، بغداد1951،ص175-176.,

25. **عباس العزاوى: عشائر العراق، المصدر السابق، صص** 52–53

26. العشائر الكردية، ترجمة: فوادحمه خورشيد، المصدر السابق

27.مەحمود کەریم ئەحمەد: کورتەیەك لە مێژووی ئابوری و کۆمەلأیەتی سەراوی سوبحان ئاغای شارەزوور،سلێمانی، سلێمانی 2001،ل9

28. العشائر الكرديە: المصدر السابق، ص84( هەروەها)( بروانە: چەند یاداشتێکی حاجی ئیبراهیمی شاتری سەبارەت بە پاشایان کوشتی خەسرەو جاف)دەسنووس.

29. بەشی ئاماری ناحیەی (رزگاری) واتە(تیلەکۆ)ی پێشوو2001./8/20

30. بەشی ئاماری قەزای کەلار،2001./8/21

31. دکتۆر ناجی عەباس ئەحمەد:کۆچەری و ترانس هیومانس،هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل .380

32-العشائر الكردية، ترجمة: فواد حمة خورشيد، المصدر السابق، ص82

33. العشائر الكرديە: نفس المصدر،ص.82

34. کریم بەگی فەتاح بەگی جاف، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل.138

35. دکتۆر ناجی عەباس ئەحمەد، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل.379

36. بەشی ئاماری قائیمقامیەتی کەلار.

37. عباس العزاوی: عشائر العراق، المصدرالسابق، ص.49

38. عباس العزاوی: نفس المصدر، ص49–50 (هەروەها)کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف،ل.130

39. ئاماری ناحیەی رزگاری،2001./8/21

40. ئاماری قائیمقامیەتی کەلار،ئابی .2001

41. العشائر الكرديە: المصدر السابق، ص85(هەروەها) بروانە کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف: ل 123وعباس العزاوی،ص.51

42. العشائر الكرديە: نفس المصدر، ص.85

43. عباس العزاوی: نفس المصدر، ص.51

44. ئاماری ناحیەی رزگاری /کەلاری ئابی .2001

45. کەریم بەگی جاف: هەمان سەرچاوە، ل.135

46. عباس العزاوی: نفس المصدر، ص.48

47. بەشی ئاماری قەزای کەلار، ئابی 2001(هەروەها) کاك (حەمید مەجید سەمین)ی کەماڵەیی، کەلار کۆتایی ئابی .2001

48. العشائر الكرديە: المصدرالسابق، ص49.83–

49. بەشی ئاماری قەزای کەلار لەگەڵ زانیاری چەند کەسایەتیەکی ناوچەکە.

50. **دكتۆر ناجی عەباس ئەحمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل.**380
51. **عباس العزاوی: نفس المصدر، ص .**47
52. **هاوریێ باخەوان: ئالآی کورد، سلێمانی** 2001 **لا** 60
53. **دیوانی نالی کۆکردنەوە لەسەر نووسینی: د.مارف خەزنەدار بەغداد** 1977، ل5
54. **عباس العزاوی: نفس المصدر، ص** 58
55. **کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل**136
56. **عباس العزاوی: نفس المصدر، ص** 57
57. **العزاوی، نفس المصدر،** 56
58. **کەریم بەگی جاف، سەرچاوەی پێشوو،** 135
59. **عباس العزاوی، نفس المصدر ص**57
60. **العشائر الکردیه، نفس المصدر، ص** 88 (**هەروەها**) **عباس العزاوی: عشائر العراق، ص**54
61. **عباس العزاوی: نفس المصدر، ص** 55
62. **کەریم بەگی جاف، ل** 137
63. العشائير الكردية: ترجمة: فواد حةمة خورشيد ، ص88
64. **کەریم بەگی جاف: هەمان سەرچاوە، ل** 142
65. **عباس العزاوی: نفس المصدر، ص** 59
66. **العشائرالکردیه، ترجمه: فوادحمەخورشید ص**86
67. **کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف: تەئریخی جاف، ل.**143
68. **ئاماری ناحیەی رزگاری ئابی .**2001
69. **العشائر الکردیه: نفس المصدر، ص.**87
70. عبدالفتاح على يحى: سالنامات الموصل العثمانية مصدراً لدراسة تأريخ السليمانية، المصدر السابق، ص.52
71. **کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل.**139
72. **عباس العزاوی: عشائر العراق،** (2)، **الکردیه، ص.**60
73. **علاء الدین سجادی: مێژووی ئەدەبی کوردی، بەغدا**1952، **ل.**242
74. **مەحمەد ئەمین زەکی: خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان،بەرگی یەکەم و دووەم، سلێمانی** 2000، **ل.**242

75. **الدكتور ابراهيم خليل احمد، الدكتور خليل علي مراد: ايران و تركيادراسه في التأريخ الحديث والمعاصر، الموصل** 1992، .343

76. **كەریم بەگی جاف: تەئریخی جاف، هەمان سەرچاوەی پێشوول.**140

77. **دكتۆر ناجی ئەحمەد: كۆچەری و ترانس هیومانس، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل.**382

78. **مامۆستا محمود كەریم ئەحمەد: ماستە لە ئابووری كشتوڵیدا، خەڵكی سەراوی سوبحان ئاغای شارەزوور،**30/9/2001.

79. الدكتور شاكرخصباك: الاكراد، دراسة جغرافية،بغداد1972،ص.369

80. **كەریم بەگی فەتاح بەگی جاف: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل.**142

81. سون (ميرزا غلام حين شيرازى): رحلة متنكر الى بلاد ما بين النهرين وكردستان، نقله الى العربية وحققه وقدم له وعلق عليه، فؤاد وجميل: الجزاء الأولى، من (اصطنبول)الى( السليمانية)، الطبعة الأولى، بغداد 1970، صص 286-.287

82. **سی. جی.ادموندز: كردوترك وعرب، ترجمە: جرجيس فتح الله،بغداد** 1971، **ص.**246

83. **شەرەفخانی بەدلیسی:شەرەفنامە، وەرگێرانی: هەژار، تاران، چاپی دووەم**1981، **ل.**624

84. **كليم الله توحدی: ايل زنگنه (بەزمانی فارسی)، ئاوێنە بەشی فارسی،ژمارە (؟)،ل.**156

85. **كليم الله توحدی،ايل زەنگنە، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل.**156

86. **كليم الله توحدی، ايل زەنگنە، ل.**156

87. العشائر الكردية، ترجمة: فواد حةمة خورشيد، المصدر الصابق،ص 140-.141

88. **عباس العزاوی: عشائر العراق، الكرديه، المصدر السابق، ص**175.

**(هەروەها) بروانە، گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە(** 124**)، ئەم هۆزە كوردانە لەبنەچەدا عرەبن.**

89. **محمد مردان مجيد: كۆمەڵەی كەلەپووری ویادكردنەوەی میهرەجانی ئاهەنگی نەورۆز، گۆڤاری (كەلەپوری كورد)، ژمارە (**14**)، هاوینی** 2001**، ل**15.

90. **بروانە هێمن باقر:میرنشینی لەبیركراوی زەنگنە لە كرماشان و قەیتولی گەرمیاندا، گۆڤاری (كەركوك) ژمارە (**6**)،ل**95–.116

91. **بەشی ئاماری ناحیەی رزگاری، قەزای كەلار، ئابی** 2001. **( هەروەها) بۆ زیاتر شارەزابوون لەبارەی ناوچەی زەنگنەو گوندەكانی یەوە بروانە : (محمد عبدالرحمان زەنگنە، مێژووی عەشیرەتی زەنگنە، بەغداد،**1980**).**

92. **گیوی موكریانی: فەرهەنگی كوردستان، هەولێر** 1999**،ل.**50

93. **العشائر الكرديه: فواد حمه خورشيد، بغداد** 1979، **ص**.19

94. **المصدر السابق، ص**.26

95.**عباس العزاوى: المصدر السابق،ص**.183

96. **العشائر الكرديه: فواد حمه خورشيد، ص**.24

97. **العشائر الكرديه: نفس المصدر،ص**.22

98. **الدكتور ابراهيم خليل احمه‌د، الدكتور خليل على موراد: ايران وتركيا،المصدر السابق،ص**.344

99. **تاساڵی** (1937) **پێی ئه‌وترا وڵاتی فارس( بلادفارس) به‌ڵام لێره‌ به‌دواوه‌ زاراوه‌ی ئێران هاته‌كایه‌وه‌ و به‌ واتای وڵاتی ئاریه‌كان (اونسبه الى‌بلادالْريين).**

100.**فوئادحه‌مه‌خورشید: زمانی كوردی و دابه‌شبوونی جوگرافی دیالێكته‌كانی، وه‌گێرانی: حه‌مه‌ كه‌ریم هه‌ورامی و عوسمانی عه‌لی قادر، به‌غداد** 1985،**ل**.72

101. **مامۆستا سه‌ردار باجه‌ڵان،كه‌لار،ئه‌یلولی** .2001

102. **خليل اسماعيل محمد: قچاو خانقين دراسه فى جغرافيه اسكان، مگبعه العانى، بغداد،** 1977، **ص** .243

103. سى. جى ادموندز: كرد وترك وعرب، ترجمة: جرجيس فتح الله،بغداد1971،ص328هةروةهامستةفا نةريمان: شؤرشى ئيبرا هيم خانى دةلؤ 1920 بةغدا1985،ل.80

104.**مسته‌فانه‌ریمان، شۆرشی ئیبراهیم خانی ده‌لۆ،سه‌رچاوه‌ی پێشوو، ل**.84

105.مكرم الطالبانى: ابراهيم خان ثائرمن كردستان، بغداد، (كذلك)، كاظم المظفر، ثورة العراق التحررية ، الجزاء الأول النجف 1972،ص194-195(كذلك)،السيدعبدالرزاق الحسني: الثورة العراقية الكبرى، الطبعة اسادسه، بغداد1992، ص239-.294

106. **محه‌مه‌د ئه‌مین زه‌كی به‌گ:خولاسه‌یه‌كی تاریخی كورد وكوردستان، سلێمانی،**.241،2000

107. **سه‌ید هاشم سه‌ید ئه‌حمه‌د: یادداشته‌كانم له‌ كفریدا،**2001،**ل**.36

108. محمد هادى الدفتر وعبدالله حسن: العراق الشمالى، لوا ديالى، مطبوعات النهار، بغداد1958، ص85.

109. **مه‌حمه‌دئه‌مین زه‌كی: خولاسه‌یه‌كی تاریخی كورد و كوردستان، ل**241**، هه‌روه‌ها، العشائر الكرديه: ترجمه فواد حمه خورشيد،ص**.89

110.**الدكتور شاكر خصباك: العراق الشمالى، دراسه لنصواصيه الگبيعيه والبشريه، بغداد** 1973، **ص**.189

111. **سى. جى.ادموندز: كردوترك وعرب، المصدر السابق، ص**.178

112. عباس العزاوي:عشائر العراق، المصدر السابق، ص.180

113. محمد جميل بندى روزبيانى: بندنيجين (مندلى في التأريخ قديما وحديثاً) گۆڤارى كۆڕى زانيارى عێراق، دەستەى كورد، بەرگى حەوتەم، القسم العربى،1980ص 305-439.

114. محمدجميل بندى روزبيانى، هەمان سەرچاوەىپێشوو، ص 426-42. (هەروەها) محەمەد ئەمین هەورامى: كاكەیى، بغدادل28-31.

115. مامۆستا باوە حەمید باوەرەشید كاكەیى و جەمال ئەكبەر ناوخاس كاكەیى، كەلار، ئەیلولی 201

116. شەرەفخانى بەدلیسى: شەرەفنامە وەرگێرانى هەژار، ل

117. دكتۆر ناجى عەباس ئەحمەد: كۆچەرى وترانس هیومانس، هەمان سەرچاوەى پێشوو، ل.376

118. مامۆستا حەسەن حاجى رەشیدى ئەڵماس، كەلار، ئابى .2001

119. جەمیل ئیبراهیم عیسا، خەڵكى نارێن، 2001./9/20

120. عباس العزاوي: عشائر العراق، المصدر السابق، ص.165

121. العشائر الكرديه، ترجمه: فواد حمه خورشيد، المصدر السابق، ص.34

122. محەمەد ئەمین زەكى:خولاسەیەكى تاریخى كورد و كوردستان، سەرچاوەى پێشوو،ل.241

123. ئى. جەى. ئار و هینرى فیڵد: هۆزەكانى كورد، بەشى دووەم، وەرگێرانى: حسین ئەحمەد جاف، بەغدا1992 ، ل22

124. عباس العزاوي: عشائر العراق، المصدر السابق، ص.166

125. ئى. جى. ئار و هینرى فیڵد: هۆزەكانى كورد، بەشى یەكەم، وەرگێرانى حسین جاف ، بەغدا1986،ل14

126. حەمیدى ئێزەدپەناه: فەرهەنگى لەك و لوڕ، لێدوان و بەراوردكردنى، مەحمود زامدار،بەغدا 1978،ل.20

127. ئى.جى.ئار و هینرى فیڵد: هۆزەكانى هەمان سەرچاوەى پێشوو، ل.14

128. شێخ محەممەد مەردۆخ كوردستانى: تاريخ كرد و كردستان و (توابع)، چاپ سوم، جلد 1 و 2 كتابفروشى غريقى – سنندج، ص .109

129. شێخ محەممەدمەردۆخ كوردستانى، تاريخ كردوكردستان، هەمان سەرچاوەى پێشوو،ل.109

130. عباس العزاوي: عشائر العراق، المصدر السابق، ص.215

131. عباس العزاوی : نفس المصدر، ص .216
132. العشائر الكردية، ترجمة: فوادحمةخورشيد، ص.98
133. **شيخ محمد مردوخ كردستانى، هەمان سەرچاوە، ل83(هەروەها) ئەمين زەكى بەگ: خولاسەيەكى تاريخى كورد و كوردستان، هەمان سەرچاوە، ل.240**
134. **شيخ محمد مردوخ ، سەرچاوەى پێشوو، ل.83**
135. **مامۆستا نەوزاد محەممەد ئيبراهيم پالأنى، كەلار، ئەيلولى .2001**
136. **عباس العزاوی : عشائر العراق، المصدر السابق، ص121-122**
137. **شيخ محمد مردوخ كردستانى، هەمان سەرچاوە، ل.115**
138. **شيخ محمد مردوخ كردستانى، هەمان سەرچاوە، ل.115**
139. **مامۆستا مستەفا سەعيد عەلى ورمزيار، خەڵكى گوندى مەحمود قەجەر، مانگى ئەيلولى 2001. (وەكو خۆى دەڵێكاتى خۆى ئەم نووسينە و زانيارييەم لە( يەكێ) لە ژمارەكانى رۆژنامەى (برايەتى)ساڵى 1993دا خوێندووەتەوە ا - ب نووسەر)**
140.ألأب د.بطرس حداد، الأب د. جاك اسحق: المخطوطات السريانية والعربية في قرانه الرهبانية في بغداد، 1988، ص.68
141-**شيخ محمد مردوخ كردستانى، هەمان سەرچاوەى پێشوو، ل.98**
142-**العشائر الكرديه، ترجمه: فواد حمه خورشيد، ص117. (هەروەها) بڕوانە محەممەد ئەمين زەكى: خولاسەيەكى تاريخى كورد و كوردستان، سەرچاوەى پێشوو، ل.239**
143. **محمد هادى الدفتر و عبدالله حسن، العراق الشمالى، بغداد1958، ص.102**
144. **شيخ محمد مردوخ كردستانى، هەمان سەرچاوە، ل.105**
145. **ئى. جەى.ئار و هينرى فيڵد، هۆزەكانى كورد، بەشى يەكەم، وەرگێرانى حسێن جاف،ل.20**
146. **شيخ محمد مردوخ كردستانى: هەمان سەرچاوەى پێشوو، ل105**
147-**شەرەفخانى بەدليسى: شەرەفنامە، وەرگێرانى: هەژار، چاپى دووەم، تاران 1981، ل592-.601**
148-**ئى. جەى. ئار و هينرى فيڵد: هەمان سەرچاوەى پێشوو، ل.20**
149-**ئى. جەى. ئار و هينرى فيڵد: هەمان سەرچاوە، ل20**
150-**عباس العزاوى: عشائر العراق، الكرديه،ص.207**
151-**عباس العزاوى: نفس المصدر، ص207-208**
152-**عباس العزاوى: نفس المصدر، ص 208-209**
153- **عباس العزاوى: نفس المصدر، ص 208**

154. د.نوری تاڵەبانی: شێخانی ئیرشادی و تاڵەبانی چەند ناودارێکی تری ئەم بنە ماڵەیە، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە (3)ی ساڵی دووەم، زستانی 2001، ل4

155. العشائر الكرديه، ترجمه: فوئاد حەمە خورشید، ص .129

156. شیخ محمد مردوخ کردستانی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل 84. هەروەها ئەمین زەکی بەگ: خولاسەیەکی تەئریخی کورد و کردستان، هەمانسەرچاوەی پێشوو، ل .241

157. د. نوری تاڵبانی: شێخانی ئیرشادی تاڵەبانی چەند ناودارێکی تری ئەم بنەماڵەیە، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە (3)ی ساڵی دووەم، زستانی 2001، ل4

158.عباس العزاوی: عشائیر العراق، المصدر السابق ، ص 228

159. عباس العزاوی: نفس المصدر، ص228 (*شێخ وەهابی کوڕی شێخ حەمیدی تاڵبانی (1883–1973)وەك ئەوەی لەیەك (دێ)دابوو واتا گوندی (غێدان)ی ناوچەی بنکورە، تا کاتی مردنیشی هەر لەوێ دەژیا، بەڵام ئەم گوندە پێشتر لەلایەن (غێدان)ئاغاوە ئاوەدانکرابووەوە، وەك ئەوەی دێتەوە یادم گۆڕەکەشی هەر لە ناوەڕاستی گوندەکەدابوو لە خشتی سوور درووستکرابوو، لە ناوەڕاستی حەفتاکانی سەدەی بیستەمدا بەتەواوی بەرە و نەمانی دارمان دەچوون. شێخ پێنج ساڵ بوو لەپاسێکی تەختە کە هی (شێخ جلال)ی کوڕی بوو تەرمەکەیان گواستەوە بۆ گوندی سەوزبلاّخ و لەوێ ئەسپاردەی خاکیانکرد، بەڵام لە سەردەمی پاشایەتیدا چەند جارێك بووبووە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق و لە دوای خۆشی وەکو پێبزانم: (13)سیانزە کوڕی لەدوو بەجێما لەوانە: (حەمە نەجیب، محەممەد، فەریق، فایەق، عادل، حسێن، فازیل، سەفاو، کەمال، فەزلە دین، عاسی، فەرەیدونی شێخ جلال) ئەمەی دواییان لە کۆتاییەکانی شۆڕشی ئەیلول ولە شاخی کەریم پاشای بناری بەمۆ شەهید بوو لە گوندی ئەلیمیر ی سەر سنووری نێوان عێراق و ئێران نێژرا.

160. د. نوری تاڵەبانی: هەمان سەرچاوەی پێشوو،ل 7

161. الدكتور ابراهيم خليل احمد، الدكتور خليل على مراد: ايران وتركيا دراسة فى التاريخ الحديث والمعاصر: المصل 1992، ص 344

162. شیخ محمد مردوخ کردستانی: هەمان سەرچاوە،ل 94

163. الدكتور ابراهيم خليل احمد، الدكتور خليل على مراد: المصدر السابق، ص345

164. جمال بابان: اصول اسماء المدن والمواقع العراقيه، بغداد 1989، ص144

165. محەمەد ئەمین زەکی: خولاسەیەکی تەئریخی..، هەمان سەرچاوە، ل 240 (هەروەها) شیخ محممد کردستان، هەمان سەرچاوە، ل 94

166. پاڵەوانی زەند وەرگێرانی: حەسەن فەهمی جاف، چاپی دووەم، بەغداد 1985، ل 11

167. **شيخ محمد مردوخ كردستانی: هەمان سەرچاوە، ل**94

168. **سی.جی.ادموندز: كرد وترك وعرب ، المصدرالسابق، ص** 253

169. **مامۆستا ئەمیر سایر: خەڵكی ناوچەی زەنگاباد، ئەیلوولی** 2001

170. **جمال بابان: اصول اسماء المدن والمواقع العراقیه، المصدر السابق،ص**306

171. عبدالفتاح علی یحی: سالنامات الموصل العثمانیة مصدراَ لدراسة تأریخ السلیمانیة،المصدر السابق،ص53

172. مصطفی مجید: قصة الارض فی كردستان، مجلة (الكادر)، العدد(9) ،1971،ص 57- 96.

173. **بۆ درێژەی ئەم باسە و دوورخستنەوەی هەمەوەند و بارودۆخیان لە باكووری ئەفریقا بڕواننە ئەم لێكۆڵینەوەیەمان (عەبدولڕەزاق بەدرخان پاشا و سەربردەی كوردەكانی باكوور و ئەفەریقا)، هەفتەنامەی ڕێگای كوردستان، ژمارە** (235)، (236) 22/1/15،1997 1997/1/، **ڕۆژانی چوارشەممە و چوارشەممە، ا –ب نوسەر)**

174. عبدالفتاح علی یحی: سالنامات الموصل العثمانیة،المصدر السابق، ص53

175. خالد محسن اسماعل: قلم وزیر،اثار ابراهیم صالح شكر: تاریخ ما اهمله التاریخ من حوادث المساله العربیة فی الحجاز والسوریة والعراق، بغداد 1970 ص 72

176. **خالد محسن اسماعل: قلم وزیر، المصدر السابق،ص** 72

177. **محمد امین زكی، تاریخ السلیمانیه وانحائها، نقله الی العربیه الملا جمیل الملا احمد الروزبیانی،بغداد** 1951**،ص** 188

178. **شیخ محمد مردوخ كردستانی، هەمان سەرچاوەی پێشوو،ل** 116

179. **عەلی سەیدۆ گۆرانی: لە (عەممان)ەوە بۆ (ئامێدی) گەشتێك بە كوردستانی باشووردا، وەرگێرانی: تالیب بەرزنجی، سلێمانی** 2000، **ل**53. **(هەروەها) امین زكی: تاریخ السلیمانیه وانحائها، نفس المصدر، ص** 188، **(هەروەها) عباس العزاوی: نفس المصدر، ص** 78

180. **عەلی سەیدۆ گۆرانی: لە (عەممان)ەوە بۆ (ئامێدی)،هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل** 53

181. **شیخ محمد مردوخ كردستانی: هەمان سەرچاوەی پێشوو،ل** 116

182. **ئی. جەی. ئار و هینری فیڵد: هۆزەكانی كورد،بەشی یەكەم، وەرگێڕانی: حسێن جاف، سەرچاوەی پێشوو،ل** 19

183. **مارتین ڤان برۆنەسن: ئاغا و شێخ ودوڵەت، وەرگێڕانی لە ئەڵمانیەوە: كوردۆ، بەرگی یەكەم، چاپی سێیەم، سلێمانی** 1999**، ل** 125

184. محمد جميل الملا احمد الروزبياني: المعروفوون من الروزبيانيه (الروزبهانيه) من الكتب التاريخيه، القسم العربى، گۆڤاری كۆری زانياری عێراق (دەستەی كورد)، بەرگە 11 بەغداد 1984، ص268

185. محمد جميل الملااحمد الروزبياني: المصدر السابق،ص 272

186. محمد جميل الملااحمد الروز بياني: نفس المصدر،ص 308

187.د.ناجی عباس ئەحمەد: كۆچەری و ترانس هيومانس، سەرچاوەی پێشوو،ل 376

188. محمد جميل الملا احمد الروز بياني: المصدر السابق، ص294

189. محمد جميل الملا احمد الروز بياني: نفس المصدر، ص294

190. بۆ درێژەی ئەم رايەم بڕوانە: (محمدجميل الملا احمد الروزبياني، هەر دوو بەرگی( يازدەيەم) و (دوازدەيەم) لە گۆڤاری كۆڕی زانياری عێراق،دەستەی كورد،1984، ل267 – 322،(1985)، ل331 – 388

191. يونس الشيخ ابراهيم السامرائى: الشيخ عبدالقادر گيلانى (قدس الله سره)، حياته – اپارە، بغداد 1982، ص 7،ص36

192. عباس العزاوی، عشائر العراق، المصدر السابق، ص 227

193. بۆ زياتر شارەزابوون لەبارەی تەكيە و ناوەندە زانستيەكانی كوردستانەوە بڕوانە: (الدكتور عماد عبدالسلام رۆوف: مراكز ڤقافيه مغموره فى كردستان، بغداد1997(كۆلك)، يونس الشيخ ابراهيم السامرائى: الشيخ عبدالقادر الگيلانى، المصدر السابق، ص 58-.71

194. غەفوری ميرزا كەريم، شاری بەرزنجەی پيرۆز و بنەماڵەی ناودارانی لە مێژوودا، گۆڤاری (رۆشنبيری نوێ)، ژمارە(102)، تەموزی 1984،ل.94

195. غەفوری ميرزا كەريم: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل94

196. موحسن تاهير: بەرزنجە و بەرزنجييەكان، بەيان، ژمارە (188)، ساڵی 2001، ل.16

197. غەفوری ميرزا كەريم: هەمان سەرچاوەی پێشوو،ل.94

198. شيخ محمد مردوخ كردستان، تأريخ كرد و كردستان، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل.81

199. شيخ محمد مردوخ كردستانى: هەمان سەرچاوە، ل.81

200. محمد امين زەكی: تأريخ السليمانيه وانحائها،المصدر، ص224، (كۆلك)، سی. جی.ادموندس: كردو ترك وعرب، نفس المصدر،ص71.

## قەڵای (چاریە) و رۆڵی مێژوویی، ئێڵی شکاک لە بەرەنگاریدا.

نووسینی: نادری کەریمیان

لە فارسیەوە: کەمال نوری مەعروف

قەڵای مێژوویی(چهریق) لە ژیانی مێژووییدا ئەگەر بەراوردی بکەین بە قەڵاکانی تری مێژوویی ئێران پڕیەتی لە رووداوی مێژوویی جا ئەو رووداوانە گەورە بن یان نشوستی بن بۆ قەڵاکە.بۆیە دەتوانین بڵێین چهریق قەڵایەکی مێژوویی پڕ رووداوە بەتایبەتی لە مێژووی هاوچەرخی ئێراندا.

رووداوە سیاسیەکانی مێژوویی وورمێ و سەڵماس لە رۆژگاری قاجار و پەهلەویدا بەشێکی زۆری پەیوەستە بەو قەڵایەوە چونکە چالاکیە سیاسی و کۆمەڵایەتی و دەزگاکانی شۆڕش و دژایەتی عێلەکان و گرنگیدان بە سیستەمی قەڵا لەو رۆژگارەدا پێویستبووە. لە مێژووی سەردەمە لاوازەکانیشدا قەڵای (چهریق) لەناو رووداوەکاندا شوێنی تایبەتی دیاری خۆی هەبووە.



لەم نووسینەدا تەنیا رای کەسانی ناسراوی گوندەکانی (چهریق) وەردەگرین کە بە کەسانی کاریگەر و دیاری عێلی شکاك دائەنرێن بۆ ئەوەی بگەینە ئەنجامێك کە قەلای چهریق دابنێین بە ناونیشانی مەرکەزی حکومەتی عێلەکان لە رووی سیاسی و نیزامییەوە کە خۆیان هەڵیانبژاردووە. جگە لەوەش قەلای چهریق لە رووداوە نشوستیەکانیش بەشی پێبڕاوە بەتایبەتی کە لە قسەکانی (موعتەمیدولوەزارە) (رەحمەتوڵلاخان)دا دەرئەکەوێت کە خۆی چاودێری بارودۆخی سیاسی ناوچەکەی کردووە لە ساڵەکانی 1298 تاوەکو 1300ی هەتاوی کە پەیوەستن بە قەلای ناوبراو بۆ ئەوەش لە کۆتایی پێشینەی نەخشەی مێژوویی ساڵی 1297ی کۆچی قەمەری لەبارەی قەلاکەوە رونکردنەوەیەك دەدەم کە کاریگەری تێدا دەبینم.

گوندەکانی چهریق:

چهریق ناوی دوو گوندی دراوسێی کوردنشینی یەکترین کە بە دوو گوندی چهریقی خواروو و چهریقی سەروو دابەشبوون. شتە دیارەکانی ئەو دوو گوندە بەم شێوەیەن:

چهریقی خواروو: گوندێکە لە گوندەکانی (چهریق) و بەشێکە لە مەرکەزی شارۆچکەی سەڵماس لە پارێزگای ئازەربایجانی خۆرئاوا کە دەکەوێتە سەر هێڵی درێژی جوگرافی ($37-44^o$) وهێڵی پانی جوگرافی ($5-38^o$)ە و بەرزی لەسەر رووی دەریا (1580) مەترە و ئاو و هەوای سارد و وشکە. گوندەکە دەکەوێتە دووری 22 کیلۆمەتری لە باشووری خۆرئاوای سەڵماس.

رووباری (زولا) بە باکووری گوندی (ئاباد)دا دەڕوا و دەربەندی (سوسەن) لە خۆرئاوای گوندی (ئاباد)ەوە دەبڕێ. کۆمەڵگای گوندەکەش 33 خێزانە و زمانی مرۆڤی کوردی ناوچەکەش کرمانجییە و مەزەبیان سونییە کۆمەڵگاکەش لە پەیڕەوانی ئیمامی شافیعین. کاری دانیشتوانەکەی بە زۆری کشتوکاڵ و باخداری و ئاژەڵ بەخێوکردنە. کشتوکاڵیان بە رێگای ئاوی و

دێمی بە ئەنجام دەگەیەن و ئاوی خواردنەوەشیان بە ڕێگای گونج لە سەرچاوەی ڕووبارەکەوە هەڵگرتووە.
بەرووبوومی گوندەکە گەنم و جۆ و نیسك و نۆك و وێنجە و سێو و گوڵەبەڕۆژە و کولەکەیە. ڕووەکی بۆنخۆش و گیای زمانەگاش دەهێنرێتە بەرهەم بۆ دروستکردنی دەرمان. ناوچەکەش دەوڵەمەندە بە ئاژەڵی کێوی کە لەسەر گەلاو پووشی ناوچەکە دەژین، هەروەها تەیرو تواڵەش هەن وەکو پۆڕ و کەو و گەلێکیتر.
چهریقی سەروو: ئەو گوندە لە گوندەکانی چهریقە و دەکەوێتە سەر هێڵی درێژی جوگرافی (36− 44º) پلە وهێڵی پانی وجوگرافی (05− 38º) پلە و بەرزیەکەشی لە ڕووی دەریاوە 1620 مەترە و ئاو و هەواکەی وشك و ساردە. گوندەکە دەکەوێتە دووری 23 کیلۆمەتری باشووری خۆرئاوای سەڵماس. ڕووباری (زولا) لە کەناری (ئابادی)یەوە دەڕوا و دەربەندی (سوسەن)دەبڕیٚ کە دەکەوێتە خۆرهەڵاتی (ئابادی) لە دووری کیلۆمەترێك. کۆمەڵگای گوندەکە پێکهاتووە لە 83 خێزان، زەمانەکەیان کوردی کرمانجییەو مەزەبیشیان شافیعین. کاری مرۆڤی گوندەکە کشتوکاڵ و باخداری و بەخێوکردنی ئاژەڵ و پەروەردەکردنی مێش هەنگوین و کرێکارییە. کاری کشتووکاڵی لە گوندەکەدا بە هەمان شێوەی (چهریقیخووارو)ە، وەکو باخداری و پێگەیاندنی ڕووەکی بۆنخۆش و گیای داودەرمان، وەکو زەمانەگا، گوندەکەش لە ڕووی ئاژەڵی کێوی و تەیر و تواڵەوە هاوشێوەی چهریقیخوارووە، لە ناو گوندەکەشدا مەزاری پیاوچاکێك هەیە بە ناوی خەلیفە کەوسەر.
(ڕەزمئارا) لە فەرهەنگی جوگرافی ئێران کە لە سنوری 1320ی هەتاوی دایناوە دەربارەی چهریق دەنووسیٚ: گوندێکە لە گوندەکانی چهریقی بەشی سەڵماسی شارۆچکەی (خۆی)، دەکەوێتە دووری (19500) گەز لە باشووری (باختەر)ی سەڵماس. تاوەکو سەڵماس ڕێگای هاتووچۆی دانیشتوانەکە بە گالێسکە بووە، ئەوەش بە هۆی ئەوەبووە ناوچەی قەڵاکە لەو

ڕۆژگارەدا ڕێگاکانی قیرتاونەبووە. دوری ڕێگاکەش لە سەڵماسەوە بۆ قەلاًکە هۆکاری گواستنەوەکەی دیاریکردووە، کە درێژییەکەی کاتژمێرێکە و ڕێگاکەش بە ڕێگای چهریق ناسراوە.
کاری دانشتوانەکەش کشتوکاڵ و گۆزە و گلێنە بووە و سوودیان لە ڕووباری (زولا)ش بینیوە ڕۆژانە بۆ کاری ئاودان وشتیتر.

قەلاًی چهریق مەرکەزی حکومەتی عێلی شکاک:

قەلاًی چهریق بە درێژایی مێژوو هەردەم عێلی شکاك بەکاریانهێناوە و شوێنی ژیانیان و مەرکەزی عێلەکە بووە. عێلی شکاك لە سنووری ئازەربایجان و تورکیا ژیان بەسەر دەبەن، واتە لە دەشتەکانی (چهریق) و (سۆمای) و (برادۆست) و (سەنجیداغ)دا ژیاون ودەژین و بەشێکی تریشیان لە ناوچەی (ورمێ) دانیشتوون. کەسانی ئەو عێلە لە ئازایەتی و بە توانایدا ئەگەر بەراووردیان بکەین بە عێلەکانی تری کوردی ناوچەکە بە ناوبانگترن.

ئەم عێلە بە دوو بەش دابەشە: (عەبدۆیی) و (کاردار) کە پێشتر سەرۆکی تایەفەکە لە عەبدۆیی هەڵبژێردراوە، کەسانی ناودار بەدرێژایی تەمەنی حکومەتی قاجار لەناو ئەم عێلەدا دەرکەوتووە کە نەخشەی سەرەکییان لەو گۆڕانکارییە سیاسییە کۆمەلاًیەتیانەدا هەبووە. لەوەش ڕازیبوون کە قەلاًی ناوبراو مەرکەزی فەرماندە و هاوکاری بێت بۆ ئەوکەسانەی کاریگەری تایبەتیان هەبووە. لەم باسەدا ئاماژە بەچەند کەسێك لەوانە ئەدەین بۆ ئەوەی بە ئێوەیان بناسێنین:

1.ئیسماعیل خانی عەبدۆیی شکاك:

ئیسماعیل خانی یەکەم لە تایەفەی عەبدۆییە و سەرۆکی عەشیرەتی شکاکە. لە سەرەتای فەرمانڕەوایەتی قاجاریەکاندا ژیاوە و پیاوێکی بە توانا و خاوەن دەسەلاًت بووە.

2.ئەمیر سادق خانی شکاك:

لە سەۆك عەشیرەتەكانی شكاكە و لە كۆندا لە لایەنگرانی قاجاریەكان بووە بەلاّم كاتێك (فەتحعەلیشا) بە دەسەلاّت گەیشت سۆزێكی لێنەدی بۆیە دەستیدایە یاخیبوون و توانی نیوەی ئازەربایجان بخاتە ژێر دەسەلاّتیەوە بەلاّم لە ساڵی 1211ی كۆچی قەمەری بە كەوتنی كۆتایی هات.

3. عەلی خانی شكاك:

عەلی خان كوڕی ئیسماعیل خانی یەكەمە و یەكێكە لە سەرۆكەكانی ئەم عێلە و ماوەیەك دەسەلاّتی بەسەر(ورمێ) و (سەڵماس) و بەشێك لە ئازەربایجاندا ڕۆشتووە و داوای سەربەخۆی كردووە بەلاّم دەوامی نەبووە و كۆتایی هاتووە.

4.یەحیا خانی چهریقی:

یەحیاخان كوڕی مستەفاخانی هەكارییە و لە سەرۆكەكانی كوردی شكاك بووە لە ڕۆژگاری (عەباس میرزا) كە (نایبولسەڵتەنە) بووە فەرمانڕەوایەتی ئازەربایجانی كردووە. سەرەتا یەحیاخان خوشكی خۆی ڕەحیمەخانمی مارە بڕیوە لە كوڕی (ئەرشەد) كەسی محەممەد میرزا (محەممەد پاشای قاجار). ڕەحیمەخانم چەند لای ماوەتەوە منداڵی لێینەبووە و بەجوانی سەری ناوەتەوە. (یەحیاخان) دووبارە خوشكی خۆی (خەدیجە خانم) مارەی بڕیوە لە (محەممەد میرزا) كە (عەباس میرزا) بۆی داوایكردووە كەئافرەتێكە بۆی باشە. بەو شێوەیە دووخوشكی (یەحیاخان) بوونە ژنی (محەممەد پاشای قاجار).

(یەحیاخان) چ لە ڕۆژگاری عەباس میرزای نایبوسەڵتەنە و چ لە ڕۆژگاری پادشایەتی (محەممەد شا)دا زیاتر لێیان نزیكبۆتەوە و ماوەیەك كە (محەممەدمیرزا) بووەتە (پادشا)، (یەحیاخان) دەسەلاّتی فەرمانڕەوایەتی (ورمێ) و (شاپوور) و (سەڵماس) و (ئێڵخانی) كوردەكانی ئازەربایجانی خۆرئاوای لەژێر دەستابووە و كەسێكی بە توانا و سیاسەتمەدار و خاوەن بیری سرووشتی جوان بووە. لە فەرمانڕەواكەیدا بۆ ئاوەدانی كۆششی كردووە

بۆ ئەوەی زیاتر خزمەت بکات. ئەوەبوو ئەو ئاوەی لە رووباری (ئاجوو) هەڵگیرابوو بۆ خواردنەوە بۆ گەڕەکەکانی شاری (ورمێ) بە تەواوی بەشی نەدەکرد بۆیە هەستا بە راکێشانی کەناڵێکیتر کە بە دراوی زۆر دروستیکرد، ئەو چاکەیەشی بە یادگار بۆ مایەوە. ناوی (یەحیا خان) دوای مەرگی (محەممەد پاشا) لە ساڵی1264ی کۆچی قەمەری لە ناو فەرمانڕەوایانی ئازەربایجانی خۆرئاوادا کوژایەوە و لە جێگای ئەو(نەجەفقولیخانی ئەفشار قاسملو) بووە بە فەرمانڕەوای (ورمێ).

لە نەخشەی قەڵای (چهریق)دا کە لەلایەن عەبدولعەلی بەگی سەرهەنگ لە ساڵی 1297ی کۆچی قەمەری ئامادەکراوە تیایدا باخ و کۆشکەکانی (یەحیاخان)یش نیشانکراون. ئامادەکردنی نەخشەی قەڵاکە لە ساڵی 1297 قەمەری هاوکاتە بە رۆژگاری ژیانی یەحیاخانی چهریقی.

5. جەعفەر ئاغای شکاك:

جەعفەر ئاغا کوڕی محەممەد ئاغای شکاکی کوڕی عەلیخانی شکاکە. یەکێکە لە سەرۆکە بەتواناکانی ئەم عەشیرەتە کە ماوەیەك لەگەڵ دەوڵەتی ئێراندا لەململاندا بوو. کاتێك (نیزاموسەڵتەنە) بووە حاکمی تەورێز ئامانی بە (جەعفەرئاغا) و(محەممەد ئاغا)ی باوکی دا ئەوە بووە هۆی ئەوەی تاوەکو ئەندازەیەك رێز لە دەوڵەت بگرن. جەعفەر ئاغاش بووە رەهن و لە (تەورێز) وەکو میوان دەژیا. لەسەرەتای ساڵی 1323ی کۆچی قەمەری (نیزامولسەڵتەنە) لە تاران لەسەر داوای (محەممەد علی میرزا)ی (نایبولسەڵتەنە) دەستوری دا کە جەعفەرئاغا دەبێت بکوژرێت. ئەو لە شەودا لە کاتێکدا کە میوانی (نیزامولسەڵتەنە)بوو داوای لە فەرمانبەرانی کرد تاوەکو بێ ئاگایە تیرۆری بکەن، بەو شێوەیە جەعفەرئاغای بە نامەردانە کوشت. (کوشتنی جەعفەری ئاغا لە رۆژگاری موزەفەرەدین پادشابوو)ئەم هەواڵە بۆ لای دەوڵەت بووە بەخۆشی گەیشت لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئەوەشدا ئامانی دا بوو بەڵام ئەو نامەردانە پەیمانی شکاند. ئەوەش ئەنجامێکی شوومی هێنایە پێشێ و باوکی

دەستی دایە سەرپێچیکردن و شۆڕشی هەڵگیرسان. (موخبیرولسەڵتەنە) لە گواستنەوەی هەواڵی ئەم داستانەدا دەنووسیٚ: پاسەوانەکانی جەعفەر ئاغا کە لەژوورێکی دراوسێی ژوورەکەی (جەعفەرئاغا) دا بوون توانیان بەهۆی هەڵکەندنی چاڵێك لە دیواری ژوورەکەی خۆیان رزگاربکەن و(17) کەسیش بکوژن لە لایەنگرانی حکومەت و لە شەودا هەڵبێن.

6. ئیسماعیل ئاغای سمکۆ:

ئیسماعیل ئاغا کوڕی (محەممەد ئاغا)ی نەوەی عەلیخانی شکاکە و نازناوی سەرداری سەرکەوتووە و سەرۆك عەشیرەتێکی مەرد و ئازابوو و زوو هەڵدەچوو. کوشتنی ناجوانمەردانەی جەعفەرئاغای برای رێگای یاخیبوون و شۆڕشی بۆ خۆشکرد دژی حکومەتی مەرکەزی لە کۆتایی رۆژگاری قاجایەکاندا و سەرەتای رۆژگاری پەهلەوی. مەرکەزی حکومەتی فەرماندەیی ئیسماعیل ئاغای لە تەواوی ماوەی هەستانی بە شۆڕش لە قەڵای (چهریق) بوو کە لە رۆژگاری ئەودا هەموو ئەو رەونەق و فراوانی و ئاوادانیەی بە خۆوەدی. هەستانی سمکۆ بە شۆڕش لە ساڵی1324ی کۆچی (قەمەری) 1284ی کۆچی قەمەری درێژەی کێشا تاوەکو ساڵی 1309ی کۆچی هەتاوی (1349 یکۆچی قەمەری) کە بە فێڵ و درۆ لە دەوڵەتی (رزە شا)دا وەکو براکەی کوژرا.

ئەو راپۆرتانەی دوایی لەسەر مێژووی قەڵای چهریق لە بنەمادا بوونەتە پاڵپشت بۆ زانینی مێژووەکەی بەتایبەتی لە رۆژگاری (ئیسماعیل ئاغا)دا کە دەتوانین قسەی لەسەر بکەین، بۆ ئەوەی زیاتر پێی ئاشنابین هەر بەوەش لەو قەڵایە تێدەگەین کە لە رۆژگاری قاجار و پەهلەوی یەکەمدا ئامادەیی تەواوی بووە بۆ لە خۆگرتنی رووداوەکانی مێژوو.

قەڵای چهریق لە زنجیرەی بەسەرهاتە مێژووییەکاندا:

چهریق شوێنێکی دیار و دەرکەوتووی هەبووە لە ڕۆژگاری ئەفشاریەکان و زەندیەکاندا ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو قەڵایەی کە لەو سەردەمانەدا دروستکراوە بووەتە هۆی سەرچاوەی هاتنی حاکمەکان و گەورەپیاوانی کاربەدەستانی. نموونەی ئەو گرنگیدانەش (ئیعتمادلسەڵتەنە) لە (مرات البلدان)دا نووسیوە: (چهریق یەکێکە لە قەڵاکانی (خۆی)و ماوەیەك (سەید عەلی محەممەد) باوکی (موقتەدا)ی تایفە بابیەکان لەو قەڵایەدا بەند کراوە). لە (روچە الصفای ناصری)دا لەسەر هەمان بابەت وا دەدوێ: (بڕیار وا بوو سەید عەلی لە قەڵای چهریقەوە بەرن بۆ شاری تەورێز بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکەن و بەسەرهاتی دەربکەوێت). سەید عەلی محەممەد شیرازی کە نازناوی (باب) بوو و جێگرەکانی لە فارس بوون لەسەر ئەوە بوو، کە (نیزامولدەولە) (حسێن خان)دایاننابوو بیکەنە پادشا و هێنانیشی لەلایەن (مەنوچەهرخان) بۆ ئەسفەهان. دوای تەواوبوونی لێکۆڵینەوەکەی بردیانەوە بۆ قەڵای (چهریق) و لەوێشەوە بۆ (سەڵماس) و (خۆی) و (مەوقومئەفتاد).

هەروەها لە شوێنێکی تر لە کتێبەکەیدا (صاحب روچە الصفا) دەڵێ: (لای باوەڕپێکراوانی دەوڵەت بەگشتی ئەوە روونبوو کە خەڵکی بە دەنگی بەرز قسەیان لە بەندکردنی سەید عەلی لە قەڵای چهریق دەکرد) بە قسەی" عەلائولدین تەکش جیهانگیری کە لە نامەکەیدا هاتووە بە ناونیشانی (لە گۆشەیەکی مێژووی ئێراندا) دەڵێ: لە ڕۆژگاری حکومەتی (یەحیاخان) کە سەیدعەلی محەممەد (باب) لە قەڵای (ماکۆ) بەندکراوە لەسەر داوای خۆی براوەتەوە بۆ (ورمێ) دوای سێ ڕۆژ لەمانەوەی لەوێ لەگەڵ کۆمەڵێك سواری ئەفشار و نێردراوێکدا گەیەنراوەتە قەڵای چهریق. سەید عەلی محەممەد (باب) ماوەیەك لەوێ بەندکراوە و ماوەتەوە هەتاکو سەرەتای فەرمانڕەوایەتی (ناسرەدین شا) لە تەورێز کوژراوە.

لە گەرمەی جەنگی روس لەگەڵ موجاهیدەکان و مەشروتەکاندا ساڵی 1290ی هەتاوی (ئەمیر حیشمەت نیساری) بۆ بەردەوامبوونی

بەرەنگاربوونەوەکە لەگەڵ روسەکاندا (میرزا ئاقا پلوری) و (حاجی ئیسماعیل ئەمیر خەیزی) رەوانەی چهریق کردن تاوەکو لەوێوە بڕۆن بۆ ورمێ.

لەرووداوەکانی جەنگی روس وعوسمانیدا ساڵی 1296ی هەتاوی مارشیمۆن (سەرۆکی مەزهەبی ئاشوریەکان) و مەسیحیەکانی ورمێ بەپشتیوانی سوپای روس و بۆ دانانی نەخشەی سەرکەوتن سوپایەکی لە ئازەربایجان دروستکرد بۆ ئەوەی نەهێڵێ عوسمانییەکان پێشڕەوی بکەن و بەرهەڵستیان بکات. بەرامبەر بەوە عوسمانییەکان (راستییەکەی ئیتیحادییەکان) بەبیری تۆڵەسەندنەوە لەگەڵ کوردەکاندا بەنهێنی یەکیانگرت بۆ ئەوەی (مارشیمۆن) مەبە ستەکەی جێبەجێ بکات بە مەئمورییەت رۆیشت بۆ چهریق بۆ ئەوەی بە ئیسماعیل ئاغای شکاك بگات بۆ بەستنی پەیمانی سەربەخۆیی نێوانیان تاوەکو بەو هۆیەوە پارێزگاری لە ناوچەکە بکا و هاوکاری لەوێش وەربگرێت. شوێنی بەیکگەیشتنی (مارشیمۆن) بە (سمیتقۆ) (کۆنەشار) بوو لە رێکەوتی رۆژی شەشەمی 25ی ئەسفەندی (3ی جوومادی دووەم) واتە ساڵی (1296ی هەتاوی) لە (کۆنەشار) یەکتریان دی، دوای دانیشتنەکە بەدەستی (سمیتقۆ) کوژرا. ئەوەش بووە هۆکاری دروستبوونی رووداو و شەڕ و هێرش و کوشتن بۆ سەر عیساییەکان لەلایەن موسوڵمانەکانەوە.

ئەرمەنییەکان رۆژی دوایی (کۆنەشار)یان گرت، لە دانیشتوانەکەی ئەوەی نەیتوانی رابکات کوشتیان. (ئاغا پەتروس) کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی عیسایی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە سەرباز و تۆپچی روس گەیشتنە ورمێ و لەگەڵ بەکرێگیراوانی عیساییدا کۆبوونەوە بە تفاقی جەنگی زۆرەوە هێرشیان بردەسەر قەلاّی چهریق و کوردەکانیش بەرهەڵستیان بۆ نەکرا لەبەرئەوەی ژمارەیان کەمبوو، هەروەها کەرەسەی جەنگیشیان تەواو نەبوو، بۆیە نەیانتوانی هێرشی عیساییەکان بووەستێنن، یان بەشێوەیەکی تر بڵێین بەرگری لەخۆیان بکەن، (ئیسماعیل ئاغا)دوای شەو و رۆژێك شەڕ و بەرگری لە

چهریق رایکرد، ئاسوری و ئەرمەنییەکانیش  هەر کەسێکیان لە راکردووەکان بەدەست بگەیشتایە دەیانکوشت و ژنیشیان بەدیل دەگرت ودەیانبرد، لەوانەی کەوتنە دەستیان دایکی (سمیتقۆ)و کچی جەعفەر ئاغای برای دەستگیرکران، لەبەر قورسی هێرشەکە بۆ سەر قەلاّی چهریق و قەلاّی (ئاش) توانیان بەسەر کوردەکاندا سەربکەون و لەوێشەوە عیسایییەکان بۆ ورمێ رۆیشتن بە قسەی (موعتەمیدولوەزارە) جارێکیتر بۆ قەلاّی چهریق گەڕاونەتەوە و دەستیان کردووەتەوە بەکوشتاری خەڵکی. بۆ ئەو کوشتارە، کیسرەوی دەنووسێ: (رۆژی 20 جەمادیلئاخیرە (12 فەروەردین) بێئەوەی شتێك هەبێت دەنگی تفەنگ لە شار بەرزبووەوە بەو جۆرە ترس کەوتەوە و کەسیش نەبوو پرسیار بکات لەربارەی ئەو شتەوە. لەم شەڕەدا (فەیروزی ئاغا پەتروس)دەسەلاّتی بەسەرشاری (چەهریق)دا بلاّو بووەوە و ئاسورییەکانیش بەناوی جەژن وشادییەوە کەوتنە ناو خەڵکەکەو بەگولە لەسەرخۆ 40 کەسیان لە مرۆڤی بێتاوان کوشت.

**موکەڕەمولمولک دەیەوێت بەفێڵ سمکۆ لەچهریق بکوژێت:**

هەتاکو ساڵی 1227 کۆچی سەرکردەکەی سوپا یان والی تازە بۆ ئازەربایجان بۆ کاری حکومەت نەنێردرا هەر ئەوەش هاندەرێکبوو بۆ (موکەڕەمولمولك) کە جێگری والی بوو لە ئازەربایجان تێدەکۆشا سمکۆ لەناوبەرێت، بەلاّم لەبەرئەوەی هێزی تەواوی نەبوو، نەیتوانی بەئاشکرا بەرەنگاری بووەستێتەوە بۆ ئەنجامدانی ئەوەش رێگایەکی تری گرتەبەر، لەو رووەوە کیسرەوی داستانی ئەو حیلەیەی موکەڕەمولمولك بەم شێوەیە باسدەکات: (موکەڕەمولمولك)ی نایبی ویلایەتەکە لەبەر ئەوەی سوپایەکی نەبوو بتوانێت لەگەڵ کوردەکاندا شەڕبکات، یان لەپاڵەوانێتییەك بنوێنێ  بۆیە چارەی تری نەبوو جگە لەوەی بیخاتە سەر خەیاڵی ناردنی بۆمبێك بۆ

(ئیسماعیل ئاغا) بۆ ئەوەی بیکوژێت. هەر وەکو ئەوەی ساڵی 1287 لەکاتی جەنگی تەورێز (حەیدەر عەمو ئاغلی)کە لە ئازادیخوازی ئەو شارە بوو لە خەیاڵیا بوو (شوجاع نیزام) لەناوبەرێت. ئەوە بوو لە کیسەکەیدا بەناوی سپاردە پۆستەیەکی بۆ دەرهێنا کە حەواڵەیەك بوو بەناوی ئەوەی بۆیهاتووە، دایە دەستی وکوشتی. (موکەڕەمولمولك) بەهەمان شێوە دەیویست بەوشێوەیە سمکۆ تاقیبکاتەوە و شتێکی لەو بابەتەوە لە شوێنێکدا بۆ دابنێت. بۆ ئەو کارە ئەرمەنییەکان هاوکاری بوون و هاتن بۆمبێکیان بۆ دروستکرد. (موکەڕەمولمولك) بەناوی قووتوویەك شیرینی بۆ ئیسماغیل ئاغای بە نێردراوێکدا بۆ چهریقی نارد بەناوی دایکی خێزانەکەی کە لەو کاتەدا لەوێ بوو نزیك شوێنی دانیشتنی ئاغا بوو، بەڵام سمکۆ هۆشیارتربوو لە (شوجاع نیزام) کە توانی بە هەموو لایەکی قووتوەکەدا بڕوانێت. لەزمانی سمکۆوە دەگێڕنەوە کە وتوویە: رۆیشتن قووتووە شیرینیەکەیان هێنا، کوڕەکەم گوتی ئەوە شیرینی دایە گەورەیە بۆی ناردووین. من لەمە بەگومان بووم، لەوکاتەدا لە چیمەنێکدا دانیشبووم، گوتم ئێوە خۆتان بشارنەوە، کاتێك سەیرمکرد رۆشناییەکم لەناویا بەدیکرد بۆیە فڕێمداو لە خۆم دور خستەوە، لەو کاتەدا کوڕەکەشم خۆی دا بەزەویدا و قاچی درێژ کرد و بۆمبەکەش چەند هەنگاوێك لە ئێمە دوورکەوتەوە و تەقییەوە، بەئیرادەی خوا رزگارم بوو.

بەو جۆرە سمکۆ لەمەرگ رزگاری بوو، بەڵام برای ئەو بەناوی عەلی ئاغا و چەند نەفەرێکی تر ی لە کوردەکان کوشت ئەوەش بووە بەهانەیەك بەدەست سمکۆوە، ئەم ڕووداوە لە ئۆردیبەهەشتی 1298ی هەتاوی (مانگی شەعبان) 1227ی قەمەری بووە و بەو پێیە ڕووداوەکە وایکرد بەشێك لە مەلاکان و خەڵکی (خۆی) ڕووداوی دروستکردنی بۆمبەکە و ناردنی بۆ چهریق بەدەنە پاڵ شازادە (جیهانگیر میرزا) و (میر هیدایەتی کوڕی میر ئەسەدوڵلاٚ). قسەکانیش ئەوە دەگەیەنێت سمکۆ هەروەکو لە (جیهانگیر میرزا) رزگاری بوو هەر بەو شێوەیەش لەگەڵ (هیدایەت) کوڕی (میر ئەسەدوڵلاٚ) و سوارەکانی لە

هەمان ڕۆژدا کەوتە شەڕەوە و کەسانێکی جەنگاوەر و پێشمەرگەی لێکوژرا. ئەوەش وایکرد لە دڵیا شت هەڵبگرێت ودڵی پڕ قین بێت لەبەر ئەوەی لەنزیکەوە زیانی لێکەوت. بەو پێیەی بەناوی ئەو دووکەسە ئاشنابوو، هەر وەکو لەسەر زمانی دەیگێڕنەوە بە گلەیی و خراپەکاری ناوی هێناون... هەروەها وتوویە: دڵتەنگم لە کەسی سەرکردەی سوپا کە بۆ (گەیلان) ڕۆیشتووە و ناخۆشی لە نێوانەکەدا بۆمن هێناوەتە روو. سمکۆ داوای لە (موکەڕەمولدەولە)ی حاکمی (خۆی) ڕێگابدات لە (پیرامون) کەسانێك بنێرێت بۆ (خانە) کە (شازادە) بۆی ڕۆیشتبوو، لەوێ لە (خانە) ئەو بۆمبانەیان دی کەشازادە (شەرەفخانە) هێنابووی بۆیە هەمان بەڵگەی دەستکەوت، سمکۆ داوایکرد کە (میر هیدایەت) دەستگیر بکرێت. (محەممەد عەلیخانی سەرکردە) کە لەسەرکردەکانی (قۆزاقخانە) بوو و خۆی دوورگرتبوو لە شەڕ لەو کاتەدا و میوانی شازادە بوو، بەوە گیرۆدەبوو. موکەڕەمولدەولە هەرسێکیانی بەند کرد و گفتوگۆی لەگەڵ لێپرسراواندا کرد کە بیانێرن بۆ (تەورێز) بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەیان لەگەڵیاندا بکەن.

سمکۆ فشاری خستە سەریان بۆ ئەوەی بیانبەن بۆ نزیکی ئەو لە (چهریق) کە خۆی لێکۆلینەوەی لەگەڵیانا بکات. سەرکردەی سوپا و (موکەڕەمولدەولە) لە دوای ئەودا ئەوانەی سپارد بە (13) سواری قەرەداغی بۆ ئەوەی بە شەو بەناوی تەورێز بیانگەیەنین. (میر هیدایەت) بەو شێوەیە دەڵێ: من بۆ ئەو ڕۆیشتنە بە شازادەم گوت ڕۆیشتن بە ڕێگای (چهریق)دا و گەیاندنیان ڕووبەڕووبوونەوە دروست دەبێ و سەربازی دەوێ. (سادە دلانە) گوتی: حاکم وتوویە کە بۆ تەورێز دەڕۆن دەبێ بە ڕێگای باشووری شارەکەدا بڕۆن لەوێوە ڕێگای (سەڵماس) و (ئارونەف) بگرن، گوتم بۆچی لەو ڕێگەیەوە ؟! گوتی ئەو ڕێگایە گەورەیی خۆی هەیە ئەوەی دەیەوێ تیایدا هەیە، من جاێکیتر بە شازادەم گوت: ڕۆیشتن بە ڕێگای (چهریق)دا جێگە بۆ ڕاکردن خۆشدەکات. باوەڕیش ناکەم و ڕازییش نیم من ئەوە بەفێڵ تێدەگەم کە بۆ

راکردن و قازانجی تیادایە. بەهرەمەند بوو میر هیدایەت کە لە شەڕدا تەجرووبەی ئازایەتی هەبوو لە هۆش و زیرەکیشدا بەهرەمەند بوو لەوە دەگەیشت و دەیزانی لە نیوەی ڕێگای نزیکی گوندی بەناو (ئیمامکەندی) سوارەکان فریودەدا و لەدەستیان رزگاری دەبێت، ئەوەبوو رویدا و رزگاری بوو لە ئەشکەنجە و مردن و هەڵهات. بەڵام شازادە لەگەڵ محەممەد عەلیخان گەیشتنە (چهریق) و دایانن بە دەستی ئیسماعیل کە تاوەکو (3) رۆژ لای بەندبن لە ئەنجامی ئازاردانیاندا مردن، ئەمە لەکۆتایی مانگی (خورداد) دابوو.

ساڵی 1298ی هەتاوی سەرکردەی سوپا، والی ئازەربایجان لەگەڵ هەیئەیەك لە تەورێز رۆیشتن بۆ قەڵای چهریق بۆ ئەوەی نازناوی سەرداری سەرکەوتوو بدەن بەسمکۆ لەمەدا (سەرداری سەرکەوتووی مومتاز) لەگەڵ کۆنسوڵی ئینگلیز و سوارە هیندییەکانیدا گەیشتنە چهریق. سەرداری سەرکوتوو لەلایەن والی و دەوڵەتەوە فەرمانی نازناوی سەرداری سەرکەوتووی بۆ ئیسماعیل ئاغا هێنا لەگەڵ دراو و شمشێرێکی گەوهەرداری بەنرخ. ئیسماعیل ئاغا وتی: بەمەرجێك ئەو نازناو و دیاریانەی دەوڵەت وەردەگرم (زیائولدەولە) دەستبەرداری کارەکەی بێ و حکومەتی (ورمێ) و (سەڵماس)یش بە خودی سەرداری سەرکەوتوو بسپێرن، سەرکردەش رازیبوو بە داواکەی ئسماعیل ئاغا. لەم کۆبوونەوەیەدا سەرداری سەرکەوتووی مومتاز و حاکمی ورمێ و سەڵماس ئامادە بوون.

ساڵی 1298 ی هەتاوی سمکۆ ناوچەی دەسەڵاتی گەورەترکرد و ورمێی داگیرکرد و ناوچەی ئازەربایجانیش کەوتە ژێر دەسەڵاتی تەواوی. لە جەنگی (لەکستان)یشدا ئەو ناوچانەی لە دەرەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتی مەرکەزی بوون. لە کۆتای هەمان ساڵدا (سەرداری ئینتیسار) لە (تەورێز) کە دوو مەنسەبی هەبوو حاکم و سەرۆکایەتی سوپای دەوڵەت کە لە (تەورێز) پێدرابوو نەیتوانی ئەو رۆڵە وەربگرێت بۆ سەرکوتکردنی سمکۆ و هێزەکانی هەر ئەویش وایکرد ئەفسەرێکی روسی لە تاران بەناوی (فیلیبۆف) بگاتە

(تەورێز). ئەو فەرمانی تەواوی (لەسەرداری ئنتیسار) وەرگرت، لەوێوە گەیشتە (بەندەری شەرەفخانە) و لەماوەیەکی کەمدا (لەشەرەفخانە) توانی سوپایەکی پڕچەك لە هێزەکانی دەوڵەت لە سەرباز و قۆزاق وسوارەی ناوچەکە گرد بکاتەوە و ئامادەیان بکات بۆ هێرشبردنە سەر هێزەکانی سمکۆ.

لە سەرەتای ئەسفەندی ساڵی 1298ی هەتاوی هێرشی هێزەکانی دەوڵەت بۆ سەر کوردەکانی دەستپێکرد، کەسی (سەرداری ئنتیسار) لەو هێرشەدا هاوبەشیکرد. بەو پێیە شەڕی سەخت و دژوار لە چوار دەوری (شاپوور) بەردەوامی هەبوو رۆژی چوارشەممەی پێنجەمی (ئەسفەند) هێزەکانی دەوڵەت سەرکەوتن بەسەر کوردەکاندا و شاری (سەڵماس) سەر لەنویێ بەدەست هێزەکانی دەوڵەت کەوت. هەڵبەتە لەم شەڕەدا زۆر لە خاوەن پلەکانی قۆزاق و سەرباز کوژران و زیانی زۆریش بە هێزەکانی کورد گەیشت. ئیسماعیل ئاغا لەم شکستییەیدا هێزەکانی خۆی بۆ سنووری قەڵای چهریق شوێنی هەمیشەیی خۆی گێڕایەوە.

بەو سەرکەوتنە چاوەڕواننەکراوەی هێزەکانی دەوڵەت و ئەو پیرۆزییەی (سەرداری ئینتیسار)ی دەستی کەوت بەرەو (تەورێز) گەڕایەوە و (فیلیبۆف)یش چوار دەوری قەڵای چهریقی گرت. کاری ئیسماعیل ئاغا گەیشتە ئاڵۆزبوون و هەموو رۆژێکیش هێزەکانی دەوڵەت هێرشیان دەبردە سەر (چهریق) و قەڵاکەی، کوردەکانیش بەربەرەکانییان دەکرد. لێرەدا (سەرداری ئنتیسار) بەو پەیمانە (9) خاڵییە رازیبوو کە رێکەوتبوو لەگەڵ ئەفسەرەکانی عوسمانی و لەژێرەوە نووسراوی بۆ ناردبوون کە ژمارەیەك لەو ئەفسەرانە گەیشتبوونە تەورێز بۆ وتووویژکردن. لەم نائارامیەدا (عەینولدەولە)ی نێدراوی (وسوقولدەولە) والی ئازەربایجانی بینی و فەرمانیدا بروسکە بدات بە (فیلبۆف) بۆ ئەوەی لەگەڵ سمکۆدا رێك بکەوێت هەردوولایان

دەست لەو شەڕە هەڵبگرن و پەیماننامەی ئاشتی بنووسن بەڵام وەکو دەبینرێت هیچکام لەو بەندا نەی بەجێ نەگەیەنرا. "[1]"

سمکۆ لە قەڵای چهریق دانیشت و بۆ ماوەیەك دەستی لە شەڕ هەڵگرت، ئەو بارودۆخەش ڕێگایدا هێزەکانی خۆی بەهێزتر بکات. ساڵی 1299ی کۆچی هەتاوی سمکۆ لەقەڵای (چهریق) حکومەتەکەی هەڵدەسووڕان حاجی (موخبرولسەڵتەنە)ی (والی ئازەربایجان) بۆ سەرکەوتنی ئەو (ماژۆرمەلیکزادە)ی بە مەئموورییەت دژی سمکۆ نارد، سمکۆ لەرێگای چهریق – ساوجێلاغ (مەهاد) بینراو شکستی بەهێزی دەوڵەت دا، لەو شەڕەدا لە سنووری (800)سەرباز کوژران. لەو شەڕەی دوای کە لە ڕۆژگاری سەرۆك وەزیران (قوامولسەڵتەنە) قەوما ساڵی 1299ی هەتاوی (لەرۆژگارە کودەتاکە) لەسەر ئەوەرێکەوتن فەرمانیان دا بە (سامخان) (ئەمیر ئەرشەد) کە هێزی سمکۆ بشکێنێت بەڵام سەرئەنجام ئەو شکستی خوارد و کەسی ئەمیر ئەرشەد لەو جەنگەدا کوژرا و زیانی زۆریش لەسەربازەکان کەوت. هەواڵی شکستی سوپای دەوڵەتیش لە هەموو وڵاتانی ئێراندا کاریگەری خراپی زۆری لێکەوتەوە. ئەم شەڕە تاکو نزیکی قەڵای (چهریق) بەردەوامی هەبوو لە کۆتایی مانگی ئازاری 1299ی هەتاوی شەڕەکە وەستاو رێکەوتن.

دوای ئەو ڕووداوە ڕەزاخانی سەرکردەی سوپا بەهێزی زیاترەوە بەرەنگاری ئیسماعیل ئاغا بووە وە، پلانی هێرشبردنی بۆ داگیرکردنی قەڵای چهریق بەم شێوەیە رێکخست: ناردنی حەبیبوڵڵاخانی شیبانی، ناردنی سەرتیپ ئامانوڵڵا میرزا جیهانیانی (سەرۆکی سوپای ئێران لە ئازەربایجان)، ناردنی سەرلەشکر ئیسماعیل ئەمیر فەزلی فەرماندەی لەشکری ئازەربایجان، ناردنی خاڵۆ قوربان بەچوار هەزار نەفەری عەشایەر لەگەیلانەوە، ناردنی فەوجی 14ی ژاندارمری (کارگێڕی ئەمنی) لەژێرفەرماندەی سەرهەنگی (2)

پۆلادین وەلند بەرك ولاسن، ناردنی هێزەكانی دەوڵەت لە ساوجبلاغ (مەهاباد). بەڵام ئەو هێزانە بەرەو پێش نەچوون، ئەوانەیان پارچە پارچە بوون یاوەكو گرفتاری رووداوی سیاسیی بوون لەهەمان ساڵدا لە تەورێز و ناوچەكانی دەوروبەری هەتاكو(خاڵۆقوربان)یش لەشەڕەكەدا كوردەكان كوشتیان. جارێكیتر سەركردەی سوپای هێزی تازەی ئامادەكرد بە فەرماندەیی سەرتیپ (ئامانوڵڵا میرزا جیهانیانی) و خستنیە ژێر دەسەڵاتی هێزەكانی ئازەربایجان هەروەها هێزی گەورەتری پێكهێنا كە پێكهاتبوون لە: شكری پاسەوانەكانی مەركەزی، هێزی پیادەی پەهلەوی، هێزی رەزاپور، سوارەی نیزامی تۆپخانە لەگەڵ لەشكرێكی باكووری خۆرئاوای ئازەربایجان، گیانفیدا و شەڕكەرانی غەیری نیزامی كە هەموویان لە سنووری پانزە هەزار نەفەربوون لەگەڵ دوو تۆپی سەحرا و دوو تۆپی كوێستانی.

## قەلای چهریق لە رۆژگاری دەسەلاتی سمكۆدا:



ئیسماعیل ئاغای سمكۆ لە ساڵی ١٢٩٨ ی قەمەری لە كۆشكی چهریق

سەركەوتنەكانی سمكۆ هێزەكانی دەوڵەتی خستە سەر ئەو رایەی ددان بە حاكمێتی سمكۆ لە كوردستان وئازەربایجاندا بنێن. كوشتنی (سەردار ئەرشەد) و(خاڵۆ قوربان) و لە ناوچوونی سەربازانی دەوڵەت لە دەشتەكانی ساوجبلاغ (مەهاباد) رێگای بۆدەسەڵاتونفوزی ئەو لە هەموو ئازەربایجان و ناوچەكانی كوردنشیندا بڵاوكردەوە. لەناو خەڵكیشدا ئەوە دەگوترایەوە كە هێزی سمكۆ نابەزێت و

قەڵای (چهریق)یش بە هیچ هێزێك ناگیرێت. سمکۆ لەوماوەیەدا حاکمیەتی خۆی بەهێزکرد و کۆتاییشی هێنا بەدەستی حاکمەکانی دەوڵەت و شوێنی خۆی گرت، هەروەها شوێنی دانیشتنی قەڵای بەهێزی چهریق بوو لە خۆرئاواشدا شاری شاپوور (سەڵماس)یشی هەبووکە کەوتبووە سنووری توورکیا و چەند کیلۆمەترێك لێوەی دووربوو، چواردەوریشی ئاوەدانکردبووووەوە. ئەم قەڵایە لەسەر بەرزاییەکانی ئەو ناوچەیە دروستکراوە کە دەستگەیشتن پێی هەروا ئاسان نییە. لەسەر ئەو قەڵایە وا نووسراوە کە لە ئەترافیدا شارێك هەبووە لە رۆژگاری ساسانیدا کە بەناوی (شەهرەك)کە دواتر بووەتە (چهرك) و(چهریق). لە دراوسێی ئەم قەڵایەدا کە شاخەکان بەسەریا دەڕوانن رووباری (زوولاچائی) دەڕوات. سمکۆ لە نزیکی ئەو قەڵایەدا قەڵای تر و کۆشکی بەهێز و جوانی بۆ خۆی دروستکردووە، کە یەکێك لەوانەی بە بەردی سماق و مەڕمەڕی رەش وسپی دروستکردووە و لە ناوەڕاستیشیا باخێکی دڵڕفێن بەناوی (دڵگەش) و کۆشکی پاشکۆی تێدا بوو. بۆ ئەو چەکدارانەی لە ژێر فەرمانی سمکۆدا بوون ئامارێکی تەواومان بەدەستەوە نییە، بەڵام دەسەڵات و فەرمانەکانی سمکۆ لە تەواوی ئازەربایجانی خۆرئاوا و کوردستاندا جێبەجێ بووە و زۆرینەی سەرۆك عێلەکان و عەشایەرەکان لە سنووری فەرمانەکانی ئەودا سەربە و بوون . لەسەروو ئەوانەشەوە ژمارەیەکی زیاد لە خاوەن پلە و پایە و سەربازەکانی عوسمانیش دوای تەواوبوونی جەنگی جیهانی و شکستی عوسمانییەکان بە میوانی دەچوونە لای و لەژێر فەرمانی سمکۆدا بوون و بڕیاری ئەویان جێبەجێدەکرد. ئەوانە بە خۆیان و چەند تۆپێك و ژمارەیەك لە کەلوپەلی جەنگی لە ناو داخوازییەکانی سمکۆدا دەسەڵاتی خۆیان بەهێزتر دەکرد. لە هەمانکاتیشدا ئەفسەرەکانی عوسمانیش بوونەتە هۆکارێك بۆ بەهێزکردنی هێزەکانی سمکۆ. ئەوانە لە جەنگەکاندا هێزی سمکۆیان بەرەو سەرکەوتن و رێنمایی دەبرد.

## سەرەتای هێرشی هێزی دەوڵەت بۆداگیرکردنی قەڵای چهریق:

بە پێی فەرمانی سەرتیپ  جیهانیانی سەرکردەی هێزی ئازەربایجان هێرشی سەربازی لە رۆژی چوارەمی مانگی (مورداد)ی 1301 ی هەتاوی بەرامبەر بە دەیەمی موحەڕەمی عاشورای ساڵی 1341 ی کۆچی قەمەری دەستیپێکرد.

لە گەرمەی شەڕدا هەواڵ بە سەرتیپ جیهانیانی گەیشت کە شەڕی قورس لە بەرەی هێڵی پاسەوانەکان کە پاسەوانی بەرزاییەکانی (قزل داغ) و (مێشوداغ)ن و پێشڕەوییان کردووە. هێڵی هێزی پیادە لە بەرزاییەکانی (قزل داغ) لەگەڵ کوردەکاندا لە شەڕی گەرمدان و دەلاقەیەکی گەورەشیان کردووەتە بەرەی دووژمن و بەرەوپێش دەڕۆن.

هەروەها دەنگوباسی وا دەگەیەنێت کە ئاگری بەهێزی زنجیرە تۆپەکانی کوردەکان هەردوو باڵی هێڵی پاسەوانەکان و باکووری خۆرئاوای بەر هێرشی توند کەوتوون. هەواڵیش وا گەیشت کە پەیوەندی نێوانیان بچراوە و ئەوانەی بەرزاییەکانی (قزل داغ) چواردەوریان گیراوە و بەرەو نەمان دەڕۆن. سەرتیپ جیهانیانی ئەوەی بە دەستییەوە بوو لەسەر ئەو راپۆرتە بە هێزی سوارەی سپارد کە لە ژێر سەرکردایەتییەکەیدا بوون وفەرمانی دا بە دوو بەش و بەخێرای بەرەوو پێش بڕۆن بۆ کۆتایی هێنان بەهێرشبردنی کوردەکان بۆ سەر هێزەکانی دەوڵەت کە سەربازەکانیان بەرەو دوا بردبوو. بارانی گوللە تۆپەکانی کوردوو ئاگری تفەنگەکانیان بە وردی رووە و هێڵەکانی دوژمن دەبوونەوە. شەڕکەرانی کوردیش بە گیانی لە خۆبردن و ئازایەتی تێدەکۆشان شوێنەکانیان بپارێزن لە کاتێکدا شکاکییەکان لەناو هێڵەکانی هێزەکانی دەوڵەتدا هەبوون بەڵام سەرئەنجام توانای ئاگری تۆپخانە و هێرشی هێزی سوارەی نیزامی هێزی کوردی ناچارکرد بۆ لای سەڵماس و قەڵای چهریق هەڵبێن. بەو جۆرە بەرەی پاسەوانەکان لە تەنگەژە رزگاریان بوو ئەوانیش

بەردەوامییان لە بەرزاییەکانی (مێشوداغ)ەوە رووە و سەڵماس رۆیشتن، بەرەکانی تری نیزامیش رەوانەی (سەڵماس)کران هەتاکو دوو رۆژیش هێزی کورد لەسەڵماس بەرەنگارییانکرد بەڵام دوایی چۆڵیانکرد و بەرەو قەڵای (چهریق) هەڵهاتن و(سەڵماس) یش بەردەستی هێزەکانی دەوڵەت کەوت.

داگیرکردنی قەڵای چهریق:

دوای داگیرکردنی شاری سەڵماس لەلایەن سەرکردایەتی سوپا سەرتیپ ئامانوڵڵا میرزاجیهانیانی فەرمانیدا بە سەربازەکانی بیٚ ئەوەی کار بە فیرۆ بچیٚ و سمکۆش ماوەی کۆکردنەوەی هێزەکانی نەبێت بەخێرایی بەرەو پێش برۆن و چواردەووری قەڵای چهریق بگرن. هێزی دەوڵەت دوای هەشت کاتژمێر ریٚگابڕینی شاخاوی گەیشتنە نزیکی قەڵای چهریق ئەوسا چوار دەوریانگرت. لە شەڕێکی گەورە و توندا هێزەکانی دەوڵەت کە لە رووی تۆپ و سوارەی نیزامی و پیادە و زۆر زیاتربوون لە هێزی سمکۆ قەڵاکەیان داگیرکرد و هێزەکانی سمکۆش تاوەکو سنووری تورکیا پاشەکشەیانکرد. مێژووی داگیرکردنی قەڵای چهریق لەلایەن دەوڵەتەوە رۆژی (20)ی مورداد 1302ی هەتاوی بۆ دانراوە.

ئەوەیسەرنجراکێشە داگیرکردنی قەڵای چهریق وشکستهێنانی هێزەکانی کورد لە هەموو ئێراندا بووە هۆی گێڕانی جەژن وشایی. رەزاخان کە گەورەی سوپابوو، سەربازەکانی شاهەنشاش وەکو داگیرکردنی وڵاتێکی بێگانە مامەڵەیان دەکردوو بۆ چەند رۆژێك هەڵپەڕکیٚ و شادمانی لەناوینا درێژەی کێشا. دوای رۆیشتنی چەند ساڵێك کە قەڵای چهریق بە دەست هێزەکانی دەوڵەتەوە بوو سمکۆ لە ساڵی 1309 ی هەتاوی بەفێڵ وفریوودان وەکو جەعفەر ئاغای برای لە(شنۆ) نامەردانە بەکوشت چوو یەکێك لە شۆڕشەکانی

**کورد کە بەرامبەر زۆر و تاوان و سیستمی فەرمانڕەواکانی قاجار و پەهلەوی درێژەی کێشا خامۆشکرا.**

**پێشینەی مێژوویی قەڵای چهریق:**

**دوی ئەو کنەو پشکنینانەی لە قەڵای چهریق دا کراوە نیشانیدەدات قەڵاکە لە رووی شوێنەوارییەوە لە رۆژگاری قاجارییدا دروستکراوە جگە لەو پاشماوانەی تری نزیکی قەڵاکە کە بۆ سەردەمی ئۆرارتۆییەکان دەگەڕێتەوە و بەنرخن. قەڵای چهریق دەکەوێتە کەناری گوندی چهریقی خوار و کە هەتاکو ئێستاش بەشێك لە پاشماوە روخاوەکەی ماوە، یان کەمێك لە خانووە بە بەرد دروستکراوەکانی ماون. ئەم پاشماوەیە لەسەر تەپەیەکی بەهەمان ناو دروستکراوە کە دراوسێی گۆڕستانێکی کۆنە. ئەم تەپەیە و قەڵامێژووییەکەی بەپێی کنەوپشکنینی کۆن کە بۆ هەزارەی یەکەمی بەر لە زایین دەگەڕێتەوە. تەپەکەش لەو شوێنانەیە کە گەلانی ئۆرارتۆ بۆ پێداویستییەکانیان بەکاریانهێناوە، ئاسەوار و بەڵگەی دەسکەوتووش لێرەدا گۆڕەکانە کە ژمارەیەکی زۆر لەو ئێسقان لە ناویانا دۆزرانەوە ئەوەش بەڵگەی ژیان لە رابردوی ئەوتەپەیەدا دەرئەخات کە کۆنییەکەی بۆ رۆژگاری مادەکان دەڕواتەوە. دەزگاکانی کنە و پشکنینی ئەڵمانی دەربارەی پێشینەی مێژوویی قەڵا و تەپەکە چیرۆکی کۆنی ئەو تەپەیە دەردەخات. ئارامگای کوڕی ئیسماعیل ئاغای سمکۆش لەم تەپەیە دایە.**

**مینۆڕسکی لەسەر ئەو تەپە کۆنە نووسیوێتی و دەڵێ: ساڵی 1888ی زاینی لە گوندی گۆگتەپە لەژێر تاقێکی بەردیندا لە قووڵی 8 مەتردا گۆزەیەکی شێوە لوولەیی دەرکەوت کە خواکانی بابلیان لەسەر نەخشێنرابوو بۆ دوو**

هەزار ساڵ بەر لە زایین دەگەڕێتەوە. ئەگەر ورمێ هەمان شاری كۆنی (ئورمیات) بێت بە مانا ئەو شارە كەوتووەتە ناو ولاّتی مانابییەوە و بەر هێرشی ئاشوورییەكان كەوتووە كە دەسەلاّتی ئەوان، ئۆرارتۆی تێدا بووە. لای خوێنەریش ئەوە ئاشكرایە كە تەپەكەی ئیسماعیل ئاغا و تاقە بەردینەكەی (مەبەست لە گۆڕە بەردینەكەیە) خاوەنی هەمان خاسیەتی كارگەی (وان)ە. (موخبیرولسەڵتەنە) جارێكتر لەو بارەیەوە دەنووسێ: ئەم قەلاّیە پەیوەستە بە عێلی شكاك كە دەكەوێتە نێوان ورمێ و سەڵماس لەسەر هێڵی سنووری ئێران – توركیا دانیشتوان و بەپێی ئاماری نارەسمی (70) ساڵ بەر لەوەی سەرژمێری ئەو عێلە بكرێ 4400 خێزان بوون. محەممەد ئاغا سەرۆكی عێلی شكاك بوو كە باوكی سمكۆیە و لەم قەلاّ توندوتۆڵەی چهریقدا كە دەكەوێتە سنووری توركیا و ئێران دانیشتووە، هەركاتێك دەوڵەتی ئێران لاواز بووبێت شۆڕشی بەرپاكردووە.

جەعفەر ئاغای سەرۆكی عێلی شكاك كە برای سمكۆیە و بە فێڵی (نیزامولسەڵتەنە)ی والی ئازەربایجان لە رۆژگاری دەسەلاّتی (موزە فەرەدین)شا لە ساڵی 1284 كە بە قورئان سوێندیان بۆ خوارد دوای ئەوەی دڵنیای پێدرا لە تەورێز بەفێڵ كوشتیان. بە قسەی حاجی موخبیرولسەڵتەنە كە لە كتێبی (خاترات و خەترات)دا هاتووە، ئەو تاوانە خراپە عێلی شكاكی خستە سەر ئەوەی كە هاورێیەتی گەورە پیاوانی حكومەت بە گومانەوە بكەن و هیچ كات لە دڵەوە خۆشیان نەوێن. كیسرەوی جارێكیتر دەڵێ: (دوای كوشتنی جەعفەر ئاغا، ئیسماعیل ئاغای برای مەركەزی حكومەتەكەی گواستەوە بۆ قەلاّی چهریق و هەستا بە هێنانی (بەنا) لە شارە دراوسێكانەوە و بینای زۆری لێدروستكرد ئەوەش وایكرد ناوچەی قەلاّكە رۆژ بە رۆژ ئاوەدانتر بێت، دوایش سمكۆ كۆشك و باخی زۆری لەگەڵ بینادا بۆخۆی دروستكرد لە بەردەوامی جەنگی روس و عوسمانیدا دەستەیەك لە سەربازان و تۆبچییەكانی عوسمانی كە چەند سەد كەسێك بوون و بۆ ولاّتی خۆیان نەگەڕانەوە، تفەنگ و

**تۆپەکانیان بردە چەریق و لەژێر دەسەلاتی سمکۆ لە چەریق هێشتیانەوە. هەر چۆنێك بێت دەسکەوتنی قەلای چەریق لەبەر تیشکی قسەی مێژوویدا ئەوە دەردەخات کە قەلاکە پەیوەست بێت بە رۆژگاری قاجاری و پەهلەوی. ئەو قسانەش لەسەرچاوەکانی بەر لە خۆیان گواستوویانەتەوە.**

**نەخشەی مێژوویی قەلای چەریق:**

**نەخشەی مێژوویی قەلای چەریق لە ساڵی 1279ی کۆچی قەمەری سازکراوە ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ تێکۆشان و گرنگیدانی پایە بەرز عەبدولعەلیبەگی سەرهەنگ کە ئامادەی کردووە. نەخشەکەی عەبدولعەلی بەگ کە لە کەسایەتییە دیارەکانی نیزامی سەردەمی (ناسری)یە، زانیاری تەواومان لەبارەی ژیان و پاشماوەکانییەوە لەبەردەستدا نییە لەبەرئەوەی دوو کەس بەناوی (عەبدولعەلی خانی سەرهەنگ) و (عەبدولعەلی خانی کوڕی ئەمین نیزام)ەوە هەن.**

**من بزانم (ئیعتمادولسەڵتەنە) لە (الماپر والاپار)دا ناوی ئەوانە دەبات. ئەو نەخشەیەش بەر لە روودانی شۆڕشی سێخ عوبەیدوڵلا شەمزینی (ساڵی1297ی کۆچی قەمەری) تەواوبووە و نیشانیدەدات کە بینا و عەمارەکانی لە رۆژگاری یەحیا خانی چەریقی (سەردەمی ئامادەکردنی نەخشەکە) تەواو بووە و لە رۆژگارەکانی دواتریشدا تێکچوونی بەخۆوە نەدیوە و ئاوەدان بووە و پارێزراوە، لە رووی تەلارسازیشەوە شێوەکەی ناوازەیە. لە بنەچەدا ناوەڕۆکی نەخشەکە ئەوەی ئامادەی کردووە بەم شێوەیە هاتووە: (نەخشەی قەلای چەریق کە بە هەوڵ و تێکۆشان و یارمەتی عەبدولعەلی بەگی سەرهەنگ ئەنجامگیربووە)، بەرزییەکەی لە زەوییەوە هەشتا گەزە و رووبەرەکەشی دە هەزار ودووسەد گەزە. بەپێی راپۆرتێك کە لە ساڵی 1279 قەمەری پێشکەشکراوە بەرزی قەلاکە زیاتر لە هەشتا مەترە و**

رووبەرەکەشی زیاترە لە دوانزە هەزار مەتری چوار گۆشە ئەم قەلایە خاوەنی دووانزە هەزار قولەی ئەسڵی و چوار قولەی ترە کە دەکەونە ناو عەمارەکەی یەحیاخانی چهریقی کە بە هەمووی شانزە قولە دەکات. ئەم قولانە بەپێی شوێنیان و شوێنی قەڵاکە لە رووی تەپە بەردینەکەی چهریق بەرزاییەکانیان جوودان و لەگەڵ نەخشەی مێژوویی ساڵی 1279ی قەمەری یەکدەگرنەوە. کۆمەڵەی خانووەکانی ناو قەڵاکە و دەرەوەی بە دوو بەش دابەش بوون:

ئەلف: خانووەکانی ناو قەڵاکە زۆرترن و سەرچاوەی ئاوەکانیشی لەخوارەوەن:

1. عەمارەی یەحیاخانی چهریقی: ئەم عەمارەیە دەکەوێتەوە بڵند ترین شوێنی قەڵاکە و بەپێی راپۆرتێك نەخشەکەی تایبەتە بە یەحیاخان و لەڕێی پەیژەیەکی دارەوە سەر دەکەون.
2. شوێنی مانەوەی قەرەوڵەکان (پاسەوانەکان) کە بۆ پاسەوانەکان دروستکراون و پارێزگاری لە قولەکان و شورای قەڵاکە دەکەن. لە نەخشەکەشدا ئەو شوێنە دیاریکراوە.
3.شوێنی سەرکردەی قەرەوڵەکان (پاسەوانەکان) بەمانای شوێنی مانەوەی سەرۆکی پاسەوانەکان و سەربازەکان کەپاسەوانێتی لە قەڵاکە دەکەن.
4. کارخانەی چەك: شوێنی گرینگیدان بەپێداویستیەکانی شەڕ، بەشێوەیەکی تر بڵێین جبەخانەی قەڵابووە.
5.مزگەوت: مزگەوت لە کۆمەڵەی بیناکانی ناو قەڵاکەیە و شوێنی پارێزراوە، یان هێمایەکە و لە زەویەکەدا دیارە. گرنگی مزگەوتیش لەوەدایە کە مرۆڤ پێوەی پەیوەستە بۆ پرسەکانی شەرعی وئاینی و پەرستنی خوا.
6.تەویلە.
7. گەنجینەی ئازووخە.
8. خانوویەك بۆ هەریەكێك لە سەرۆکەکانی قەڵاکە.

9.خانووی کوردەکان دەکەونە باشووری قەلاّ کە نزیك گوندی (چهریق)ە.
10. بیرەکانی ناوقەلاّ: بۆئامەدەکردنی ئاو بۆ خواردن و خواردنەوە. دوو بیری تریش لیّدراون دەکەونە باڵی باشوور و باکووری قەلاّکە.
11.لە نەخشەی ساڵی 1279ی قەمەریش بینای تریش دروستکراون بەلاّم کاریان نادیارە و لە رۆژگاری پیّشوودا ئەمانە کەوتوونەتە باڵی خۆرئاوای قەلاّکە.

بیّ: عەمارە و بیناکانی دەرووەی قەلاّکە لەگەلّ سەرچاوەی ئاوەکانیان کەلە خوارەوەن:

1.گوندی چهریق: کۆمەڵێك خانووی کەسانی گوندی (چهریق)ن کە نیشاندراون.
2. باخی یەحیاخان – پردی رووباری سوولە باخی گەورە دەکەویّتە خوارووی کە پەیووەستە بە یەحیاخانی چهریقی. باخەکەش دەکەویّتە باڵی باکووری خۆرهەلاّتی قەلاّوە.
3. باخەکانی چهریق: ئەم باخانە لەپیّشوودا لە باڵی خۆرهەلاّت و خۆرئاوا و باشووری گوندی چهریق بوون کە پەیوەستن بە خەڵکی چهریقەوە.
4. خانووی کوردەکان، جگە لەوخانوانەی گوندەکە کۆمەڵێکی گەورەی تر خانوو دروستکراون کە لە نەخشەی میّژوویی بەناونیشانی خانووی کوردەکان ئاماژەیان پیّدراوە و دەکەونە باکووری خۆرهەلاّتی گوندی چهریق.
5. پردی رووباری سوولە.
6. قولەی نایبولسەڵتەنە: ئەم قولەیە لە زنجیرەی تەپەی کیّوی عەبدی بیّگدایە، دەکەویّتە باشووری قەلاّکە. وا دەردەکەویّت ئەم قولەیە بەناو و یادگاری عەباس میرزای نایبولسەڵتەنەوە دروستکرابیّت کە دایکی لە نەوەی یەحیاخانی چهریقی بوو. ئەم قولەیە شیّوەکەی لاکیّشییە کە لە پیّشوودا شویّنی پاسەوان بووە کە لە راستیدا بۆ پاریّزگاریکردن لە قەلاّکە دروسکراوە. بە هەموو لایەکی قەلاّکەدا کۆمەڵەی گەورەی بیناو عەمارە بلاّو بوونەتەوە کە شایەتی سەربەرزی

رۆژگاری ئیسماعیل ئاغای شکاك نیشان دەدەن کە ناوچەکە لەو پەڕی خۆشیدا خەڵکەکەی ژیانیان بەسەر بردووە بەڵام دواتر ئەو شەڕانەی ناوچەی قەڵاکە بەخۆیەوە دیوە لە فەرمانڕەوایەتی قاجاری و پەهلەویدا جارێکیتر قەڵاکە رووی لە وێرانیکردووە و بەجێهێڵراوە.

نەخشەی مێژوویی قەڵای چهریق لە (ئارشیڤی دامەزراوەی مێژوویی سەردەمی ئێران)دا هەیە کە ژمارەکەی (110666-ق-110661-ق) پێکهاتووە لە شەش پارچە و پارێزراوە. ناونیشان و ناوەدیارەکان بە مەرەکەبی رەش نووسراون و درێژی نەخشەکەش 54,5 مەترە و پانییەکەی 52 سانتیمەترە و تیایدا چوار لای قەڵاکە نیشاندراوە، (باشوور وباکورو و خۆرهەڵات و خۆرئاوا). لە نەخشەکەدا بیناکان و عەمارەکان بەڕەنگی نارنجی نیشاندراون.

لە کۆتایدا توانیمان مێژوویی ئامادەکردنی نەخشەکە لە ئێراندا بزانین کە دامەزراوی (دارالفنون) لە (سەردەمی میری گەورە)دا بڵاویکردووەتەوە. ئەم نەخشەیە جوانترین و بەرجەستەترین نەخشەی مێژوویی ئێرانە کە پارێزراوە.

***

پەراوێزەکان :

1.باسی ئەو شەڕانە و مۆرکردنی پەیماننامەی (9) خاڵ وهۆکاری وەستاندنەکەی دەتوانین لە یاداشتنامەکانی (حەیدەر قولی بێگلەری)دا بیخوێنینەوە کە خودی خۆی یەکێك بووە لەو سەربازانەی هاوبەشیکردووە لە شەڕەکاندا هەروەکو دەڵێ: لە ساڵی 1337ی کۆچی قەمەری (راستییەکەی 1297ی هەتاوی) لەکاتێکدا دەوڵەتی مەرکەزی قاجار لە لاوازی و زەبوونی رزگاری بوو سمایل ئاغای سمکۆش دەسەڵاتی بەسەر ناوچەی ئازەربایجاندا دەڕۆیشت ئەو بارودۆخە مایەوە هەتاکو بەستنی پەیمانی ناسراوی 1297ی (وسوقولدەولە) لەگەڵ ئینگلیزەکاندا. سەرئەنجام هێزی دوو لایەنەی قۆزاق وسوارەی دیبۆکری ومامش وغەیری ئەوان لەژێر فەرمانده‌یی (فیلیبۆف)و (سەرداری ئینتیسار) (ئەعلەم) وەزیری دەرەوەی پێشوو) گەیشتنە (ورمێ) ولەزستانی ئەو ساڵدا بەرەو لای سمکۆ هێرشیانبرد بۆ

سەركوتكردنی لە قەلاّی چەریقدا. ئەم هێزانە نزیكی قەلاّی چەریق بوونەوە بەلاّم بە هۆی كەوتنی كابینەی (وسوقولدەولە) و سەرۆك وەزیرانەكەی (موستەوفیلمەمالیك) لەمەركەزەوە فەرمانیاندا سوپا بوەستێ و كۆتایی بە كارەكانی بهێنێ و بۆ شوێنی خۆی بگەڕێتەوە.



***

سەرچاوە:

اپر: فصلنامە علمی، فنی، هنری

شمارە: 35

تابستان 1382

ل 280-295

<u>تێبینی:</u>

ناونیشانی ئەم بابەتە بە زمانی فارسی (پێشینە و نەخشەی مێژوویی قەلاّی چەریق "چاریە" ) بەلاّم لە بەر رۆڵی گرنگ ومێژوویی ئێلی شكاك لە بەرەنگاری دەوڵەتی قاجاری و پەهلەویدا پێمان باش بوو ناونیشانی بابەتەكە بگۆڕین بەو شێوەیەی كە لەگەڵ ئەو رۆڵە مێژووییەی ئێلی شكاكدا بگونجێت. گۆڤاری كۆچ.



شوێنی چەرتی خواروو و سەروو لەسەر نەخشەی جوگرافیای سەربازی سوپای چەکدار ، ساڵی ١٧٧٠ ی هەتاوی

**هەموو ئەعزایی ناڵینم دەناڵێ**

**سەراپام میسلی مۆسیقارە بێ تۆ**

*** * ***

**لەدەمی ناڵەیی زارم، دڵی پڕ زەمزە مەکەم**

**وەلوەلەی حەلق و گەرووی( ناڵی)لە گەردوون بەدەرە**

**( ناڵی ) یا ( نالی )**

**مەلا نەوزاد**

**بەر لەوەی دیوانی ناڵی لە چاپ بدرێ کە یەکێك بوو لە کارە گرنگ و پڕ بەها و دەسترەنگینەکانی جەنابی مامۆستای پایەبەرز و زانای بێوێنەی سەردەمی خۆی لە زانستە ئیسلامییەکاندا و دڵسووز و ئەدەبزان و ئەدەبدۆست مامۆستا مەلا ( عەبدولکەریمی مودەڕیس) و رەحمەتی مامۆستا (فاتیحی مەلا**

کەریم) و (محەممدی مەلا کریم)، لێرە و لەوێ چاومان  بە هەندێك دەستنووس و چاپەکانی تری پێش ئەوان کەوتبوو، لەبەر ئەوەی نە لە دەستنووس و بەیازەکاندا و نە لە چاپکراوەکانی تردا مەسەلەی نازناوی حەزرەتی (مەلا خدر) نە ورووژابوو واتا وشەی (نالًی) نەخرابووە گێژاوی مشتومڕ لەسەرکردن و کەس پێی لەسەر ئەوە دانەگرتبوو کە نالًی بە لامی قەڵەوە و بەڵگە و دۆکۆمێنتی ئەدەبی بوو بێنێتەوە یان لامی سووکە و بەڵگەی بوو داتاشێ، ئەوەی باو و لەبەر گوێیان و لەبەرچاوانبوو ئەوە بوو کە نالًی بە لامی قەڵەو بەکارهاتووە، مامۆستا موقبیل و مامۆستا سەجادی هەر بە لامی قەڵەو بەکاریانهێنابوو، بەڵام پاش دەرچوونی یەکەم چاپی (دیوانی نالًی) کە سەیرکرا لەوێدا مەسەلەی لامی قەڵەو ولامی سووکی نالًی خراوەتە ژێر باس و لێکۆڵینەوە و بە چەند بووچوون و بەڵگەی لای خۆ بە بەڵگەی سەلمێنەر لایەنی لامی سووك گیراوە و پەسەند کراوە هەر لەو کاتەدا من نەختێ لەسەری راوەستام و سەرەڕای ئەوەی بەڵگەکان بە هێز نەبوون و لەو رادەیەدا نەبوون بگەنە پلەی سەلماندن و قەناعەت پێکردن وەك کەسێکی تیرەی میکایلًی  بەشی دانیشتوانی رۆژئاوای شاری سلێمانی نە لە باو و باپیران و نە لە ناوچەی خۆمان و نە لە جافەکانی خوارووی سلێمانی گوێبیستی تەلەفوز پێکردنی( نالی ) بە لامی سووك نەبووین هەر لەوکاتانەدا هەندێك بەڵگەم کۆکردەوە لەسەر پێچەوانەی رای دیوانی (نالًی) و گەڵاڵەمکردبوو نووسین بەڵام راونان و خۆ شاردنەوە لە چنگ  رژێمی  دیکتاتۆری بەعس مەودای ئەوەی نەدام بیگەیەنمە ئاکام بۆیە بەم دواییە پاش چەندین ساڵ پێم باش بوو ئەوەی لە بیرم مابوو بە نیوەناچڵی جارێکیکە بیخەمەوە سەر کاغەز.

بەر لە هەموو شتێك ئەبێ ئەوە بزانین کە لە سەردەمی ژیانی حەزرەتی (نالًی)دا کوردستان بەگشتی و ناوچەی شارەزوور بەتایبەتی لە ژێر پێی داگیرکەراندا بە چەشنێك چەوسابووە و شێلدرابوو کە نەك هەر رێگەی پەرەپێدانی زمان و ئەدەبی کوردی نەدەدرا و نووسین بە کوردی حەرامکرابوو

ژیانی ئاسایی مرۆڤەکانیش تاڵکرابوو شارەزوور ببووە مەیدانی شەڕی نێوان قاجار و عوسمانی و ساڵ نەبوو جارێك نە شێلدرێ و کاولنەکرێ، بەڵگە نەویستەکە لەو سەردەمەیا رێنووسی زمانی کوردی نەبووە ئەگەر هەش بووبێ یا بە دەگمەن بووە یا لەسەر  شێوەی رێنووسی فارسی بووە لە بەشی زۆری خوارووی کوردستان بە شێوەی عەرەبی و لە هەندێ جێی باشوور  بە شێوەی تورکی بووە کە ئەویش هەر بە لای شێوەی عەرەبیا دایشکاندووە.

بۆیە ئاماژەی لێکجیاکردنەوەیان هێمای لێکجیاکردنەوەی لامی سووك و لامی قەڵەو لە یەك نە لە رێزمان و رێنووسی زمانی عەرەبی و نە لە زمان و رێنووسی زمانی فارسیدا نەبووە، لە کاتێکدا کە نووسین و کتێب و شیعری کوردیان پێنووسراوە: ئەو جیاکردنەوە بە تەنها لە گوتن و ئاخاوتندا زمانی پیانراوە و لێکجیاکراوەتەوە کە ئەویش بە بیستن دەزانرێ، ئەو بیستنەش لەو سەردەمەیا زۆر کەمبووە چوون نە نالی بوو خۆی وەك ئێستا کۆڕی شیعری بەشێوە و بە زمانی خۆی بەستووە بۆ ئەوەی شیعرەکانی خۆی خوێندبێتەوە نە کەسیش کۆڕی بوو بەستووە و خەڵکی بوو کۆکردووەتەوە هەستابێ لە ناو ئەو ئاپۆرەدا داوای لە نالی کردبێ و شیعری پێ خوێندبێتەوە بوو خەڵکەکە، کەوا بوو ئەگەر جار و بار لە حوجرەکەی خۆی لە ناو هەندێ فەقێی رەفیقی خۆیا یان لای چەند دۆست و ئەدەبدۆستێکی ئەو سەردەمە کە زۆر کەمبوون یان بەکەمی روویداوە بە زمانی خۆی شیعری خوێندبێتەوە و ئەو کەسانە لێیان بیستێ لە بەر پڕمانایی و پڕ بەلاغەت و جوانکاری و شاکاری موعجیزەئاسای شیعرەکان گوێڕاگر و بیسەرکان ئەوەندەی مەبەستی مانا و فەلسەفە و موعجیزەی شیعرەکەیان بووە ئەوەندە مەبەستیان ئەوە نەبووە ئایا حەزرەت کە دەڵێ نالی بە لامی قەڵەو ئەیدرکێنێ یان بە لامی سووك لەبەر ئەوەی وەك ئێمە بۆی ئەچین لەو کاتانەدا کێشمەکێش لەسەر نازناوەکان نە بووە و کەس نەبووە بڵێ (نالی) بە لامی سووك و نازناو هەر نازناوی نالی بووە کەس قسەی لەسەر نەکردووە و. تەنانەت تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم باسی

جیاوازی و لێکنەچوون لە ناو مەردم و زانایان لەسەر نازناوی (نالی) هەر باس نەبووە و قسەی لەسەر نەکراوە، بەڵام دوای بەکارهێنانی ئەو نازناوە لەلایەن فارس و تورك و هەندێ لە زانا عەرەبەکانەوە جیاوازی ئاخاوتن و شێوەی لامەکە لە ناو ئەو ئاخاوتنەدا روویدا لێکنەچوون و جیاییەکەش لەوەدابوو کوردە هاونیشتمانەکەی خۆی کە ناویان دەبرد بە لامی قەڵەوناویان دەبرد، ئەوانەش کە نەختێك لە شارەزوور دووربوون زمان و ئاخاوتنیان کەوتبووە ژێر کاریگەری نەتەوە ژوردەستەکانیانەوە لەسەر رێوشوێن و چاولێکەری نەك تەنها لە (نالی)دا بگرە لە هەموو ئەو وشانەی لامی قەڵەوی کوردی رەسەنیان تیا بووە هەر بە لامی سووك ئەیاندرکان و ئەیانگوت بەنموونە ئێستاش لە هەندێ شوێنی کەرکوك و خوار کەرکوك بە (ئەڵێم) ئەڵێن (ئەلێم) بە لامی سووك یان لە هەندێ شوێن پیتی ( ر ) لە هەندێ شوێنی تری باشوور و ناوەڕاستی کوردستاندا لەجیاتی (لام) ی قەڵەو (لام) ی سووك بەکاردێنن.

وەك گوتمان نە بەو ئەندازەیە خەڵك گوێبیستی دەمی حەزرەت بووە کە وەك ریوایەتەکان بگاتە ئەندازەی تەواتور و کێشمە کیشم هەڵنەگرێ، نەهێما و ئاماژە هەبوو بۆ دیاریکردنی (لامەکە) ئەوەی هەبووە راستە نووسراوە سادەکەبووە ئەویش خوێندەواران بە گوێرەی بیستنیان لە زانای سەرچاوەی سەقافەتی ئەو وەختەیان کە غەیری زمانی خۆیان بوون و بە خوێندنەوەیان لەسەر ئەو رێوشوێن و شۆپە بە (لام)ی سووك خوێندوویانەتەوە و بە گوێی خەڵکیاندا داوە، جاروباریش بۆ پاساوهێنانەوە بەڵگەی داتاشراویان بۆ هێناوەتەوە، سەیریش لەوەدایە کە ئەوەندە تاوتوێی شیعرەکانی خودی حەزرەتیان نەکردووە کە بیسەلمێنن نازناوەکەی بە لامی سووکە یان لامی قەڵەو، لە کاتێکدا شیعرەکان خۆیان پڕن لە بەڵگەی یەکلاکەرەوەی بێ چەند و چوون و خۆیان پڕ بە دەم هاوار ئەکەن وبە روونی ئاشکرای ئەکەن بەڵام ئەوەی بە لامەوە جێی تێرامان و راوەستانە ئەوەیە کە جەنابی زانای پایە بەرزی ئاینی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لەدیوانی (نالی)دا کە ئەو

و ماموّستا فاتیحی رەحمەتی دایانناوە و گوایە ساغیانکردووەتەوە لەسەر نازناوی حەزرەتی نالی نەك هەر رای خوّیان دەربڕیوە بگرە نووسینەکەیان بوونی سەپاندن و بنبڕکردنی مشتومڕی لێدیٚ و ئەوەندەی لەسەر روّیشتوون مروّڤ کە ئەیخوێنێتەوە ئیتر وای لێدیّت ریٚ بە خوّینەدات بیر لە گومان و پێموایە و پێموانییەی ناو فیکری خوّی بکاتەوە کە چی کە سەیری شیعرەکانی خودی حەزرەتی نالی دەکەیت وات بوّ دەردەکەویّت کە ئەو بەڵگانەی ئەوان بوّ یەکلاکردنەوە و ساغکردنەوەی نازناوی (نالی) هێناویانەتەوە داتاشراو و دەستکردی ویستی شارەزایی دەربڕینە لە زمانی فارسیدا، ئێمەش حەقی خوّمانە بە پێی توانا شەن وکەوێکی بکەین و بە کورتەیەك لێی بدوێین و ئەم دیو و ئەودیوی بکەین، جاریٚ بێینە سەر ئەو سەرچاوەیەی کە وشەی (نالی) لێوەرگیراوە ئەویش وەك لە دیوانەکەیا هاتووە فەرهەنگی (بورهان قاتیع)ە ئەو فەرهەنگە فەرهەنگێکی گەڵێ کوّنە و لە دەوری ساڵی 1640ز لە چاپ دراوە زیاتر وشە فارسییە هاتووەکانی ناو فەرهەنگەکەیان پەهلەوی کوّنە یان سانسکریتییە یان هندی، بوّیە ئەو وشە فارسیانە ناڵێم ئێستا لە ئەدەبی فارسی نوێدا بە کار ناهێنرێن بەکاردەهێنرێن بەس هەموویان نا، تیایانە کە ئێستا لە زمان و ئەدەبی نوێی فارسیدا خراوەتە سەر رەفەی هەڵگرتن و توّزی لێنیشتووە، جا لەبەر هەر هوّیەك بێت توّزی بەکارهێنانیان لێنەتەکاندون، گەرانەوە بوّ لای ئەو فەرهەنگە لەجیاتی ئەوەی گریٚ کوێرەکە بکاتەوە تەمومژی پەیدا کردووە، بوّیە دەمەویٚ ئەو تەمومژە برەوێنمەوە و پەردە لەسەر ئەو شاراوەیە لابەرم و بە چەند بەڵگەیەك بەڵگەی شیعرەکانی خودی حەزرەتی (نالی) بیسەلمێنم کە (ناڵی) یەو (نالی) نییە وەك ماموّستا فاتیحی رەحمەتی کوڕی ماموّستا عەبدولکەریمی مودەڕیس بوّی چوون یان ویستوویانە لەو رێیەوە رایگەیەنن کە ئەوان نوێخواز و داهێنەر و دوّزەرەوەی شاراوەکانن و شارەزایی زمان و ئەدەب و کون و قوژبنی وردەکانن و لوئلوو و مەرجانی بن دەریای قووڵ ئەبینن و دەری دێنن و نیشانی خەڵکی ئەدەن، هەرچەندە بەلای

منەوە جەنابی مامۆستا مەلا کەریم مەلەوانی شارەزای ئەو دەریایانەیە و بەلەمەوانی دەربازکردنی ونبووانی ئەو زەریایانەیە، بەلاَم ریَ لەوە ناگریَ کەلە هەولَی دۆزینەوەی مەرجان و گەوهەریَکی ئەو دەریایەدا بەردی ئاسایی دۆزیبیَتەوە و ئەو بەردە بە مەرجان بزانیَ یان وای نیشانی خەلَکی بدات ریَی ئەوەش ناگریَ کەسانیتر بگەڕیَن و لەو شویَن و بووارەدا زیاتر شارەزابن و ریَ بەرنە سەر گەوهەرەکە و بیَن و گەوهەرە راستییەکە یان راستی گەوهەرەکە بخەنە بەر چاوی خەلَك یان کەسانیَکی کە هەبن لە حەزرەتی (نالی)یەوە نزیك بن و لە روی نزیکی پشت و بەرەبابی و شارەزایی ناو خۆییەوە باشتر پەی بەو گەوهەرەی نازناوە بەرن و بە بەلَگەی شیَوە ئاخافتن و ئاخافتنی ناوچە و هۆز و پشتبەستوو بە گوتەکانی حەزرەت خۆیەوە رایگەیەنن و بەگویَی خەلَکیا بدەن، منیش وەك یەکیَك لەو هۆز و بەرەبابە بەهەقی خۆمی دەزانم ـ خۆ ئەگەر بەرەبابیش نەبیَ وەك کوردیَکی بەتەنگەوەهاتوو رای خۆم دەربڕم و ئەوەی بە بەلَگەی ئەوەی ئەزانم سەلمیَنەر و قەناعەتپیَکەرە لە ناو کۆمەلَ و لە ناو شیعرەکانی خودی حەزرەتدا بهیَنینەوە و بیخەینەروو.

جاریَ بەر لەوەی بیَینە سەر بەلَگە زیندووە شیعرییەکانی خۆی ئەوە دەلَیَن کە زوربەی کوردی دەوروبەری سوولەیمانی و سنە و سابلاَخ بە لامی قەلَەو نازناوەکەیان ئەگوت و تا ئیَستاش بەکارهیَنانی لامی سووك لە ناو دانیشتوانی ئەو شارانە و دەوروبەرییاندا زۆر کەمە، ئەوە لە شارەزوور و زایگای حەزرەت خۆی هەر دەگمەنە کە زاراوە و ئاخافتنی ئەوانیش گرنگن بۆ ساغکردنەوەکە و جیَی متمانەشن بۆ سەلماندنی ئەم کیَشەی نازناوە، گرفتی جیاواز وەك گوتمان لەم دواییەدا لەسەر زمان و گوتنی هەندیَ مەلای شویَنکەوتەی فارس و تورکەکان پەیدا بوو ئەوانەی کە فارسی و عەرەبی زانین و ئاخاوتن بە زمانی ئەوان و نووسین بە زمانی ئەوانیان بەمەرجی سەرەکی دائەنا بۆ رادەی زانیاری و خۆیان گوتەنی عالمی و مەلایەتی، ئەگەر مەلایەك یان خویَندەواریَك زۆر شارەزای ریَزمان و رەوانبیژی عەرەبی و فارسی نەبووایە

ئەوە با فەیلەسوفی زانستی باوی ناو کۆمەڵگەی خۆی بووایە هەر بە خوێندەوار و زانا نە دەژمێردرا.

بۆیە لەسەر رێوڕەسمی چاولێکەری و باو و رەواج خوێندەوارەکان بە ناچاری ئەو رچەیەیان ئەگرت و هەوڵیان ئەدا زانایی خۆیان لە رێی دەربڕینی شارەزایی لەو ئەدەب و زمانانەوە دەربڕن و هەمووغەیرە عەرەبییەکانیان ئەخستەوە سەر ئەو زمانە بێگانانە و چاوگ و بنج وبناوانیان بۆ پەیدائەکرد و لەو چاوگانەوە سەیریانئەکرد، بە راستی پیاو هەق بڵێ یەکێك لەوانەی ئەو تەلیسمەی شکاند و ئەو سنوورەی بەزاند جەنابی مامۆستا مەلا عەبدولکەریم بوو کە هەستی وەك جەنابی شێخ محەممەدی خاڵ و ئەمین زەگی بەگ و مەلا حسێن و مامۆستا مەلا جەمیل رۆژبەیانی دەستیدایە کوردی نووسێن و هەندێ کتێبی ئاینی بە کوردی نووسی یان کردنیە کوردی کە ئەشبینێن جێی سەرسوورمانە ئەو زاتە هەستاوە بۆ ساغکردنەوەی نازناوی (نالی) پەنای بردووەتە بەر فەرهەنگێکە کۆن و فارسی تێکەڵ لە زمانی سانسکریتی هندی وەك فەرهەنگی (بورهان قاتیع) سەرسوورمانەکەشی لەوەوەیە کە بۆ ئەبێ زانایەکی وا واز لە راستییەکە بێنێ و هەستێ نازناوێك بێنێ و بەڵگەی بۆ داتاشێ لە کاتێکدا کە راستییەکە بەڵگە نەویست و دیارە لەبەر ئەوەی:

1.(نالی) قوتابخانەی کوردی بووە و چەندی ویستوویەتی شانبەشانی گەورە رەوانبێژانی فارس و عەرەب و شاعیرانی ئەو دوو نەتەوەیە لە مەیدانی رەوانبێژی و جوانکاری و جوانگوتەیی و بەدەستەوەستانکردن و نیشاندان ئەسپی خۆی تاودا و بڵێ کەس نەڵێ خۆ کوردییە مانا و مەغزا بە زمانی کوردی نیشانی خەڵکبدا و بڵێ ها ئەوەتا کورد لەو مەیدانەدا گۆی خۆی بردەوە و ئێوە تۆزیشی ناشکێنن ئەوەندەش مەبەستی دەرخستنی زمان و ئەدەبی کوردی بووە و ویستوویەتی وشە رەسەنەکانی زمانی کوردی بخاتە گەڕ و بیانخاتە کار وەك هەویر بیانشێلێ و بە ئارەزووی خۆی گونکە هەویریان لێدروستبکات و خۆ لە بەکارهێنانی وشەی بێگانە ببوێرێ هەتاپێی

کرابێ وشەی کوردی هێناوەتەوە و یەکەم هەنگاو لە نازناوەکەی خۆیەوە دەستپێکردووە، هەستاوە (نالی) سەرچاوەی نالینی کردووە بە نازناوی خۆی.

2.ئەم زاتە بەوەی کە کوردبووە و بەوەی کە جاف جەفاکێش و نەحەساوە بووە بەوەی دڵسووزی نەتەوە ژێردەستە و ستەملێکراو و خاك داگیرکراوەکەی بووە و دەربەدەر کرا و تالآنکرا و بووە بەوەی کە عاشق و شەیدای خۆشەویستی بووە تیری خۆشەویستی جەرگی پێکاوە و وەك قەیس و وەلی دێوانە ئارامی لێبڕاوە و هەمیشە لە تاوی دووری حەبیبە جەرگی هەڵقرچاوە:

قەسەم بەو شەربەتی دیداری پاکەت

شەرابم عەینی ژەهری مارە بێ تۆ

لەکن تۆ خار و خەس گوڵزارە بێ من

لە کن من خەرمەنی گوڵ خارە بێ تۆ

لەکن من با وجودی ناس و ئەجناس

کەسی تێدا نییە ئەم شارە بێ تۆ

لە لای تۆ خار و خەس گوڵزارە بێ من

ئەو دوو دەردە بە ئازارە هەردووکیان لەوانەن ببنە بوومەلەرزەی ناو دەروونی مرۆڤ و مرۆڤ وەك دەواری شڕی بەر رەشەبا بهەژێنن و کانی شیعر و فەلسەفە و زانستی دەروونی پاکی تیا هەڵقوڵێنن، شاعیریش بە دەم ئۆف و ناڵە ناڵەوە وەك بولبولی دورە چڵ و دایکی کوڕ کوژراوی جەرگ بەکولێ و بەستەزمانی کۆرپە لێونبوو بە هەر چوار لایا پەلبهاوێ و هاوار بکا و بناڵێنێ، ئەوەندە ناڵە و پرمەی گریان و هەڵقرچان تیایە پەنگی خواردووەتەوە، هەر بەوە نەوەستاوە بە دەس و دەم و هاوار و شیعر دەریانبڕێ و بەگوێی خەڵکیاندا بچڕێ و دڵی بەوانە ئاوی نەخواردووەتەوە هەموو جەستە و دەروونی بووەتە ناڵە و ناوی خۆی ناوە ( ناڵی).

3. ئەو حەزرەتە بەهیمەتە ئەوەندە شارەزایی زمان و ئەدەب و ئاخاوتنی کوردی بووە کە کەس نەتوانێ زاتی ئەوە بکات بڵێ بۆ نازناوی خۆی بە ناچاری پەنای بردووەتە بەر زمانی بێگانە و لە زمانی ئەوانەوە نازناوی خۆی خواستووەتەوە و هێناوییەتی کردویەتی بە پێناسە و ناونیشانی کۆرپە جگەرگۆشەکەی خۆی کە شیعرەکانیەتی (لە جگەر گۆشەی شیعرم مەدەن مانای خراپ... هتد).

4.ئەوێك ئەوەندە  زانا و بلیمەت و شارەزا لە شێلان و بە کارهێنانی وشە کوردییەکاندا و لە جێگۆرکێ و ئەمسەر و ئەوسەری رستەکاندا ناتوانێ نازناوێك بێنێ، کوردییەکی وابێ چەند مانا هەڵگرێ و هەر لەسەر کوردێتی خۆی بمێنێتەوە و ئێمە پەی بە هەمووی نەبەین و تەنها رستە سادە ماناکەمان لێ دیار بێ و دوومانا یا زیاتر لە دوومانای لێکجیا بگەیەنێ و مەبەستیش بێ وەك وشەی (نالی).

5.وەك گوتمان حەزرەت مەبەستی ناساندنی زمانی کوردی بووە، لەگەڵ دەسەڵات نیشاندانی کوردێکدا لە هەموو ئەو بووار و بار و بابەتانەی خاوەن زمانەکانی تر خۆیانی پێوە رادەدەن و (تەبعی کوردی شەکرباری) نیشانداوە جا کەسێك بەو شێوەیە شانازی بە زمانەکەی خۆیەوە بکات و بڵێ زمانەکەی منیش ئەگەر لە زمانەکەی ئێوە دەوڵەمەندتر و وشەی پڕمانا و پڕ چێژتر و وردتر نەبێ لە هی ئێوە کەمتر نییە و (کەسێ نادان نەبێ خۆی تالیبی مانا دەکات) زمانەکەی منیش لە زمانەکانی تر زیاتر گەوهەری مانا دەردەخا و بە هەموو لایەکدا پرشنگ دەدا و هەر مانایەك و زاتێك و زانستێکت بوێ ئەوە لە زمانەکەی منی کوردا وشەکەی هەیە و ئەو وشەیە دەیبەخشێ چۆن ئەچێ بۆ نازناوی خۆی وشەیەکی بێگانە ئەخوازێ و دەستەوەستانی خۆی نیشان ئەدا و هەژاری زمانی خۆی ئەخاتە بەرچاو یان زمانی خۆی بە هەژار و کڵۆڵ دەخاتە بەرچاو، ئەی ناڵێن جا ئەگەر وایە تۆ ئەو کوردیزانە زانایەی، کوردیش پڕە لە وشەی پڕمانا بۆچی پەنات وەبەر زمانی خەڵکی بێگانە بردووە و نازناوی خۆت

**لەوان خواستووە، چا حەزرەت نە ئەوەندە خۆ بەکەمزان و زمانی نەتەوەکەی بە هەژار زانی و بێگانەی لا گەورە بووە و نەئەوەندەش بێگانەپەرست بووە شانازی بە زمانی بێگانەوە بکات تا مەبەستی لە (نالی) (نال) ی خوازراوی فارس بە مانای نەیجە یان هێڵی ناوەڕاستی قەڵەمی فارسی بووبێ و نەتەوەکەی بەرەو ئەوان پەلکێش بکا و پشتیان پێ بکاتە زمانەکەی خۆیان بەڵکو مەبەستی ناڵە ناڵ و هاوار و دەردە کورد و دەردە خۆشەویست دەربرین بووە.**

**6.لە (دیوانی نالی)دا هاتووە ئەڵێ نالی لە (نال)ەوە هاتووە و (ی) یەکە (ی)ی نیسبەتە، ئامرازی لکاوە چا ئەگەر لامەکە قەڵەوبێ و ناو بێ ئەوە مانای ناڵی ئاژەڵ ئەگرێتەوە لێرەوە بوو ئەو زاتە جێی نابێتەوە و ناگونجێ ئەگەر فیعل بێ ئەبێ بگوترێ نالەیی نیسبەت ببۆ لای نالأندن نەك نالی.**

**ئەمەش سەیرە، سەیرەکەش لەوەدایە هەستاون بە کێش و تەرازوی زمانی عەرەبی زمان و رێزمانی کوردیان کێشاوە و بەڕبەی ئەوان دانەوێڵەی ئێمەیان پێواوە بێ ئەوەی لا لەو جیاوازیانە بکەنەوە کە لە نێوان ئەو دوو زمان و رێزمانەدا هەیە کە ئێرە شوێنی ئەو باسە نییە، ئەوەندە نەبێ کە ئەبێ بزانین ئەو وشەیە کردار و بەمانای نالأندنە ئەڵێن (ناڵی) واتە نالأندی وەك نەناڵی، وەك بناڵی، هەقە بۆی (بناڵی)، لێرەیا (ی) یەکە (ی)ی نیسبەت نییە (ی) ئامرازی پەیوەندیەو لەسەر فیعل کردارە لەسەر کێشی (باری)یە چۆن ئەڵێی (باران باری = مەلا خدرنالی) لە زمانی کوردیا کرداری زۆر لەو بابەتە هەیە کە(ی)ی ئامرازی پەیوەندی پێوەیە (هاڕی– قاڕی...هتد).**

**7.لەوەش سەیرتر ئەوەیە کە لە دیوانی نالیدا ئەڵێ بورهان قاتیع وا ئەڵێ، بەڵام ئەوەی نەهێناوەتەوە کە هەر لە هەمان شوێن بورهان لەسەری ئەڕوا و ئەڵێ لەسەر کێشی سال (نال بر وزن سال)ە، باشە ئەگەر لەسەر ئەو بنچینەیە داواکەی خۆیان دامەزراندووە دەبوو بیانگوتایە سال لەجیاتی ساڵ چونکە ئەوان ئەڵێن بورهان ئەڵێ مانای وایە کەوا بوو ئەبوو بیشیانگوتایە لەسەر**

(وەزنی) کێشی (سال)ە تا بمانگوتایە یان ئەبێ (سال)یش بە لامی بچوك بخوێنینەوە یان ئەگەر (سال) بە لامی قەڵەو ئەخوێنینەوە ئەبێ (نال)یش بە لامی قەڵەو بخوێنینەوە جا ئەگەر ئەڵێین لە زمانی فارسیدا لامی قەڵەو نییە بۆیە گوتویانە (ساڵ) کەوابوو لە(نال)یش کە لەوێ بینراوە ئەوە لامی قەڵەو نییە و ئەگەر بیهێنینەوە ناو زمانی کوردی ئەبێ ئەویش بە لامی قەڵەو بخوێنینەوە بڵێین (ناڵ) تاوەك لەزمانی فارسیدا کێشیان یەکە لە زمانی کوردیدا ببنە یەك کێش.

8.پێویستە بەراوردێکی دادوەرانە بکرێت بزانین لە سەرجەمی شیعرەکانی حەزرەتدا بە خۆداهەڵدان و بەشان و بای خۆداهاتن و شانازیکردن بە خۆیەوەی زیاتر تیایە یان باسی دەردەسەری و گوزارشکردن لە ئێش و ئازار و میحنەت و دەربەدەری و ئۆف و ژان و کزەی ئاشق و فرمێسك و گریان و بوون بە قوربانی زیاتر تیایە، بێگومان ئەمیان زیاترە کەوا بوو (نالی) نالآندن زیاتر بە هێز و جێمتمانەتر و ئامانجترە بۆ بوون بە نازناو لە (نال)ی داتاشراوی بە مانا بە خۆداهەڵدان و شانازیکردن بەخۆوە لە شیعرەکانی ئەوا دەرد و ئێش و ئازاری ئەوین و ئەو بێزاریەت بە تەواوی بوو دەرئەکەوێ و ئەزانی چ ئازارێکی کوشندە و جەرگ بری پێوەیە بە شیعرەکانی ئەو زیاتر پەی بە ستەمدیدەی گەلەکەی و ماڵوێرانی و کاولکاری وڵاتەکەی و داگیرکراوی نیشتمانەکەی ئەبەی و ئەزانی ئەگەر کوردستانی ئەوسا بەحاڵتروسکایی تیا بووایە بوو تیاحەوانەوە ئەو زاتە خاوەن ئەوینەی حەبیبە کوردستانی بەجێ نەئەهێشت و سەری خۆی هەڵنەدەگرت و رێی هات و نەهاتی نەدەگرتە بەر کە هەموو ساتێکی ژیانی هەر ئۆف و گریان و هەموو کاتێکی هەر هاوار و ناڵین بووە:

مەڵێن کەڵکی نەبوو، رۆیی، جەهەننەم

سەرم قەڵغانە بۆ تیری قەزاتان

سەفەرمان چونکە رێی هات و نەهاتە

دوعامان بۆ بکەن ئێوە و خوداتان...
شکاری وەحشیان بەس دەستەمۆکەن
نەوەک بەر بێ شکاری خانە زاتان

بەس ببنە نۆکەری داگیرکەران و بێگانان وابکەن بیگانە نەیەنە خاکی خۆتانەوە و لە خاك و ولاٚتی خۆتاندا بەخێویانکەن و چاودێریانکەن و دەستەمۆیانکەن ئەگەر وا بکەن ئەوا نێچیرە ماڵییەکەی خۆتان لە داخا ئەڕوا و سەری خۆی هەڵئەگرێ و ئەفڕێ و نایبیننەوە.

9.ئەوەی کە ناکۆکی تەنها دووکەسی لە سەرنییە ئەوەیە کە حەزرەت ئەوەندە بە دەسەلاٚت و بالاٚ دەستبووە لە هەر چوار زمانەکەدا و سەر قافڵەی رەوانزانان و رەوانبێژانی ئەو زمان و ئەدەبانە بووە کە هەستاوە هەموو ئەو گەیاندن ئاوەر و رەوانبێژیکەر و جوانکاری و رازاندنەوانەی شاعیرانی تری غەیری کوردزمان کە ئەدەبی خۆیان پێ رازاندووەتەوە و دەوڵەمەند کردووە ئەمیش لە زمانی خۆیا دەری هێناون تاوتوێی کردوون و خستوینەتە روو ئاشکرای کردوون و نیشانی دۆست و دوژمنی داون.

لە کتێبی دیوانی نالی و شوێنەکانی تردا ئاماژە بۆ هەموو هونەر و بابەت گەیاندن ئاوەر و رەوانبێژی و جوانکارییەکانی ناو شیعرەکانی حەزرەت کراوە ئێمە بە پێویستی نازانین لێرەیا لەم نووسینە سەرپێییەدا یەکە یەکەی شیعرەکان بهێنینەوە و بابەتەکانی تیا بخەینە بەر چاو و رونیکەینەوە تەنها ئەوندە بەپێویست ئەزانین بوو داواکەی خۆمان کەبلێین یەکێك لەو بابەتە جوانکاریانە (التوریە) واتە وشەیەك دوو مانا بگەیەنێ و ماناییەکیان لەناو خەڵکا دیار و لەسەر راهاتووبێ و ماناکەی تری نەختێك دوور و لەسەر راهاتوو نەبێ و بێژەر یا دانەر مەبەستی مانا دوور و لەسەر رانەهاتووەکە بێ وەك

هاتنی وشەی (نالی) لە شیعرەکاندا کە گەلێ جار وەك مانای نالە نالی لێ وەردەگیرێ مانای نازناوی حەزرەتیشی لێ وەردەگیرێ کە نازناوەکە مەبەستە.

(نالی)یو سینەیی بێ کینەیی چاکم، ئەمما

چاکی دامەن تەڕم و وشکە سەرابی عەمەلم

هەرچەندە لە دیوانی نالیدا کە بۆ خۆیان ئەڵێن دەستکاریمان کردووە نوسراوە (نالی)یو (یو)ی بۆ دانراوە بەڵام راستیەکەی بێ (یو)ەو مەبەستی ئەوەیە گەوهەری ئەو بابەتە زانستییەی ئەدەب لە زمانی کوردیدا نیشان بدات و (ناڵی) هەر دوو مانەکەی تیا وەرگیرێ و هەم بۆ ناڵینی سینە بشێ و هەم بۆ بانگکراو بشێ و نازناوی خۆی بانگ بکات و بڵێ هۆ ناڵی.

یەکێکی تریان جیناسە بە هەر دوو بەشەکەیەوە، جیناسی تەواو، هەر دوو وشەکە لە هەموو رویەکەوە وەك یەکن، بەڵام ماناکەیان جیایە وەك جنان، جنان یەکێکیان بەمانای دڵ و ئەویتریان بەمانای بەهەشت، حەزرەتیش یەکێك لە دەرخەری بلیمەتەکانی ئەوەیە کە نازناوێکی هەڵبژاردووە ئەم جوانکارییە هونەرییە ئەدەبییەشی تیایە ئەویش وشەی (ناڵی)یە لە شیعرێکیا وەك لەمەودوا ئەیهێنینەوە لە یەك جێدا بە مانای ناڵ و بە مانای ناڵەو بەمانای ناڵی نازناویشی دێ یا لە ژێرپێی ناڵە ناڵی (ناڵی)یە، باشە ئەگەر لێرەیا لامەکە بەسووکی بخوێندرێتەوە ئەو هونەر و باڵادەستی و فیکرتیژی و جوانکارییەی تیا ئەبێ، ناڵی بەبێ حەوتی سەر لامەکە ئەو چەندمانایە ئەگەیەنێ...؟ بەکورتی یەك شوێن شك نابەم لە شیعرەکانیدا لە ناو (ناڵ) سووك لامەدا جێی ئەو هەموو جوانکاری و فکر تیژیەی حەزرەتی تیا بێتەوە بەڵام بە پێچەوانەوە سەرەرای هۆی ئیلهامی شیعری و هۆ و پاڵپێوەنەری بزاوتنی شیعری کە لە نالیندایە هەموو بابەتە هونەری و جوانکاری و رەوانبێژی ئەدەبیش دەگرێتەوە

لە ناو شیعرەکانی نالیدا لە هەر شوێنێکا کە سەیر ئەکەی ئەبینی ئەگەر (نالی ) بە لامی قەڵەو بێ کۆمەڵێك هونەر و مانا لە خۆئەگرێ، بەڵام ئەگەر بە لامی سووك بێ هەمووی لێ هەڵئەوەرێ.

10. ئەگەر (ی) یەکە (ی)ی نیسبەت بۆ لای (نالی) بە مانا نەیجە و یان هێڵی سەرقەڵم و شتی وای فارسی بێ ئەوە لە زمان و فۆنەتیکی کوردیا خوێندنەوەکەو ئاخاوتنەکە دەگوردرێ، سەیریکە ئەگەر بڵێین باران باری بەسووکی تەلەفوز بە(ی) یەکەی باری ئەکەین بەڵام ئەگەر بڵێین گوێ درێژەکە باری یە و هی بارە ئەڵێین (باری ی) گوێ درێژی باری، کە وا بوو بەپێی قسەی ئەوانبێ ئەبێ بڵێین (ناڵی ی) نیسبەتە بۆ لای (ناڵ) نەك (ناڵی) چونکە لە ئاخاوتن و فۆنەتیکی کوردیدا (ی) ی ئامرا زی لکاندن بە درێژی ئەخوێندرێتەوە و تەلەفوزی پێ ئەکەی کەسیشمان نەدیوە و لە کەسیشمان نەبیستوە بڵێ (نالی ی) هەر ئەڵێن (ناڵی) وەك ئەوەی بڵێ ی فلانە کەس نالی نالاندییان وەك نە نالی ئێمەش ناڵێین (نالی) بردنەوەیە بۆ لای ناڵ ی ژێر پێڵاو و ناڵی ئاژەڵ.

لە (دیوانی نالی)دا هاتووە ئەڵێ ناشتوانین بڵێین نالییە نسبەت دراوەتە پاڵ (نالە)ی بە مەعنا هاوار چونکە نیسبەتە لای نالە (نالەیی)یە نەك ناڵی. لێرەیا ئەم دێرە مانای نایەت چونکە ئەگەر مەبەستی وا بێت گوایە نالی نابێ ئەوە وانییە لەبەر ئەوەی بە یا یەکەوە ئەبێتە ناو نەك بەبێ یا یەکە و پاشان یا یەکەی پێوە بلکێنی ئەگەر (ێ)یەکیشت لێ کردەوە ئەبێتەوە (ناڵ) ی رووت لە مەبەستی ئێمە دەرئەچێ، ئەڵێ نیسبەتە بۆ لای ناڵە نەك ناڵی باشە چۆن نالی بە(ی) یەکەوە نیسبەتە ئەڵێ (ناڵی) ئەمە خولانەوەی بێ بڕاوەنەیە. ئێمە ئەڵێن (ناڵی) فیعل کرداری رابردووە بووەتە ناوی ئەو شاعیرە کە ئەمەش لە هەموو زمان و ئەدەبەکاندا هەیە و روویداوە پێی ئەڵێن خوازراوی فعلی واتە لە سەرەتایا فعل بووە پاشان بووەتە ناو و بۆ ناو بەکارهاتووە لە رێگەی گواستنەوە و خواستنەوەوە وەك (تأبگ شرا)ی زمانی عەرەبییە و ناڵیش کە

بووه به نازناو له هەموو شوێنێکدا جێی ئەبێتەوه نەك وەك ئەو بۆچونەی که پێی وایه ئەگەر نالّی وەرگێڕاوی کردار بێ له هەموو شوێنێکدا جێی نابێتەوه و ناگونجێ ئەبێ به نالّی بخوێنرێتەوه تا لەو شوێنانەدا بگونجێ مادام بوو به ناو ئیتر نالی بێ یان نالّی جیاوازی نییه و وەك یەك دەگونجێ بۆ ئەگەر له عەرەبیدا ناوێك له بنەرەتدا فعل بێ و کرابێت به ناو که بوو به ناو نابێته بانکرا و بکەر و بابەتەکانی تر، له (دیوانی نالی)دا هاتووه گوایه بەڵگەی بەهێزی ئەوەی که نالییەو نالّی نییه واته له ناو وەرگیراوه و له (فیعل)کردار وەرنەگیراوه ئەمەیه که نالّی لەم شیعرەدا جێی نابێتەوه که ئەڵێ:

وەره سەیری خیابان و بەیازی دەفتەری ( نالی )

که سەف سەف، مەسرەعی بەرجەستە، ریزی سەروی مەوزونه

گوایه لێرەیا ناکرێ بڵێن (نالّی) چونکه مانای نالاندن لێرەیا جێی نابێتەوه ئەمه له کاتێکدایه که مەبەست له وشەی نالّی تەنها نالاندن بێ بەلام خۆلێره مەبەست نالاندن نییه...؟ مەبەست له وشەی نالی نازناوەکەیه ئینجا بۆ جێی نابێتەوه چ بڵێی نالی چ بڵێی نالّی هیچ له مەبەستەکه ناگۆڕێ ئینجا له سەری ئەڕوا و ئەڵێ (یان نالّەی فارسی که ئەویش به مانای نالّینه...) لێرەشا توشی دژ بەیەکی و ناکۆکی ناوخۆی بووه دژ بەیەکیەکەش له وەدایه یەکەم ئەڵێ نالی جگه له نازناوییەکەی له هەموو شوێنێکدا ماناکەی تریش ئەگەیەنێ و ئەشێ بۆ مانا بنەڕەتییەکەشی جاریێ ناتوانین ئەو بۆ چوونه به بەڵگەی پێ سەلماندن دابنێین چوونکه زوربەی زۆری نازناوەکان له زۆربەی شیعری شاعیراندا جگه له نازناوی مانایەکی تر لەو شوێنانەیا ناگەیەنێ ئەمەش نابێته هۆی ئەوەی که نازناوەکه هەڵه بێ لەلایەکی کەوه که ئەڵێی له هەموو

شوێنەکاندا وشەی (ناڵی) وشەی لە هەموو شوێنەکاندا لە جێی خۆی نییە بە پێچەوانەوە لە گەلێ شوێندا نالی مانای نالأندنی لێ وەردەگیرێ وەك ئەڵێ (بە ئوسوڵی ناڵە (ناڵی) کەوابوو وشەی لە هەموو شوێنەکاندا بەم بەیتە هەڵدەوەشێتەوە.

دووەم لەوەدایە کە ئەڵێ بە مانای ناڵین ئەی کە (نال)ی بە مانا ناڵێین ئەگونجێ بووچی ناڵی کوردی بە مانا ناڵین ناگونجێ بۆ بە فارسی ئەگونجێ یا لە فیعلەوە وەرگیرابێت بەڵام بە کوردی ناگونجێ و لە فیعل وەرناگیرێ لە کاتێکا سەرەڕای ئەوەی هەردووکیان بە مانای ناڵە ناڵ زمانە کوردییەکە و بە کوردییەکەی زۆر لەبارترە لە نالە فارسییەکە، ئەمانە و بێینە سەر شیعرەکانی خودی نالی بزانین لەوێدا بوو خۆی چیمان پێ ئەڵێ و چۆن نازناوی خۆیمان بوو روون ئەکاتەوە، سەیری ئەم دوو بەیتە بکەن بزانن بۆ(ناڵی) زیاتر دەستئەدا و ئەگونجێ یان بۆ (ناڵی) واتە بە (نالی) ئاخافتن بکەین و بیخوێنێنەوە جوانتر و رەوانتر و راسترە یان بە (ناڵی):

لەگەڵ مورغی چەمەن (نالی) دەناڵێ

کەیەعنی عاشق و هەمفەرد  و فەردین...

رۆخی تۆ گوڵێکە سەد وەک هوزاری عاشق ئەکا ئەمما

لە هەموو چەمەن دیارە بەئوسوڵی ناڵە (ناڵی)

لە بەیتی یەکەم دا ناڵی دەناڵێ لێك نزیکترە وپڕماناترە و پڕ جوانکاری وێکچوونترە یان نالی دەناڵێ ئەگەر ناڵی بێ ئەگونجێ مانای ناڵین بێ و لەگەڵ دەنالی یەك دەگرێتەوە و ئەکرێ دەناڵێ بکرێت بەدەناڵی واتە هوناڵی دەناڵی بەڵام لەگەڵ نالی بە لامی سووك ئەو جوانترە و لێك نزیکی و جوانکاری و وێکچوونییە پەیدانابێت و دەنالی ئەو مانایە ناگەیەنێ.

لە بەیتی دووەم دا (ئوسولی نالە نالی) ئەگەر ناڵی لامی قەڵەو بێ ئەوە دوو مانا دەگەیەنێ و لایەك تەورییە و لایەك جیناسی تیا دێتەدی ئەشێ بگوترێ نالە ناڵی ئەشبێ مەبەستی لە ناڵی نازناوەکەشی بێ بەڵام لە ناڵی بە لامی سووکدا ئەو جوانکاری و دووماناییە نایەتەدی و خوێندنەوەکەش ڕەوان و لەسەرزار فەسیح و مانا تەواو نابێ، لەم بەیتەشدا بە ئاشکرا وشەی نالی نالەنال و هاوار و ئۆف ئەگەیەنێ و ڕێی هیچ مانایەکی تر نادا و هیچی تری تیا جێی نابێتەوە.

بۆ زولف و روخ و ئەبرۆی چوون زوڵفی سیاتان

عالەم وەکو (نالی) هەموو با ناڵە و ئاهن

لێرەشا (ناڵی) بە لامی قەڵە و گونجاوتر و لەبارترە و زیاتر مانای دوو مەبەستەکە ئەگەیەنێ لە (نالی) بە لامی سووك ئەگەر بڵێی (ناڵی) بە لامی قەڵەو یەکسەر لەگەڵ ناڵە و ئاهە یەکدەگرێتەوە.

دوور لە تۆ ئیدی مەپرسە، قوربان

حاڵی (ناڵی) کە نە مرد و نەژیا

لەم بەیتەدا جیناس لە نێوان حاڵی و ناڵی دا هەیە بەڵام ئەگەر بە نالی لامی سووکی بێ هێمای لامی قەڵەو بخوێنرێتەوە نە ئەو سەجعە و نە ئەو جیناسەی تیای بێ جگە لەوەش بەشی دووەمی بەیتەکە خۆی وەڵام دانەوەی پرسینی حاڵ و ئەحواڵە و ناڵی ئەڵێ بەوەی کە حاڵی هەمیشە لە ناڵە ناڵ و ئۆف و ئاهدایە نە مردووە و نە زیندووە، مردوونییە لەبەر ئەوەی مردوو بێدەنگ و هەست و خواست و بێ جووڵەیە، بەڵام ئەم بێدەنگ نییە بەڵکو هەمیشە لە هاوار و ناڵەناڵدایە، ئەو زیندووەش نییە چونکە زیندووی ڕاستەقینە ئەوەیە هەست و خواستی وای هەبێ ئاگای لە خۆی و دەوروبەری

هەبێ بەڵام ئەم راستە ئەناڵێنێ و ئەنووزێتەوە بەس نە ئاگای لە خۆیەتی ونە ئاگای لە دەوروبەریەتی، لێرەیا نالی گوتەیەکی رەسەنی کۆنی باوی کوردەواریمان دێنێتەوە یاد ئەویش ئەوەیە کەسێ کاتێ لە حاڵەتی گیاندان و سەرەمەرگدا بێ پێی ئەڵێن نەمر و نەژی، جا باشە ئەم هەموو رەوانبێژی و جوان کاریە نایابە لە (نالی) بە لامی سووکدا دێتە دی نالی لامی سووک ئەبێتە وەڵام دەرەوەی پرسیاری حاڵ.

نالی خەبەری بێ ئەسەری غاییە ئەمما

ناڵێکی حەزینە لە موناجاتی سەحرەدا

سەیری ئەو سەجع و وەکیەکی و جیناسە تەواوەی لە نێوان ناڵی و نالیکیدایە بکەو لێی ورد بەرەوە، لێرەشا سەرەڕای رەوانبێژییەکە و جوانکاریەکە کە تەنها بە وشەی ناڵی بە لامی قەڵەو دێتە دی ئەوەشی تیایە ئەوە بسەلمێنێ کە وشەی ناڵی لە جیاتی ناڵاندنێك بەکارهاتووە و ئیتر جێی قسەی ئەو کەسانە نەما کە ئەڵێن ئەگەر ناڵی بووایە ئەبوو بیگوتایە نالین یا نالاندن و حەزرەت نازناوی خۆی بە یەکێ لەم دووانە دەربڕیایە ئەوەش بەوە هەڵە و شتەکانی کە دیارە لێرەیا ناکرێ بخوێنرێتەوە نالێکی بە لامی سووك ئەوە هەمووی لەسەری رێکن و مشتومڕی تیایە رێکەوتن و قسەی تیا نییە کە وا بوو (ناڵی)ش (ناڵی)یەو (نالی)نییە.

ئەمەو خۆ ئەگەر بەیتەکە بەم شێوەیە بیخوێنەوە وەك لە هەندێ دەستنووسدا هاتووە و بڵێین نالی خەبەری بێ ئەسەری غەیبی ئەما واتە دوو مانا بگەیەنێ یەکیان خەبەری بێ ئەسەری واتە تەنها ناڵی و لالآیەوە و کروزانەوە بوو بەڵام چ لالأنەوە و ناڵە ناڵێك و نالەناڵێکی حەزین و غەمناکاوی و کروزانەوە لەو جۆرە نالین و پارانەوە و لالأنەوەی سووفی مەشرەبان و لە خوا ترسانەی دەمەو بەیانیاندا کە لە سەحەرا دەمەو بەیانیاندا ئەپارێنەوە یان

ماناى وايە ئەى ناڵى تۆ خەبەرى بێ ئەسەرى غەيبى بەڵام ئەوەندە هەيە وجودێكت هەيە ئەويش بە ئەسەرى نالين، غەمناكى و لاڵانەوەى موناجاتى دەمەو بەيانيان ئەزانرێ لێرەشدا ئەم مانايانە لەنالى بە ماناى لامى سووك نايەتە دى جگە لەوەى ئەو مانايانە نايەنە دى هيچ جوانكاريەك لە نێوان (نالى) و (ناڵێكى) دانييە:

تاچاكى نەكەى پڕ لە هەواسينەى (نالى)
وەک زەنگەڵە ئاوازى دەنگى دڵى نابێ

ئەم بەيتەش ئەوە دەرئەخات كە نازناوەكە (ناڵى)يەو (نالى)نييە چونكە ئەڵێ تا چاك پڕ هەواى نەكەى سينەى نالى وەك زەنگولە دەنگى دڵى نايەت لايەك ئەوە ئەگەيەنێ كە سينەى پڕگريان و ئاهو نالە نالە (سينەى نالى يە سينەى بە ناڵى بەنالاوى هەميشە بە ناڵە نال) لايەكيش سينەى ناڵى ئەگەيەنێ كە مەبەستى خۆيەتى لەولاشەوە ئەگەر لێى وردبينەوە هەستاوە پاڵپێوەنەرى دەربڕى شيعرى بە شوێنەكەيەوە نيشانداوە واتە نالين و شوێنى نالينەكەى نيشانداوە، دەريخستووە كە شوێنى دەربڕى نالين كوێيە ئەمەش يەكێكە لە رەسەنى و قسەى پێشينانى كورد كە ئەڵێ سينەى بێكينە يان سينەساف يان سينەپيس و زۆربەى كارە دەروونييەكان بۆ سينە دەبەنەوە هەروەك بۆ دڵيشى دەبەنەوە لە زۆر جێگاى شيعرى شاعيرانى تريشدا ناڵە ناڵ و هاوار براوەتەوە بوو سينە و سينە بە شوێن لێوە هات و سەرچاوەى دەزانن.

جێى خۆيەتى لێرەدا بليمەت و زانابيەكى ترى حەزرەت بە دەرخەين ئەويش ئەوەيە كاتێ مرۆڤ هەناسەى خۆى هەڵدەكێشێتەوە و سييەكانى خۆى پڕ با ئەكات كار ئەكاتە سەر پاڵەپەستۆى خوێن و دڵ پەلەپەل ئەكات و دەكەوێتە تەپەتەپ حەزرەتيش ئەو كردار و پرۆسيسەى بۆ پڕبوونى

**عەشقەکەی خواستووەتەوە و خوازراوی هێناوە و بۆ خوازراوەکەی باسنەکردووە جا ئەگەر (نالی) بە لامی سووك بێ ئەوە ئیزافەکە هەر بۆ لای نازناوەکە ئەبێ و یەك مانا ئەدات ئەویش سینەی نازناوە سینەی شاعیرە حەزرەتیش کە لە هەر وشە و رستە و بەیتێك چەند مانای پێچەوانەوە و چەندین مانا و مەبەستی تێخزاندووە چۆن ئەبێ لێرەشا ئەو هەموو مانا و مەبەستەی کە ئێمە بۆی ئەچین مەبەست نەبووبێ کە ئەوانەش بە (ناڵی) بە لامی قەڵەو ئەگەیەنرێت نەك لامی سووك:**

**ناڵەناڵی (ناڵی)یە واخەلقی کردە زەلزەلە**

**یا نەخۆحەشرە گوناهکارە وەها هاواریە**

**بە ئاشکرا ئەوە ئەگەیەنێ کە سەرچاوەی بۆ هاتن و ئیلهامی شیعری ئەو زاتە قرچەی جەرگ و کوڵان و برژانی دەروونبووە و هەمیشە لە سووتان و ئاهو ناڵەدا بووە بۆیە نالی وەرگراوی سەرچاوەی (نالین)ی کردووە بە نازناوی خۆی و پڕ بەدەم هاوار ئەکات هۆ خەڵکینە ئەوەیە نالی و ئەوەیە حاڵی نالی و ئەوەتا ژیان و گوزەرانی نالی بەم جۆرەیە ناڵە ناڵ و هاوار هاوار بەولاوە هیچی تری تیا نییە، هەر لەم بەیتە یا دیسانەوە جیناسی تەواو لە نێوان ناڵی و (ناڵی)دا هەیە کە ئەڵێ ناڵە ناڵی (ناڵی)یە خۆ ئەگەر نالی لامی سووك بووایە نەك لە رووی ماناوە لەگەڵ ناڵە ناڵی دا ڕێك نەدەکەوت لە رووی جوانکاریەکەوە ئەوەندە تەوا و ئەبوو بە ئەندازەی ناڵی لامی قەڵە و سەیریکەن چ بیرتیژی و دەسترۆیی ئەدەبی لە جووتکردنی ناڵی و (ناڵی)دا هەیە چ رەوانبێژێکی تیایە کاتی جووڵەی زمان لەجووڵەی ناوەراستەوە ناگۆڕینەوە بۆ جووڵەی سەری زمان کە کەلێن پەیدابکات لە رەوانی رستەدا زانایانی زمان و رێزمان ئەڵێن هەر وشە و رستەیەك زمان تەتەڵەی تیاکرد ئەوە لە رەوانی ئەچێتەدەر و بەناڕەوان لە قەڵەم ئەدرێت و ناڵ و ناڵی و نالی سووك بە یەکجاری ئەگاتە ئەو رادەیە بەڵام**

به خوێندنەوەی نالی لامی قەڵەو ئەو تۆزە تەتەڵەیەش پەیدا نابێ و لەسەر زمان خۆشتر ئەبێ:

لەگەڵ مورغی چەمەن نالی دەناڵێ
کەیەعنی عاشق و هەمفەرد و فەردین

نالی لەگەڵ پۆڕدا دەناڵێ کە دەناڵێ مانای وایە (هەمفەردین) هەر ئێمەین تەنها هاوڕێی یەکتربن لە ناڵیندا و تۆ لەناو چەمەن و شینایی و باخ و رەزدا تەنهایی و منیش لەناو گرۆهی مرۆڤدا یان عاشقاندا تەنهام و بە تەنها دەناڵم کەوابوو هەمفەردین لەوەیا کە تۆ لە ناو باڵندە و گوڵ و چیمەندا بە تەنهایی و منیش لەناو عاشقان و مرۆڤدا بە تەنهام هەمفەردین چۆن بەو کەسەی خەڵکی شارەکەتە ئەڵێی هەمشاری (هەمدەردیە هاودەرد) لەو لاشەوە کە لە جیهاندا بە تەنها هەر ئێمە بە جووت دەناڵنین و فغان و گریان ئەکەین و کەسێکی کە لەگەڵمان نییە و وەك ئێمە نییە (فەردین) تەنهاین و هەر خۆمانین جارێ لە رەوانبێژی و هونەری خواستنەوە و بەکارهێنانی ئەوەی تایبەتمەندی لێ خوازراوی تیایە گەڕێ و ئەوە لە کاری هەنوکەی ئێمەدا نییە، مەبەستی ئێمە لە پەنابردنە بەر ئەم بەیتە سەلماندنی داواکەمانە  کە ساغکردنەوەی نازناوی حەزرەتە بە پێی بۆچوونمانە لە توێی شیعرەکاندا، ئەم بەیتەش بەڵگەیەکە ئەگەر لێی وردبینەوە سەیری (نالی دەناڵی) بکەین چۆن هەم نالاندنی گەیاندووە هەم جیناس لە نێوان نالی و دەنالی بەڵام ئەگەر نالی بە لامی سووك بێ ئەودوو لێ وەرگێراو و مانایە نادات بەدەستەوە:

چ شیرینە ختوتی دەوری لێوت
بەڵێ مەعلومە خۆشە خە تتی یاقوت

هە(نالی) بەڵکو بیکێشی بەناڵین
بناڵە دامەنیشە مات و مەبهوت

خالی نییە (نالی) دڵەکەت ساتێ لە هیجران
تاتاری وجودت نەپسێنێ مەلەکولموت

لەم بەیتانەدا یەکەم لە رووی ماناوە سەیری نالی و بەنالین و بناڵە بکە چ یەکگرتنەوەیەکیان هەیە لەسەر راستەڕێی نالین و هاوار و لالانەوە. چۆن نالی ویستویەتی بە تیرێ دوو نیشانە بشکێنێ و بە وشەیەك دوو مانا بنوێنێ و دوو مەبەست بە یەك وشە و لەیەك کاتا بدرکێنێ و بۆ خۆی لەگەڵ خۆیدابێ و بە خۆی مەبەستی دڵی بدوێنێ ئەڵێ وچان مەدە لە نالین و لالانەوە بەڵکو سائەمە هات و رێکەوتە بەزەییەکیان پیا بێتەوە بەو نالین و لالانەوەیە رابکێشی و کەمانگیری کەی کە وا بوو دەستەوسان و دەستلەسەر ئەژنۆ و غەمبار و کزو مەلول دامەنیشە بناڵە بناڵە تاتروسکاییەکت لێدەردەکەوێ و رونایییەك بەدی ئەکەی و دەرویەکت لێئەکرێتەوە و ئاوڕێکت لێئەدرێتەوە:

جا ئەم یەك بەندی و زەخیرەییە تەنها لە (ناڵی) بە لامی قەڵەو دەکەونەوە سەر یەك و یەکانگیر ئەبن دەنا لە نالی لامی سووکدا نین و نابن و ناگەنەوە یەك لە رووی وشە و جوانکاریشەوە لە نێوان خالی و نالی کە لە بەشی سێیەمدایە جوانکاریەکی بەرچاو زانستی هەیە و جووڵەی زمان بەبێ گواستنەوە و تەتەڵە کردنەوە کە مەرجی رەوانبێژی تیا دێتە دی، هاتۆتەدی بەڵام بە لامی سووکی نالی ئەوەی تیا نییە سەیری خالی و نالی و دڵە لە هەرەسێکیان زمان لە جووڵەکەیدا لەسەریەك شوێنی مەڵاشووە بەڵام ئەگەر بە لامی سووك بێ نالی ئەوە قورس ئەبێ و زمان لە مەڵاشووەوە بۆ سەری زمان و

بنی ددانی پێشەوە و جارێکی تر بەرەو مەلاشوو ئەگەڕێتەوە خۆ ناشکرێ بیر لەوە بکرێتەوە کە خوانەخواسە ئەو زانا بلیمەتە لەو شوێنانەدا بە ناچاری و دەستکورتی و بێدەسەلاتی وای هێناوەتەوە و نەیتوانیوە لەوە زیاتر و چاك تر بهێنێتەوە ئەو جۆرە هەژاری و دەستکورتییە ئەدەبی و شیعرییە تەنها بۆ ئێمە مانان نەك بۆ کەسانی موعجیزە هێنەر و سەرسووڕهێنەر و داهێنەری وەك حەزرەتی نالی ئەو زاتە هەر وشەیەکی دانابێ زۆر زیاتری تیایە لەوەی کە ئێمە بۆی ئەچین و تێی ئەگەین:

## سەوتی نەغمەی بولبولە یا چەهچەهەی خڕخاڵییە
## دەنگی سوولە یا لەژێر پێی نالە نالی (نالی)یە

ئەگەر بێت و بەدرێژی لەسەر وردەکاری حەزرەت بڕۆین لەم بەیتەدا ئەبێ زیاتر لە چەند پەڕەی لەسەر بنووسین و ئینجا بتوانین لە کەناری دەریاکەوە هەندێ گەوهەری ناوی نیشانبدەین، بەلام تەنها بایی مەبەستەکەی خۆمان لێرەدا جڵەوی قەڵەم شلئەکەین و لەدوورەوە پەنجەی بۆ ئەبەین و کوڵی سانەوە لە دەوری ستوونی دەخەین، حەزرەت هاڕەی دەنگی زرینگەی خڕخاڵەکەی بە دەنگی خۆشی کە ناچە وێکچواندوە و چەهـ چەهە کە تایبەتە بە پوڕ ـ کناچەوە بۆ وێکچواندوەکەی داناوە و بەکارهێناوە و وێ چوەکەی باس نەکردوە لە هونەری ئەدەبی و ڕەوانبێژیدا یان ڕەوانگەیاندندا بەم جۆرە هونەرە دەگوترێ خوازراوی شاراوە و بۆ ئەوە بەکاردێت کە وێچوەکە لەو تایبەتییەدا لە وێچواوەکە بە هێزتر و زیاترە بەم پێیە دیارە لای شاعیر هاڕە و زرینگەی خڕخاڵەکە لەچەهچەهەی کناچە خۆشترە، هونەرێکی تری ئەم بەیتە لەوەدایە کە دەریخستوە زرینگەی پاوان و خڕخاڵ دوو جۆری هەیە یەکێکیان کە بە سووکی ئەڕوا و بە هێواشی و لەسەرخۆ هەنگاو ئەنێ دەنگەکەی بڕان و

لێکبڕاییەکی تێئەکەوێ وەك دەنگی بولبول ئەویتریان کە بەپەلە و بە توندی هەنگاو ئەنێ پێئەدا بە ئەرزا دەنگێکی درێژی دەنگدانەوەی لێپەیدا ئەبێ وەك دەنگی پوڕ و کناوچە جا حەزرەت باسی هەردوو جۆرەکەی کردوە و بوو هەر جۆرەی وێچواویکی داناوە (دەنگی سوولەیا...) سوول جۆرە پێڵاوێکی ژنانەیە و زیاتر ژنەخانەدان و دەستڕۆیشتوو کچانی ماڵە ناسراو و هەبووەکان لە پێیان ئەکرد و ناڵیان لە بنەکەی ئەدا ببۆ ئەوەی قایم بێ و لە ڕۆیشتندا تەقەی بێ لە هەندێ شوێنی کوردستان کەوشیشیان پێی ئەگوت بەڵام لە هەندێ شوێنی تری کوردستاندا جیایاندەکردنەوە لێك و کەوش زیاتر بۆ پێڵاوی پیاو بەکار ئەهات یان زیاتر بەو پێڵاوە دەگوترا کە بنەکەی لووس و بێ پاژنە و سەرەکەی تا نزیکی قولەپێ و قاپەڕەقەی پیاو دەهات ناڵیان لە بنەکەی ئەویش ئەدا بۆ ئەوەی مرۆڤ نەخزێ، جا ناڵی ئەفەرموێ ئەو ناڵە ناڵ و نووزەنووزەی کە گوێتان لێئەبێ ئەوە دەنگی سووولەکەی حەبیبەیە یان ناڵەناڵی ناڵچەکەیەتی لەژێر پێیدا ئەمەش ئاماژە و کینایەیە بۆ گورجوگۆڵی و توندڕۆیی حەبیبە. حەبیبە ئەوەندە گورجوگۆڵە لە ڕۆیشتندا ناڵچەی سووولەکەی لە تاوا ناڵە ناڵییەتی و لە ژێر پێیدا ئەناڵێنێ یان وامەزانن ئەو زریکە زریك و ناڵەناڵەی گوێتان لێیەتی هەر هی ناڵچە وسوولەکەیەتی ئەوە نووزە و ناڵەناڵی نالییە لە ژێرپێیدایە و بە سوولەکەیەوە چوووەتە سەری:

من بەو برژانگە بۆیە خۆشحاڵم

خاکی ژێرپێی تۆی پێ بماڵم

کە خۆخستنە ژێر پێی خۆشەویستەوە لەلای عاشقان و شاعیرانی شەیدا زۆر ئاساییە و جێی خۆشحاڵیانە، ئینجا بێینە سەر مەبەستەکەمان لە هێنانەوەی ئەم بەیتە ئەویش ئەوەیە کەس نییە بڵێ لامی خڕخاڵ لامی قەڵەو

نییە لە هەموو زاراوەکاندا لامی قەڵەوە کۆتایی نیوەی ئەم بەیتەش بەوە هاتووە واتە بە لامی قەڵەو ئەبێ کۆتایی نیوەکەی تریش هەر بە لامی قەڵەو بێ ئینجا کێشەکەی تەواو ئەبێ و راست دەرئەچێ ناکرێ لامی نیوەی یەکەم قەڵەوبێ و لامی نیوەی دووەم سووك بێ و ببێتەمایەی لەنگی و لاسەنگی شیعرەکە یان بەیتەکە کە وا بوو ئەبێ (نالی)ی کۆتایی نیوەی دووەم بە لامی قەڵەو بێ لەسەر کێشی خڕخاڵییە ناڵییە ئەگەر بە لامی سووك بێ ئەبێتە نالییە لەسەرکێشی خڕخاڵییە نابێ ناشتوانین بڵێین دەستکورتی و کڵۆڵی تێدایە لەلایەکی کەوە(نالی)بە لامی قەڵەو دوومانا ئەگەیەنێ وەك باسمانکرد دەنگی ناڵچەکەی واتە ناڵە ناڵی ناڵچەکەی یان ناڵەناڵی ناڵی لەژێرپێیدا جائەگەر بەلامی سووك بخوێنینەوە سەرەڕای ئەوەی کێشەکە تێکئەدات ئەو مانایانەش ناگەیەنێ و ئەو جوانکاری جیناسە تەواوەشی لێوەرناگیرێ کە حەزرەت هەموو شیعرەکانی پێ پڕ و شیشخاتن کردوون سەیرە هەر کەسێك تۆزی سەلیقەی ئەدەبی و شیعری هەبێ لەم بەیتەدا بە لای لامی سووکدا ناچێ و یەکسەر ناڵی بە لامی قەڵەو ئەخوێنیتەوە و هەر دوو ماناکەی لێوەرئەگرێ بابزانین زانا و شاعیرانی هاوچەرخی حەزرەت لە بارەی نازناوەکەوە چی ئەڵێن ئەوەی کە باسمانکرد و هێنامانەوە بە پێی بۆچوونی خۆمان بوو بۆ نازناوی حەزرەتی مەلا خدر نەك سەپاندن و راستکردنەوە و بە یەکجاری ساخکردنەوە بێ یان راستکردنەوە ئەکەوێتە ژێر رەشماڵی لەخۆوە بە (ئیجتهاد) و رەنگە وای لێبێ ئەو راستکردنەوەیەش راستکردنەوە بووی ئەوەی کەتۆ بە هەڵەی ئەزانی و وا ئەزانی بە هەڵە نووسراوە راست بێ و تۆ بۆ مەبەست و ماناکەی نەچی و بەپێچەوانەوە ئەوەی تۆ بە لای خۆتەوە راستتکردووەتەوە راستنەکراوە کە راست بێ گەر بمانەوێ ئەکرێ و ئەشێ بۆ نووسین و کتێبی نووسەری ئاسایی بەڵام تەنها لە نووسینی بلیمەت و عەبقەرییەکاندا نایەتەدی و بۆیە ناکرێ بە شیعر و نووسینی حەزرەتی نالی بگوترێ راستمکردەوە وا چاکە بگوترێ وای بۆئەچم و لام وایە وایە بەڵام ئەمەش هەیە گریمانی ئەوە ئەمەش هەیە کە

راست بێ و یەکێکیتر گرێکوێرەکەی بکاتەوە و مەتەڵەکە هەڵبێنێ بۆیە ئێمە گوتمان بەو پێیەی ئێمە بۆ بەیتەکان چووین و بۆ مەبەستی خۆمان ئەو بەیتانەی هێنامننەوە نازناوەکە (ناڵی) یە نەك (نالی) جا بۆ بە هێزکردنی بۆچوونەکەمان دێین پشت ئەدەین بە کێوێکی گەورە و قەڵایەك ئەکەینە پاڵپشتمان کە جەنابی حاجی قادر کۆیی ئەدەبزان و زمانزان و شاعیر و کوردپەروەر و فەیلەسووفی کورد و هاودەرد و نزیکی نالییە، حاجی شاعیر لە بارەی پلەی بەرزی زانای و شاعیری و رەوانبیژی خۆیەوە ئەڵێ:

به جێما ناڵی وەک نالی دوا کەوت کوردی وەک گەردی
کە حاجی ئەسپی خۆی تاودا لەمەیدانی سووخەنڕانی

هەر چەندە حاجی لێرەیا باڵادەستی و دارایی شاعیری خۆی باس دەکات و(دەکێشێ) بەڵام لە دووتوێی پیاهەڵدانەکەیدا شاعیری و زانایی و بلیمەتی ئەو دوو سووارە چاکەی مەیدانی فەساحەت و بەلاغەتەی کوردیشی تیایە و ئەوانیشی لە تای تەرازوی خۆپێکێشانەکە دادانەوە، ئەمە لێرە بوەستێ حاجی کە وەك گوتمان زۆر دڵسۆز و بە پەرۆشی گەل و نیشتمانەکەی بووە و هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بووە کورد زانایەکی لێهاتوو و شارەزایەك و پێشەوایەکی تیا هەڵکەوێ و لە زۆربەی شیعرەکانیدا ئەو خەم و بە پەرۆشە و هەوڵەی تیا بەدی ئەکرێ لەو لاشەوە لە رووی کات و زەمەنەوە زۆر دوور نەبووە لە کات و زەمەنی حەزرەتی نالی و کوردی بڕوا ناکەم بەشوێن ژیان و بەسەرهات و پاشماوە و ناو و نازناو و شوێن و رێی شاعیرێکی وەك حەزرەتی نالیدا هەڵوەدان بوو بێ و شەیدای ناسینی نەبوو بێ لە کاتێکدا نەشوێنەکانیان ئەوەندە لێك دوور بووە نە زەمەنیشیان ئەوەندە نێوان و بەینی هەبووە حاجی نەك شاعیری نەتەوەکەی خۆی بگرە شاعیرە بێگانەکانیشی باش

ناسیوە و زمانی ئەو شاعیرانەشی باش زانیوە جا چۆن نازناوی شاعیرێکی وەك نالی نەزانیوە بێگومان  باشی زانیوە و چاکی ناسیوە ئەوەتا ئەفەرموێ (بەجێما ناڵی...

لێرەیا حاجی ناوی نازناوی حەزرەت بە لامی قەڵەو ئەبات و ئەڵێ (ناڵی) بەپێی ناو هێنانی نالی ئەسپەکەی فەسحاتەکە و هونەرە شیعریەکەش لەوەدایە ناڵی یەکەم وێچو و ناڵی دوەم وێچوو ناڵی یەکەم نازناوی حەزرەت ناڵی دوەم ناڵی ئەسپەکەی ئەشتوانی ناڵی یەکەم ناڵی ئەسپەکەی بێ و ناڵی دوەم حەزرەتی ناڵی بێ ئەوە سەجع و جیناسە تەواوەکەی ئەوە هونەرە ئەدەبییەکەی لە خوێندنەوەی بە لامی قەڵەو هەر زۆر روون و ئاشکرایە بەلاَم ئەگەر نالی نازناو بە لامی سووك بێ نە ئەو جوانکارییە ئەبەخشێ نە ئەو شوێن گۆڕکێیە هەڵدەگرێ, رەنگە حاجی لەو شیعرەیدا چەندی مەبەستی پیاهەڵدانی خۆی و ئەو دوو کەڵە شاعیرە بێوێنەیە بووبێ ئەوەندەش مەبەستی ئەم وشە رەواندنەوەی سەر نازناوی نالی بووبێ وکە لەو وەختەشدا هەبووە بە رێی بێگانەکانا رۆشتبێ و بەلاسایی ئەوان و لەسەردەربرین و زمانی ئەوان نازناوی حەزرەتی دەربڕیبێ و تەلەفوز پێکردبێ حاجیش زمان پاراوی کوردیزانی شارەزای زمانەکانی تر ئەو تاریکاییەی رەواندووەتەوە و راستکردووەتەوە وەك پیازی پاککراو داویەتییە دەستمان و ئەڵێ بەجێما ناڵی وەك ناڵی ئەگەر باسی نالی ئەسپی فەساحەت و رەوانبێژی نەکردایە بۆی هەبوو بڵێین لەوێش هەر ناڵییە یان ئەویش هەر ناڵییە یان هەر دووکیان ناڵین بەلاَم ناوهێنانی ئەسپ ئەو ئەگەرەی لابرد و ئەسپی کەنال تایبەتی ئەوە وشەی نالی پاك کردەوە، کاکە حەمەی (ناری)ش لە تەشەنلێدانێکی شاعیرانە و دۆستانەدا کە لە حەزرەتی نالی داوە لەسەر ئەم بەیتەی کەئەڵێ: (نالی چ منداڵانە بۆ مەم وەی وەی کردووە گەر چی مووی شیرە بەو شیرە شکۆفەی کردووە) رووی تێئەکاو ئەڵێ زۆر (حەیفە بۆ تۆ ناڵی بەو پیرییە منداڵی)دەری ئەخا کە ناڵی بە لامی قەڵەوە نەك بە لامی سووك، چونکە کێشی ناڵی و منداڵی یەك کێشن بەلاَم لەگەڵ نالی بە

لامی سووك هاوكێش و بەرامبەر نابن و لەنگ و لاسەنگ ئەبێ ئەگەری نەزانین و نەناسینی نالی لای ناری زۆر كەمەو دوورە چوون ئەمیش یەكێك بووە لەشارەزایانی ئەدەب وشیعری كوردی و لە هەردوو رووی ئەدەبی و جوگرافییەوە لەجێ ژیان و زایگای نالییەوە نزیكبووە، قسەی ئەم زیاتر جێی متمانەیە لە گێرانەوە و گوتنەوەی ئەوانیتر ی وەك مەلا عارفی چنگیانی و مەلا محەممەدی چڕوستانی چوون لەوانەیە ئەوان بەپێی رێنووسی ئەوسا خوێندبیانەوە و گوتبێتیان، حەمدی ساحێبقرانیش ئەفەرموێ:

خەرمانی لەفزی كوردی كە كردی پێوان

نالی كە نالی كاسەیەكی لێپڕكرد لێوان

تاراجی كرد مەحوییە فەندی بە لوتفی خۆی

عوشریشی دا بەحەمدی وتی بیبەرە دیوان

لێرەشدا نالی بە لامی قەڵەو گونجاو تر و روانترە و لەنیاز و مەبەستی ئەدەبی و شیعری رەوەنبێژی ساحێبقران نزیكترە لەوەی بە لامی سووك بێ سەیری نیوەكەی یەكەم بكە چۆن جیناسێكی لەنێوان كوردی و كوردی داهێناوە و بەو جۆر و شێوەیەش لە نێوان نالی و ناڵەیدا هەمان هونەر و بەدەسەڵاتی زانستی ئەدەبی نیشانداوە رەنگە ئەگەر لەبەر سەلیقە و دەرخستنی ئەو جوانكار و شارەزایی زمانە نەبووایە و بۆ رێكخستن نەبووایە وشەی ناڵەی نەهێنایەتەوە ئەگەر لامی نالی لای ئەو لامی سووك بووایە وشەی ناڵەی تێنەدەخزاند و لەو شوێنە داینەدەنا.

***

**شەست ویەک ساڵ لەمەوپێش، نامەیەکی نێردەی ئەمریکا لە بەغدا باس لە ستەمی حکومەتی عێراق دژ بە کورد دەکات.**

**لە ئینگلیزییەوە**

**محەممەد حەمە ساڵح تۆفیق**

**ناونیشانی نامەکە:**

**ناشنالیستەکانی کورد نارەزای دەردەبڕن لە مامەڵەی خراپی حکومەتی عێراق**

**ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا**

**خزمەتگوزاریی دەرەوە**

**نێردەی ئەمەریکی**

**بەغدا 22ی مارتی 1945**

**نهێنی**

ژماره /674

**بابەت: ناشنالیستەکانی کورد ناڕەزایی دەردەبڕن لە مامەڵەی خراپی حکومەتی عێراق**

**بەڕێز: جەنابی وەزیری دەرەوە – واشنتۆن**

**گەورەم:**

**شەرەفمەندم بەوەی کە لە ماوەی هەفتەی رابردوودا راپۆرتی ئەوەتان پێبدەم کەوا دوو پەیوەندیم پێوەکراوە لە سەرچاوە کوردییەکانەوە و سکالاّ لە بارودۆخی کورد دەکەن لە عێراقدا. یەکەمیان نامەیەکی دەستنووسە بۆ سەرۆك وەزیرانی عێراق و لە لایەن( ئاغاو پیاو ماقوولاّنی هەولێر )ەوە بەرز کراوەتەوە.**

**ئەم نامەیە کە بە عەرەبییەکی پڕ لە هەڵە نووسراوە، سکالاّ لە سیاسەتی ناڕەوای حکومەتەکانی ئێستا و پێشووی عێراق دەکات سەبارەت بە کورد و حکومەت بە ستەملێکردن و داپڵۆسینی خەڵکی کورد تاوانبار دەکات.**

**دووەم پەیوەندی یاداشتێکە بە زمانی ئینگلیزی، کە کورتە مێژوویەکی گەلی کورد باس دەکات لەگەڵ کارەساتەکانی رابردوو و ئەمڕۆیاندا و هانی زلهێزەکان دەدات چاو بە هەڵەکانی رابردوویاندا بگێڕنەوە بە دابینکردنی پێگەیەك بۆ کورد لە نێو گەلانی دنیادا.**

**بەگوێرەی ئەو سەرچاوە کوردییانە، ئەو بیروڕایانەی لەم دوو پەیوەندییەدا هاتوون رەنگدانەوەی دیدو بۆچوونی گشتی زۆرینەی کوردی عێراقە.**

**لە رووی سیاسییەوە ناشنالیستە کوردەکان وای بۆ دەچن کەوا ئێستا کاتێکی لەبار و گونجاوە بۆ سەرنجڕاکێشانی هێزە گەورەکان بەو ئاراستەیەدا کەوا گەلی کورد نایەوێت لە کۆنگرەی ئاشتیدا بیربکرێت و ئەوان لە تورکیا و ئێران و عێراقدا زوڵم و جیاوازییان لە بەرامبەردا دەکرێت و بەم پێیە دەبێ دۆخی دەوڵەتێکی سەربەخۆیان پێ رەوا ببینرێت. زۆرێك لەم کوردانە گوزارش لەو رایە دەکەن کەوا ئەگەر وڵاتی کوردان سەربەخۆیی تەواوی پێ نەبڕا، ئەوا**

لانیکەم کوردەکانی عێراق دەبێت شێوە حوکمێکی خودموختارییان بدرێتیٚ بە رادەیەك کەوا خۆیان بەرپرسیاربن لە چارەسەرکردنی کێشەکانیاندا و لە دۆخێکدابن بتوانن هۆکاری مەینەتییەکانیان لاببەن و لەوانە: کەمی قوتابخانە و مامۆستا، خراپی هۆکاری پەیوەندی و هاتووچۆ، دۆخی خراپ و نالەباری تەندروستی، بێبازاڕی و نرخی هەرزانی بەرهەمی کشتووکاڵی، بەڕێوەبردنی ناڕێکوپێك، کەمی خەرجکردنی پارەو پوول لە کوردستاندا لە لایەن حکومەتەوە بە بەراورد لەگەڵ وەرگرتنی باجدا.

دەردی بنەڕەتی کوردەکانی عێراق بە ئاشکرا ئەوەیە کەوا نایانەوێت ببنە کەمینە و بەگشتی بڕوایان بە حکومەتی عەرەبی نییە لە بەغدا و چارەیان ناویٚ. ئەم ناحەزییەی کوردەکان بۆ حکومەتە عەرەبییەکەی بەغدا زیاتر بە هۆی زیادبوونی پێگەی پۆلیس وسوپای عێراقەوە لە کوردستاندا. لەوەش زیاتر هەڵسوکەوتی کاربەدەستانی حکومەتی عێراق لە کوردستاندا و سڵکردنی ئاشکرا لە جموجووڵی مەلا مستەفا و عەشیرەتەکەی لە لایەن ناوەندەکانی حکومەتی بەغداوە قەناعەتی بە زۆرێك لە کوردەکان کردووە و بەتایبەتی مەلا مستەفا کەوا عەرەب جێی مەترسین و ئەمەش هەڵوێستی کوردەکان توند تر دەکات. ئەقڵییەتی گەورە کاربەدەستانی حکومەتی بەغدا لە مەڕ بارودۆخی ئەمنی لە کوردستاندا دووهەفتە لەمەوپێش بە چاکی کەوتەڕوو. ئەم ڕووداوەی باسی دەکەین تیشکێك دەخاتە سەر ئەو راستییە و پەیوەندی بە نێردەکەمانەوە هەیە. کۆڵۆنێل داغستانی بە فەرماندەی بەتالیۆنێکی سوپا و بەتالیۆنێکی پۆلیس لە گوندی ئاکرێی شاخاوی بوو لە کوردستان. داغستانی بەئیجازە گەڕابووەوە بۆ بەغدا و پاش چەند سەعاتێك لە گەڕانەوەی لە لایەن وەزیری بەرگرییەوە هەواڵی درایە کەوا سەدوپەنجا کەس لە عەشیرەتی مەلا مستەفای بارزانی لە جموجووڵدان و هەڕەشە لە بنکەکانی سوپاو پۆلیس دەکەن و دەبیٚ دەستبەجیٚ بگەڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی وهەڵسوکەوتی گونجاو لەگەڵ هەر ئەگەرێکدا بکات. داغستانی وای لە وەزیری بەرگری گەیاند کە

سەربازگەکانی ئاکرێ دوو فەوجیان تێدایە و هەریەکەیان هەشتسەد کەسن و وای دانا کەوا ئەو ژمارە خەڵکە "خێڵەکیانە " و "هەڕەشەکەیان " تەنها زیادەڕەوییە و هیچی تر. بەڵام داغستانی فەرمانی درایە بگەڕێتەوە بۆ ئاکرێ و کاتێ گەیشتەوە تەماشای کرد راستی مەسەلەکە ئەوەیە کەوا دوانزە کەس لە پیاوانی مەلامستەفا هاتوون بەدوای سۆراخی چەند هێسترێکی دزراودا. دوانزە کەسی شاخاوی ئابلۆقەی هێزێك بدەن کە لە هەشتسەد سەرباز و هەشتسەد پۆلیس پێکهاتبێت. ئەمەبوو ئەو مەترسییەی کەوا ناچاری بکات دەست بەجێ بگەڕێتەوە بۆ شوێن و ڕێی خۆی بە قسەی داغستانی ئەم رووداوە بە شێوەیەکی بەرچاو سەرنجی خەڵکی ناوچەکەی راکێشا.

گەلێك لە ناشنالیستەکانی کورد و لەوانە نوێنەرێکی پەرلەمان و دوو ئەفسەری سوپا، کە یەکێکیان بەم دواییە لە سوپای عێراق خانەنشین کرابوو، گومانی چالاکی نەتەوەیی کوردیان لێدەکرا بەنەهێنی ئەندامێکی نێردەیان تێگەیاندبوو کە زانیاری تەواویان هەیە کە سوپای عێراق نەخشەوپلان لە دژی مەلا مستەفا دادەنێت لە کۆتایی نیساندا و بەم پێیە زۆرینەی ئاغاکانی کورد لە ژێر سەرکردایەتی مەلامستەفادا یەکیانگرتووە و تەواو خۆیان پڕچەك کردووە بەو چەك و جبەخانانەی ساڵی پار دەستی بەسەردا گرتبوون و مەلاش خۆی بۆ هێرشی ئەوان ئامادە کردبوو و پیاوەکانی خستبووە شوێنی بەرگری ستراتیجییەوە.

بەپێی سەرچاوەیەکی ئیستیخباراتی بەریتانی، هەردووك گەورە کاربەدەستانی بەریتانی و عێراقی لەم ماوەیەدا سەرکردە کوردەکانیان دڵنیا کردبووەوە کەوا حکومەتی عێراق نیازی هیچ جموجووڵێکی دوژمنکارانەی نییە لە دژی کوردەکان و جموجووڵی هێزەکانی سوپا و پۆلیسی عێراق لە باکوردا تەنها مانۆڕی بەهارانەیە و نابێ لە لایەن مەلا مستەفاو سەرۆکەکانی ترەوە لێکدانەوەی خراپی بۆ بکرێت.

هەمان سەرچاوە ئەوەشی ڕوونکردووەتەوە کەوا لە ئایندەیەکی نزیکدا حکومەتی عێراق لێبووردنێکی گشتی دەردەکات بۆ مەلامستەفا و هەموو ئەو کەسانەی لە یاخیبوونە چەکداریەکەی ساڵی پاردا بەشداریانکردووە دژ بەحکومەتی عێراق بێجگە لەم جموجووڵی رازیکردنەش، حکومەت تەشریعی بڕیارێکی کرد کەوا ناوچە کوردییەکان ئۆتۆنۆمییەکی بەرچاوی دارایی و بەڕێوەبردنیان بدرێتێ و دەبێ ئەم یاسایە لە ماوەی ساڵێکدا دابڕێژرێت و دەربچێت.

لەگەڵ ڕێزدا

ولیەم دی مۆڕلاند

بەرپرسی کاروبار

فایلی ژمارە /800

هاوپێچ:

1. وەرگێڕدراوی نامەکە بۆ سەرۆك وەزیرانی عێراق.

2. کۆپییەك لەو یاداشتەی باسی مێژووی کورد دەکات.

وێنەی بۆ:

– سەفارەتی ئەمەریکا لە بەغدا

– سەفارەتی ئەمەریکا لە ئەنقەرە

– بەشی کاروباری رۆژهەڵاتی نزیك لە وەزارەتی دەرەوە – ئۆفیسی تاران.

نامەی سەرکردەکانی کورد

هاوپێچی نووسراوی ژمارە(674 )، 22ی مارتی 1945، لە لایەن نێردەی ئەمریکییەوە لەبەغدا.

بۆ/ سەرۆك وەزیران

بەناوی دادپەروەرریی مرۆڤایەتی و دیموکراسییەوە کەهەموو کەسێکی ویژدان زیندوو دەیخوازێت و بەتایبەتی خەڵکی بەشخوراو و

بێدەرەتان، داواکارین لێتان ڕەچاوی بارودۆخی گەلی کوردبکەن، کە وەك میللەتانی تری جیهان داوای مافی نەتەوەیی خۆیان دەکەن.

بەم پێیە داوای خۆمان دەخەینە بەردەمی دەستووری عێراق و جەنابتان و کابینەی وەزارەتەکەتان، سەرەڕای ئەوتۆمەتانەی دەیخەنە پاڵمان لەئەنجامی سیاسەتی کابینە یەك لەدوای یەکەکان، کە سیاسەتی دوژمنکارانە بووە بە ئاواتی نەتەوەییمان. بۆ نموونە، کاتیٚ حکومەتی ڕەشید عالی جاڕی شەڕی دا لە دژی بەریتانییەکان، هەموو کوردێکی نەتەوەیی بە سیخوڕی بەریتانیا و ئەڵقەلەگویٚ لەقەڵەم درا لە لایەن ئەو حکومەتەوە.

دواتر کە بارودۆخەکە ئاسایی بووەوە، نازییەکان تەشەنەی کردووە لە ناویاندا خۆیان بەرەگەزی ئەڵمان دەزانن و زۆرێك لە واتەواتی زیانبەخش کاتێك کە هەڕەشەی نازی لە ڕۆژهەڵاتەوە شکستی هێنا، ئێمە تەنانەت لە سایەی ڕژێمەکەی ئێوەشدا بە یەکەم چینی کۆمۆنیست لە قەڵەمدراین. ئێوە و حکومەتەکەتان دەتانوت کە وا ئەمە هەمووی باوەڕتان لەق ناکات و بەعەیبە ناژمێرێت لە لایەن ئەوانەوە کە چواچێوەی پاشەرۆژ دادەنێت بۆجیهان و ریزبەندی بۆ جیهانی نویٚ دادەنێن و نشتیمان بۆ ئەوانە دروست دەکەن کە نیانە. مەسەلەیەکی حەتمییە کە وا کوردی ستەمدیدە دەبیٚ بەئاواتی خۆی بگات، لەم چەرخەدا کە بە چەرخی روناکی ناودەبرێت و ئەمڕۆ بێت یاسبەی دەبێت بیگەیەنیٚ. ئێمە ئاگادارتان دەکەینەوە کە دەبێت ئەوسیاسەتە ناڕەوایە بگۆڕین کە حکومەتەکەتان لەم شەش مانگەی پێشوودا دەرهەق بەکورد گرتوویەتیە بەر و خۆی لەراستیەکان لادەدات و دەیەوێت رێچکەی کابینەی پێشوو بگرێتە بەر کە ناپاکی لەگەڵ کورددا لەپێناو " حکومەتی عەرەبی عێراقدا " وەك رۆژنامەکان ناوزەدی دەکەن.

بەڕێزان

ئەو ناعەدالەتیەی ئیدارەی ئێستاتان دژ بە کورد پیادەی دەکات لە درووستبوونی دەوڵەتی عێراقەوە تا ئێستا وێنەی نەبووە. ئێوە خەڵکی

کوردتان  له کەمپی کۆکردنەوەدا بەند کردووە و ئاوارەتان کردوون و سەدان کاربەدەستان لەو پەڕی باکوورەوە بۆ ئەوسەری باشوور گواستووەتەوە. ئەمە تەنانەت ئەوسەربازە ساکارانەشی گرتۆتەوە کە لە ملکەچی بەو لاوە هیچیتر نازانن و تاقە سەرچاوەی بژێوی خێزان و منداڵیان ئەو مووچە کەمەیە لەم بارودۆخەی سەخت و نالەبارەی ژیانی خەڵکدا. باشە کێ بەرپرسیارە لە کولەمەرگی ژیانی ئەوانە. با جەنابتان و دوژمنانی کورد باش بزانن کەوا ئەو کوردە چەکدارانەی بە جوولەکە ناوزەد دەکرێن، دەرسیان لەو برایانەیان وەرگرتووە بێچەك بوون و تۆڵەی ستەمکاریانکردووە. بێجگە لەوەش حکومەت هەر لە خۆڕا و بێگوێدانە هیچ شتێك ناوچە کوردنشینەکانی وەك قەزای قەراج دەخاتە سەر لیوای موسڵی عەرەبنشین، سەرباری ئەوەی کە ناوچەرگەی کوردستانە و پشتاوپشت هەر کوردی تێدا نیشتەجێ بووە. ئایا ئەمە نموونەی ناعەدالەتی رەها نییە و پێچەوانەی یاساو ویژدانێکی مرۆڤایەتی نییە ؟ ئایا ئەمە جیاوازیکردنی ئاشکرا نییە لەنێوان هەردوو گەلی کورد و عەرەبدا کە هەمان مافیان هەیە لە دەستووردا ؟ باشە ویژدانی کابینەکەتان ئەوە قبوڵدەکات کە وا بەم ڕەنگە مامەڵە لەگەل ٚکورددا بکرێت و خاك و ئاویان لێداگیر بکرێت لەبەر خاتری چەند وەزیرێك و خزمانی مستەفا ئەلعومەری وەزیری ناوخۆدا ؟ ئایا کورد بەمشێوەیە ڕەفتاریان لەگەڵ بکرێت ؟

ئایائەم ڕووداوە مێژوویانە هیچ دەرسێك نین بۆ کابینەکەتان ؟

بەم پێیە کورد هەرگیز ئەم رەفتارە دزێوانە لە بیرناکەن کە وا کابینەکەی پاچەچی بەرپای دەکات و هیچ کاتێك کورد کاری وای بەخۆوە نەدیوە لەمەوپێش و تەنانەت لە ڕۆژگاری رەشی رژێمی عوسمانیشدا تەواوی کوردی دانیشتووی لیوای هەولێر بەپێی نەریتێك لە باوباپیرانەوە بۆیان ماوەتەوە ئەوپەڕی داکۆکی دەکەن لە ناوچەی قەراج، لە رووی ماددی و مەعنەوییەوە و بەهیچ جۆرێك ڕێگەنادەن بکەوێتە ژێرچنگی ئەو ئاژاوەگێڕانەی ڕێز لە یاسا ناگرن.

**ئیمزا**

**( ئاغاو پیاو ماقوولاَنی هەولێر )**

***

**سەرچاوە / ئینتەرنێت ماڵپەڕی** www.aina.org

The lost peoples of The middle east

**ئاسۆی پەرە پێدانی کشتوکاڵ لە هەرێمی کوردستانی ئێراقدا**

**نوسینی**

**مەحمود کەریم ئەحمەد**

**ماموٚستا لە پەیمانگای تەکنیکی کەلار**

2006/4/13

**یەکەم / جوگرافیای سروشتی هەرێمی کوردستانی ئێراق.**

1. **کورتەیەکی مێژوویی :**

**هەندێ توێژینەوەی زانستی ئاماژە بۆ ئەوە ئەکەن کە سەرزەمینی ئێستای کوردستانی ئێراق لە کۆتایی چەرخە جیۆلۆجیەکاندا دوا شێوەی ئێستایان وەرگرتووە و لە کۆتایی چەرخە بەستەڵەکەکاندا کەش و هەوا وەك ئێستای لێهاتووە و چەم، رووبار، کانی، کارێزەکان بووژاونەتەوە و ئاژەڵە**

کۆنەکان لەناوچوون و ئەو ئاژەڵانەی ئێستا کە لەگەڵ مرۆڤدا ئەژین پەیدابوون، لەکۆتایی چەرخەبەردینەکانیشدا کۆمەڵگا سەرەتایی و گەڕۆکەکانی مرۆڤ لەنزیك کانی و کارێزو کەناری چەم و رووبارەکاندا و لەژێر ئەو گردە خۆڵ و دەستکردانەدا کە ئێستا لە دەشتەکانی کوردستاندا ئەبینرێن گوندی کشتوکاڵیان درووست کردووە و ژیانی شوانکارە و چاندنیان دەستپێکردووە و نیشتەجێبوون. هەر لەو سەردەمانەدا کۆچ و رەوێکی فراوان بەرەو ناوچەکانی کوردستان دەستی پێکردوە، لانی کەم مرۆڤ ( 6000) ساڵ پ.ز لە کوردستانی ئێستادا ژیاوە و (3500 پ.ز) تیادا نیشتەجێبوون، گوتییەکان یەکێکن لەو نەتەوە زاگرۆسیانەی (3000پ.ز) لە باشووری دەشتی شارەزووردا ژیاون و دواتر سنووری دەسەڵاتیان لە رۆژهەڵاتەوە رووباری سیروان و لە رۆژئاواوە زێی بچووك و لە باکوورەوە شاخەکانی سلێمانی و لە باشوورە رووباری دیجلە بووە کە دوژمن نەیتوانیوە لێیان بپەڕێتەوە بەئاسانی و کەرکوکی ئەمڕۆ پایتەختی وولاتەکەیان بووە. لە هەمانکاتدا ئەکەدی و ئاشورییەکان لە دوورگەی عەرەبەوە بەرەو ناوچەکانی باشوور و ناوەڕاست و باکووری ئێراق هەڵکشان و لەو کاتەوە تائێستا کوردستانیان کردووە بە مەیدانی جەنگ وململانێی خۆیان و وەچەکانیان لەگەڵ کوردا و هیچ گۆڕانی باش بەسەر بیر و بۆچونیاندا بەرامبەر بەمافی کورد نەهاتووە.

بەشێوەیەکی گشتی مێژوونووسان لەسەر ئەوە کۆکن کە وشەی کوردستان ساڵی (1150ز) بۆ یەکەم جار لە سەردەمی سەلجوقییەکاندا بلاْبووەتەوە. ساڵی (1514ز) لەئەنجامی شەڕی ( چاڵدێران )ی نێوان سەفەوی و عوسمانییەکاندا کوردستان کرا بە دوو بەشەوە لەنێوان ئێران و تورکیادا. ساڵی 1914 لە ئەنجامی دیاریکردنی سنووری ئێراق و ئێراندا کوردستانی ئێراق و ئێران لێکجیاکرانەوە و ساڵی (1920) کوردستانی سوریا و (1925) کوردستانی تورکیا جیاکرانەوە لەیەك و بەم جۆرە بووە

چوار پارچەی دابەشکراو بەسەر چوار دەوڵەتی جیاواز و دژ بەیەك و بە هەموویان دژ بە کورد. بۆیە ناسیۆنالیستە کوردەکان وشەی کوردستانی (باکوور، باشوور، خۆرهەلاّت، خۆرئاوا ) بەکارئەهێنین. بەشێوەیەکی گشتی رووبەری هەرێمی کوردستانی ئێراق زیاتر لە ( 85 ) هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشەیە و ئەکەوێتە باکووری ئەو هێڵە سنووریەوە کە ( لەجەسانەوە بەرەو رۆژئاوای بەلەدروز و شارەبان دەڕوا و ئینجا بە زنجیرە چیای حمریندا تا ئەگاتە فەتحە و لە سەرووی شاری موسلیشەوە بەخواری تەلەعفەردا تێئەپەڕێت تا ئەگاتە (10) کیلۆمەتری شاری ( بەعاج ) ئینجا بەهێڵێکی راست لەگەڵ سنووری ئێراق وسوریادا یەکئەگرێتەوە. ئیتر کوردستانی ئێراق لە هەموو لاکانی تریەوە بە پارچەکانی تری کوردستان دەورە دراوە کە بە هەموویان سنووری مێژوویی و نەتەوەیی کوردستان پێکئەهێنین ).

هەرێمی کوردستانی ئێراق ئەکەوێتە نێوان هێڵەکانی پانی ( 33–37) پلەی باکوور و هێڵەکانی درێژی (41–46) پلەی خۆرهەلاّتەوە و لە چوار پارێزگای سەرەکی کە بە هەموویان ( 23 ) قەزاو ( 67 ) ناحیەیان هەیە. جگە لە ( 13 ) قەزا و ( 33 ) ناحیەی تر کە ئەکەونە سنووری پارێزگاکانی ( موسڵ و تکریت و دیالە و کوت ) پێکهاتووە.

## 2. جیۆمۆرفۆلۆجیای هەرێمی کوردستانی ئێراق :

مۆرفۆلۆجیا چیا و دەشت و دۆڵ و بانەکان ئەگرێتەوە کە لە گەشەکردنی جیۆلۆجی هەریمی کوردستانی ئێراقدا دەرئەکەوێت کە لە ناوچەی تۆبۆگرافی جیاواز پێکهاتووە کە ناوچە شاخاوی و گردۆڵکاویەکانە و ئەوانیش چەندین دەشت و دۆڵ و خڕ و شیو و چەم و

رووباریان لە خۆگرتوە، ئەمەش کاری کردووەتە سەر شێوەی دابەشبوونی دانیشتوان و جۆراوجۆری ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی بۆیە بەکورتی تیشك ئەخەمە سەر دیاردە جیومۆرفۆلۆجیەکانی ئەو دوو ناوچەیە:

**١. ناوچە شاخاویەکان :**

چیاکانی هەرێمی کوردستانی ئێراق لە شێوەی داسولکەییدا لە باکووری رۆژئاوای هەرێمەوە بەرەو باشووری رۆژهەڵات و بە تێکرای بەرزی (3600-1000م ) درێژ ئەبنەوە و سەرجەم رووبەرەکەی (23370کم2) کە لە 5٪ ی رووپێوی ئێراق و 49 ,27 ٪ رووبەری هەرێمی کوردستان پێکئەهێن و بەگشتی ئەتوانرێ دوو جۆر زنجیرە چیا جیا بکرێتەوە :

- زنجیرە چیای تیژ و چەماوەکان :

بەرزیەکەیان ئەگاتە ( 3600-1500 م )، بەهێزی جووڵانەوە ( ئەلبی )یەکەی زەمین دوای کشانەوەی دەریای ( تتس ) چینەکانی داوە بەسەر یەکتردا و بەردە کۆنەکانی بەسەر تازەکاندا کشاندووە، بۆیە لە لووتکەکاندا تاشەبەرد ئەبینرێت. ئەم ناوچەیە سەخت و لووتکەی زۆرە و لاپاڵەکانی لێژن و دۆڵەکانی تەسکن و دارستانی بەرووی چڕ و مامناوەندی پێوەیە. سەختی ناوچەکە وایکردووە کەمتر خەڵك نیشتەجێبن، تەنیا لەو شوێنانەدا نەبێت کە کشتوکاڵی تیا ئەکرێت و لاپاڵەکانی بۆ لەوەڕگا بەکارئەهێنرێت. بە گشتی چیاکانی ئەم جۆرە ئەمانەن:
*چیاکانی نێوان ئێراق – تورکیا ناوچەی چەمی خاپوور:

که چیاکانی ( شرانش 2052م ) و( چیا کیریێ 1186م ) و (چیای دیریێ 1230 م ) و ( رەشوانی 2023م ) ئەگرێتەوە.

* چیاکانی نێوان چەمی خاپوور – زێی گەورە :

که لە دوو زنجیرە پێکدێن. زنجیرەی باکوور چیاکانی ( زۆزان ) و ( زینانە 2411 م ) ئەگرێتەوە و زنجیرەی باشوور بە چیاکانی ( مەتینە 2095م ) و ( سەری ئامێدی 2013م ) کە بەسراونەتەوە بە چیاکانی ( سەربزێنی 1902 م ) و ( بەرواری بالاَ 2097 م )ەوە ئەگرێتەوە.

* چیاکانی نێوان زێی گەورە و رووباری کوچك :

که دیارترینیان چیای ( کۆهی ژێر 2282م ) و ( سوکی 1635م ) و ( شیرین 2378م ) و ( سەرمێرانە 2608م )ن.

*چیاکانی نێوان رووباری کوچك و رووباری رواندوز:

گرنگترینیان چیاکانی ( برادۆست 2076م ) و ( زۆزگ 1829م ) و ( پیران 2076م ) و ( حەسارۆست 3607م ) و ( دۆڵەمەڕ 3399م ) و ( شاکێف 3068م ) و ( سەربەندان 1800م ) و ( هەڵگورد 3607 م ) گرنگترین لووتکەکانیانە و هەر لەم ناوچەیەدا چیاکانی ( چیامەنداو 2440 م ) و ( کۆڕەك 2125م ) و ( بیجان 2171م ) و ( کونەکۆتر 2692 م ) و ( کاروخ (2560م ) درێژبوونەتوە.

*چیاکانی نێوان رووباری رەوادز و زێی بچووك:

که چیای قەندیلە و لووتکەکانی ( حاجیبرایم 3452م) و ( حاجی ئۆمەران 1780م ) و ( درێزە 2314م ) دیارترین لووتکەکانیەتی.

* چیاکانی نێوان زێی بچووك و رووباری سیروان :

که هێڵی سنووری ئێراق – ئێران پێکدێنن، چیاکانی ( سورکێو 2223م ) و ( کۆترەڕەش 2752م ) و ( بەردەسپی 2489م ) و ( هەورامان 2548م ) و ( پێنجوێن 1500– 2000م ) ئەگرێتەوە.

*چیاکانی باکوور و باکووری خۆرهەلاَتی شاری سلێمانی :

که چیاکانی (کوڕەکاژاو 1957م) و (گۆمەدۆڵ 1332م) و (کونەکۆتر2764 ) و ( پیرە مەگروون 2620م ) و ( شێرباخ 637م ) و ئەزمەر (1703م) و (گۆیژە 1524م) و (سەرمەند 1486م) ئەگرێتەوە.

* چیا کوڵ و کەمتر چەماوەکان:

ئەم زنجیرە چیایانە کەمتر جوولانەوە( ئەلبی )یەکەی زەمین کەمتر کاری تێکردوون و بەرزی و نزمیان لەنێوان (1000-2000م)دایە و تاشەبەردەکانی بە ڕێکوپێکی ماونەتەوە و دۆڵی درێژ و پان جیایان ئەکاتەوە. ئەمشوێنانە زیاتر بەکەڵکی نیشتەجێبوونی مرۆڤ و کشتوکاڵ دێن. ئەم ناوچەیە لە دووهێڵی سەرەکی زنجیرە چیا پێکدێت کە شان بەشانی یەکتر کشاون :

<u>هێڵی یەکەم :</u> هێڵی باکوور لە چیاکانی (گارە 2160م) و(پێرس 1624 م)و (خێریۆ1470م) و(پیلان 1652م) و(حەریر 1441م)و (خانزاند 1530م) و(تاسلوجە 911 م) و (بەرانان 1373م ) و (بەمۆ 1828 م) پێکهاتووە.

<u>هێڵی دووەم :</u> کە هێڵی جیاکەرەوەی نێوان هەرێمی شاخاوی و گردۆڵکاوییە و لە باکووری خۆرئاواوە بۆ باشووری خۆرهەلات لە چیاکانی (بێخێر (سپی) 1302م ) و (باکرمان 1024م) و (ئاکریێ 1548م) و (باباجیك 1005م) و (پیرمام 1090م) و (سەفین 1475م) و (سەگرمە 1727م) و (هەنجیرە 1372م) و (قەرەداغ 1076) و(زەردە 1795 م) پێکهاتووە.

ئەم هێلانە سوودی تۆبۆگرافی و فیزۆگرافی و مرۆییان هەیە، جگە لەوە ناوچەکان لە یەك جیائەکەنەوە، سنووری ئاو و هەوا و باران دائەنێن و ئەبنە سەرەتای گۆڕان لە چەشن وچری وپڕی دارستان وگژوگیا و دەغلۆدانی ناوچەکان. تا بەرەو باشووری رۆژئاوا بڕۆین زیاتر لە یەکتر دوورئەکەونەوە بەهۆی فراوانی دەشتەکانی نێوانیانەوە وەك دەشتی(حەریروباتاس) کە لە نێوان شاخی (حەریر) و(سەفین)دایە و دەشتی بازیان کە لە نێوان زنجیرە چیای بازیان و تاسلوجەدایە.

لەنێوان ناوچە شاخاوییە تیژ و کوڵەکاندا شاخی نزمتر هەیە  کە لەوەڕگای چاکن و هەر یەکە لە شوێنی خۆیاندا ناویان هەیە وەك:
*شاخاویەکانی ناوچەی پێنجوێن: کە بە لووتکە بەرزەکانی (قایە، هەرزەلە، یاسامالْ )دەورەدراون و بەرزایەکانیان لە نێوان (1500-2000م) دایە.
*شاخەکانی بەرزنجە: کە ئەکەونە نێوان شاخەکانی هەورامان و دەشتی شارەزوور و رووباری قەلاْچوالانەوە هەندێ شاخی بەرزی تیایە وەك (کوڕەکاژاو 2200م).
*شاخەکانی پشدەر: کە بە سنووری ئێران و دۆڵی سیوەیل و قەلاْچوالان و زێی بچووك دەوردراون، هەندێ لووتکەی وەك (مامەندە) و (کەتوو2316م)ی تیایە کە بەرامبەر بە سنووری ئێران درێژبوونەتەوە.
*شاخەکانیچوارتا: کە ئەکەوێتە نێوان سیوەیل و قەلاْچوالانەوە و بە ناوبانگترینیان شاخی (لاریْ ) و (سەرسیر 1589 م ) ە.
*شاخەکانی باکووری دهۆك.
ب - ناوچەگردۆڵکاویەکان:
سنوورەکەی لە باکووریەوە هەمان سنووری باشووری ناوچە شاخاویەکانە و بریتیە لە درێژبوونەوەی شاخەکانی (بێخێر(سپی)، ئاکریْ، پیرمام، هەیبەسوڵتان، بازیان، سەرگرمە، قەرەداغ، زەردە ). درێژی ناوچەکە 500 کیلۆمەتر و پانتاییەکەی 80 -150 کیلۆمەترئەبێت، بەمشێوەیە رووبەرەکەی نزیکەی 63000 کیلۆمەتر چواگۆشەیە، نزیکەی 15٪ی پانتایی ئێراق پێکئەهێنێت. زانا جوگرافییەکان زۆر ناویان  لەم ناوچەیە ناوە، بەلاْم باشترینیان (ناوچە گردۆڵکاویەکانە)، کە لە ڕاسیدا ناوچەیەکی گواستنەوەیە لەگەڵ ناوچە شاخاویەکانی کوردستان و ناوچە دەشت و بیابانەکانی ئێراقدا.
ئەم ناوچەیە تووشی هەمان کارتێکردن و باروودۆخی جیۆلۆجی ناوچە شاخاوییەکان بووە، بەلاْم جوولاْنەوەی (ئەلبی)یە بەهێزەکە کەمترکاری تێکردووە، چونکە دوورتربووە لە مەڵبەندی زەمینلەرزەکەوە. ئەم راستیە

جیۆلۆجیانە شوێنەواری فیزۆگرافی زۆری لەسەر رووبەرەکەی بەجێشتووە، چەمانەوەکەی کەمترە و زیاتر لە گردۆڵکە ئەچێت تا لە شاخ و زۆر کەم هەرە بەرزەکەیان لە 1000 مەتر زیاترە و بە گشتی دوورن لە یەکەوە و سەختی و لێژیان کەمترە و حەوزەکانی نێوانیان بریتین لە دەشت و شیو و گردۆڵکە و بەهەمان شێوەی ناوچە شاخاویەکان درێژئەبنەوە، واتە (لە باکووری رۆژئاواوە درێژئەبنەوە بۆ باشووری رۆژهەلأت)،جگە لە شاخی شەنگار کە (لە رۆژئاواوە بۆ رۆژهەلأت درێژئەبنەوە).

لە بناغەدا بە حەوزێك ئەژمێریَ لە بەردەم ناوچە شاخاویەکاندا. بە هۆی پێکهاتەی جیۆلۆجی ناوچەکەوە باران و کانیاوی کەمە وکەوتووەتە نێوان هێڵی 200 –500 میللیمەتری بارانەوە بە گشتی وشکانە. خڕ و شیوی وشکی زۆر تیایە، کە تەنها لە وەرزی باراندا ئاوی پیا ئەڕوات. بە هۆی لافاو و راماڵینی زەوییەوە لە هەندێ شوێندا دەشتی تەسك و لار و لوێر و لاپاڵ دروستبووە کە پانییەکەی ئەگاتە 5 کیلۆمەتر و بەرزییەکەی 30 مەتر. هەروەها ناوچەکە گرنگییەکی ئابووری تایبەتی هەیە و زۆر شار و شارۆچکەی وەك (گوێر، مەخموور، ئالتونکۆپری، کەرکوك، داقوق، دوزخورماتوو، کفری، کەلار، جەلاولا، خانەقین)ی تیا دروستبووە. دەوڵەمەندی ناوچە گردۆڵکاوییەکان شوێنی نیشتەجێبوون بە ئاوی ژێر زەمین و کانی و کارێز و چالأو کردوویەتی بە شوێنی نیشتەجێبوون و ئاژەڵداری و بەرهەمهێنانی گەنم و جۆ. جگە لەوەی کە گردۆڵکەکانی کەرکوك، حەمرین، گیارە، بە ناوچە نەوتاوییە گرنگەکان ئەژمێرێن، ئەم ناوچەیە بووە بە ئەڵقەی پێکەوە گرێدانی ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان لە باکوورەوە بە ناوچە دەشتاوییەکانی لە باشووری ئێراقەوە کە هۆکارێکی گرنگە بۆ دروستبوونی بازرگانی لە نێوان ئەو دوو شوێنێە جیاوازە لە سرووشت و بەروبوومدا. بە کورتی رووبەری ناوچە گردۆڵکاوییەکان بریتیە لە چەند زنجیرە یاڵێکی نزم کە لە نێوانیاندا چەند گرد و دەشتی تێدایە و ئەکرێ بە چوار گرووپەوە، بەم شێوەیەن:

1. **گروپی بەرزاییەکانی رۆژئاوای دیجلە: کە بریتیە لە بەرزاییەکانی (مەکحول 533م)، (گیارە و عەتشان 490م)، (تەلەعفەر 598 م )، (زەممار 605م)، (ئەشکەفت 629م)و بە شاخی (شەنگار 1463 م)کە درێژییەکەی 72 کیلۆمەترە دواییدێت و دەشتی جەزیرەی باکوور ئەکەوێتە نێوان ئەو بەرزاییانەوە.**

2. **گرووپی گردۆڵکە نزم رووتەکانی رۆژهەلأتی دیجلە: وەك شاخی (مەقلوب 1075م)، (بەعشیقە 663م)، (قەرەچووغ 875 م)، (ئاوانە 530م)، (دەمیرداغ 500 م ). ئەم ناوچەیە ئاوی ژێرزەمینی زۆرە کە لە لاپاڵ و دەشتاییەکاندا لەسەر شێوەی کانی و کارێز هەڵئەقوڵێن بەتایبەتی لە گردۆڵکەکانی مەقلوب و بەعیشقە، دەشتی دیبەگەی پیٰ ئاو ئەدریت.**

3. **گرووپی گردۆڵکەکانی نێوان رووباری زێی بچووك و رووباری سیروان: درێژییەکەی 100 کیلۆمەترە و لە دوو گرووپەکەی پێشوو نزمترو رووتترە، گرنگترینیان شاخی (نەوتداخ ) لە باکووری رۆژهەلأتی دووزخورماتووەوە، (گەلأبات 225م)، باباشاسواری کفری 368 م )، (گومار 258 م )، (شاکەل 405 م)، (کانی دۆمەلأن ).**

4. **گرووپی چوارەم: لە سنووری ناوچە گردۆڵکاوییەکانەوە دەستپێئەکات لە زنجیرەی (ئاخوداخ 632م) لە رۆژئاوای قەسری شیرین و زنجیرە (چیای حەمرین 365م)کە درێژترین شاخە لە کوردستاندا (160 کم) لە رۆژهەلأتی مەندەلی و نزیکی سنووری ئێراق وئێرانەوە سەرهەڵئەدا و بەرەو باکووری رۆژئاوا ئەکشێت لە سەر رووباری دیجلە لە نزیك (فتحە) دوایی دێت.**

**ج. ناوچە دەشتییەکان: لە ناوچە شاخاوی و گردۆڵکاوییەکاندا چەندین دەشتی تەسك و فراوان هەیە کە ئەتوانرێت بوترێ گرنگترین پارچەی تۆپۆگرافین لە ناوچەکەدا لە روانگەی مرۆڤایەتیەوە، چونکە بریتیە لە ناوچەکانی مەڵبەندەکانی نیشتەجێبوونی مرۆ و ناوچەی کشتوکاڵی و**

بەرهەمهێنان بۆیە چەندین شار و  شارۆچکە و گوندی تیا درووستکراوە، گرنگترین ئەو دەشتانە ئەمانەن:
*دەشتی شارەزوور: فراوانترین دەشتی ناوچە شاخاوییەکانە، درێژاییەکەی لە ڕۆژ هەلآتەوە بۆ رۆژئاوا (لە هەڵەبجەوە بۆ رووباری تایین ) نزیکی (100کم)، پانییەکەی (15 –20کم) لەهەندێ شوێنی باشووری ڕۆژهەلآتەوە ئەگاتە (25کم)، هەندێ سەرچاوە بە هەر دوو دەشتی (شارەزوور و سلێمانی )ناوی ئەبات. بەرزاییەکەی لە رووی دەریاوە لە نێوان (450 –600م)دایە. لە باکوور و باکووری خۆرهەلآتەوە بە چیاکانی هەورامان و بەرزنجە و گۆیژە و ئەزمڕ و پیرەمەگروون و لە باشووری خۆرئاواوە بە چیاکانی بەرانان و گڵەزەردە و تاسلوجە چێوە کێشراوە. مەڵبەندی پارێزگای سلێمانی و چەند شارێکی تری وەکو هەڵەبجە و سەیدسادق و عەربەت... هتد ئەکەونە ناو دەشتەکەوە.
*دەشتی ڕانیە: درێژییەکەی (30کم)و پانییەکەی (20–30کم). بە هۆی دەربەندی رانیەوە کە زێی بچووکی پیائەڕوات، نیوەی  رۆژهەلآتی (کە دەشتی پشتدەرە) لەنیوەی خۆرئاوای (کە دەشتی بیتوێنە) لێکجیا ئەکاتەوە و بەرزی لە رووی دەریاوە(500–600م). هەندێ چەم و کانی و کارێزی ناوچەکە ئاودەدەن، بەلآم ئاوی زێی بچووك بە کارناهێنرێت بۆ ئاودێری لە هەندێ شوێنی کەمدا نەبێت، چونکە بەربەستی دوکان لە تەسکایی نێوان چیای کۆسرەت و سارادا، لەسەر کۆتایی باشووری دەشتەکە دروستکراوە، رووبەرێکی فراوانی بە هۆی پەنگاوی دەریاچەی دوکانەوە ئەکەوێتە ژێرئاو.
*دەشتی زاخۆ : پێشی ئەوترێ دەشتی (سندی): درێژییەکەی 6 کم، پانییەکەی 6کم، بەرزییەکەی لە رووی دەریاوە(400–600م). لە رۆژئاوای رووباری هیزلەوە درێژئەبێتەوە بە شاخەکانی (بەرواری بالآ) لە باکوورەوە و (بەرواری ژێرێ ) و (گارە) لە باشوورەوە دورە دراوە و بە رووباری خاپوور ئاوئەدرێت.

* دشتی هەولێر: لە باکووری ڕۆژئاوای زنجیرە چیای (ئاوانە) وە درێژئەبێتەوە تا باشووی زنجیرە چیای (کانی دۆمەڵان ).درێژییەکەی (85کم)و پانییەکەی (43کم) زیاتر نیە و بەرزییەکەی لە رووی دەریاوە (300−400م)و خاکەکەی لە چەو و لم و قوڕ و تێکەڵە پێکهاتووە، ناوەڕاستی دەشتەکە شیو و دۆڵی زۆری تیایە و شەپۆلاویە و لەهەندێ شوێنا بەرزایی وەك (دمیرداغ )ی تیایە ئاوەکانی ئەڕژێنە زێی گەورە و بچووك و باشترین دەشتی ناوچەکەیە بۆ چاندنی گەنم.
*دەشتی دیجلە: ئەکەوێتە نێوان شاخەکانی (ئاوان) و (قەرەچۆغەوە ) و درێژییەکەی (80کم) وپانییەکەی (16 کم) وبەرزییەکەی لە رووی دەریاوە نزیکەی (300م). ئاوی بەشی سەرووی کە پێی ئەوترێ دەشتی شەمامك ئەڕژێتە زێی بچووك. ئاوی ژێرزەمینی زۆرە کە لە کەناری دەشتەکاندا لەسەر شێوەی کانی و کارێز هەڵئەقوڵێت  و گژوگیای زۆرە بۆ لەوەڕگا.
*دەشتی حەمرین: لە باشووری خانەقینەوە دەستپێئەکات تا (گەیارە)، درێژییەکەی (300کم) و پانییەکەی (64−80کم) و لە ناوەڕاستا تەسکئەبێتەوە بۆ (32کم)و بەرزاییەکەی (180− 250کم ). ئەکەوێتە نێوان زنجیرە چیای حەمرین لە باشوورەوە و زنجیرە چیای قەرەچوغ لە باکوورەوە بەرەو توزخورماتوو و بانی کەرکوك کشاوە. بارانی بەشی کشتوکاڵ ئەکات  و هەندێ لە رووبارەکانی بەکەڵکی ئاودێری دێن وەك خڕی (تاووق )، بەڵام لەهاویندا وشکئەکەن.
*دەشتی شەنگار: رووبەرەکەی 1800کم چوارگۆشەیە و ئاوی شیو و دۆڵەکانی ئەڕژێنە  رووباری دیجلە.
د. بانەکان: لە دەشتەکان بەرزترن و ئاوەڕۆی رووبارەکان کەرتی کردوون بۆ ناوچەی گەورەگەورە و دۆڵ و شیوی قووڵی تیا هەڵکەندوون. گرنگترین دوو بانی ناوچە گردۆڵکاوییەکان:
*بانی کرکوك: ئەکەونە نێوان سنووری ئێراق وئێران لە رۆژهەڵاتەوە و دەشتی هەولێر لە رۆژئاوەوە و چیا بەرزەکان و لە باکوورەوە چیای حەمرین و لە

باشوورەوە. تێکڕای بەرزییەکەی (600-1000م). لقەکانی زێی بچووك و عوزێم و سیروان ئەم گردۆڵکانە پچڕپچڕ ئەکەن و لافاوی زۆرە، بەڵام دۆڵەکانی جگە لە هەندێ گژوگیای لاواز زیاتر هیچی تری تیانییە.

*بانی موسڵ (ئاشور): ئەکەوێتە باکووری خۆرئاوای ناوچە گردۆڵکاوییەکان. لە خۆرهەڵاتەوە زێی گەورەو لە خۆرئاواوە چیاکانی شەنگار و ئیبراهیم دەوریانداوە، تێکرای بەرزییەکەی لە نێوان (300-450م)دایە. رووبەرەکەی شەپۆلاوییە لەگەڵ چیای تردا. رووباری دیجلە ئەیکات بە دوو کەرتی یەکسانەوە، کەرتی رۆژهەڵاتی باران و کانی وکارێزی زۆرە و هەنێ لەشاخەکانی داروو دەوەن و گژوگیا دایئەپۆشێ و بە ئاوی دۆڵی (قووش) ئاو ئەدرێت کە لە نزیك موسڵەوە ئەڕژێتە دیجلە، بەڵام کەرتی خۆرئاوا بریتیە لە زەوی شەپۆلاوی و رووبەرەکەی رێکوپێك نییە.

3. خاك وئاو و کەشوهەوای کوردستانی ئێراق:

*خاك: بەشێوەیەکی گشتی خاکی هەرێمی کوردستانی ئێراق لەو جۆرە خاکانەیە کە بڕێکی زۆر مادەی خۆراکی وخوێی وەکو (کالیسیۆم، گۆگرد، فسفۆڕ، پۆتاسیۆم، نیترۆجین)ی تیایەو هەڵکەوتی خاکەکەشی بە جۆرێکە کە سیستەمی ئاو و ئاوەرۆی بەشێوەیەکی لەبارە و بڕی بارانی ساڵانەی باشە و تەنگوچەڵەمەی سوێری خاکی نییە، بەڵام رووبەڕووی کێشەی راماڵینی خاك بووەتەوە بەهۆی لێژی زەوی و کێڵانی ناڕاست و بارانی بەخوڕ و لافاو و بای بەهێز و داربڕینەوە، کە ئەکرێت تاڕادەیەکی زۆر کەم بکرێتەوە بە پاراستنی رووەکی سروشتی و بایەخدان بە دارستان و پەیڕەوکردنی کێڵانی ستوونی و لە قەد پاڵە لێژەکاندا و دروستکردنی بەربەست و پرۆژەی ئاوی بچووك لە شوێنە لێژەکاندا.

بەگشتی ئەکرێت خاکی هەرێمی کوردستانی ئێراق بەم شێوەیەی خوارەوە پۆلێن بکرێت:

1.خاکی چیا

2.خاكی تەنكە بەردەلآن : لەسەر بەرد و تاشەبەردی كلس و گەچ دروستبوون.
3.خاكی كەستەنائی: وەك خاكی دەشتەكانی شارە زور و رانیەو سندی.
4.خاكی قاوەی بۆر وسوور : ئەكەوێتە ناوچە گردۆلكاوییەكانەوە.
5.خاكیلیتەیی: بەهۆی لافاوی رووبار و پێچاوپێچكردنی چەم و رووبارەكانەوە دروستئەبێت و لە هەندێ شوێن پێی ئەڵێن (لەن).
* ئاو: بە كورتی سەرچاوەكانی ئاوی هەرێمی كوردستانی ئێراق چوار سەرچاوەی سەرەكین ئەوانیش:
- باران و بەفر: سالآنە (250-1000ملم) ئەبارێت لە ناوچە شاخاویەكاندا كەپێی ئەوترێ ناوچەی بارانی مسۆگەر (400- 1000ملم) ئەبارێت و لە باكووری ناوچە گردۆلكاوییەكاندا كە پێی ئەوترێ ناوچەی بارانی نیمچە مسۆگەر نزیكەی (300ملم) ئەبارێت و لە باشووری ناوچە گردۆلكاوییەكاندا كە پێی ئەوترێت ناوچەی بارانی نامسۆگەر لە (300ملم) كەمتر ئەبارێت و ئەبێتە هۆی ژیانەوەی چەم و رووبار و كانی و كارێزەكان و بەشی كشتوكاڵ ئەكات. جگە لەوەی بەفر لە ناوچە چیابەرزەكاندا بە زۆری ئەبارێت و لە هەندێكیاندا (12) مانگە ئەمێنێتەوە.
-ئاوی ژێر زەوی: بڕی ئاوی ژێرزەوی پەیوەندی راستەوخۆی بە بڕی بارانی سالآنەوە هەیە، بۆیە بڕی هەرە زۆری كانیاوەكان ئەكەونە ناوچە شاخاویەكانەوە تابەرەو باشوور و باشووری خۆرئاوا بچن كانیاوەكان كەم ئەبنەوە و بۆ سوود وەرگرتن لە ئاوی ژێرزەوی بەقوولآیی جیاجیا بیر لێئەدرێت.
- رووبار و چەمەكان: لایەنی كەم (6) رووباری جیاجیا ئەكەونە خاكی هەرێمی كوردستانی ئێراقەوە كە ئەمانەن:
*رووباری دیجلە: سەرچاوەكانی ئەكەونە ناوچەی هەرێمی كوردستانی توركیا لە خاپورەوە تا موسڵ (173كم)راستەوخۆ بە كوردستانی ئێراقدا تێەڕئەبێت. هەموو لقەكانی ئەكەونە كوردستانی ئیراقەوە.

–رووباری خاپوور: لەگەڵ رووباری هیزلدا لە کوردستانی باکوور هەڵئەقوڵێن و لە (200کم) باکووری  موسڵە وئەرژێتە دیجلە و28٪ ی سەرجەم ئاوی دیجلە ئەدات.

*رووبای زێی گەورە: لە چیاکانی کوردستانی باکوور ونێوان هەر دوو دەریاچەی وان و ورمێ و ناوچەی باشقەلاَ و جۆلەمێرگ هەڵئەقولێ و ناوچەکانی (رێباز وبەرزان) ئاوئەدات و چەمەکانی (شەمدینان وحاجی بەگ و رەواندز و دیلمان)ی لێئەبێتەوە. چەمی خازەر کە لە دەورەبەری هەڵئەقوڵێت لە خۆرئاوای شارۆچکەی (گوێر) ەوە ئەڕژێتە ناوی و لە 45کم  باشووری موسڵدا لە نزیك (شرگات) ئەرژێتە دیجلە.

*زێیبچووك: لە کوردستانی ئێران لە نزیك ناوچەی لاهیجان هەڵئەقوڵێت چەمەکانی (گۆمە و کۆیە و کەندیناوا)ی  تێئەڕژێت. بەنداوەکانی (دوکان و دبس)ی لەدروستکراوە لە نزیك شارۆچکەی فەتحەوە ئەرژێتە دیجلە.

*رووباری عوزیم (خاسە): لە دەورووبەری ناوچەی چەمچەماڵەوە هەڵئەقوڵێت، ناوچەکانی کەرکوك و داقوق و دوزخورماتوو ئاو ئەدات. زۆربەی وەرزەکانی هاوین وشکئەکات لە نزیك شارۆچکەی (بەلەد)ەوە ئەرژێتە دیجلە.

* رووباری سیروان: لە ناوچەکانی سنە ومەریوانی کوردستانی ئێران هەڵئەقوڵێت وئاوەکانی زەڵم و تانجەرۆ و ئەڵوەن و دێوانەی تێئەڕژێت و بەنداوەکانی دەربەندیخان و حەمرینی لەسەر دروستکراوە لە(30کم) خواروی بەغداد ئەڕژێتە دیجلە.

– بەنداوەکان :

*بەنداوی دوکان: ساڵی 1959 دروستکراوە و رووبەرەکەی 270 کم چوارگۆشەیە و (6,8) ملیار مەتر سێجا ئاو ئەگرێت. ئەم بەنداوە بۆ نزیکی ناوچەکانی دەورووبەری زێی بچووك وزێی خاسە کە هاوینان وشکئەکات و ئەکەونە سنووری پارێزگای کەرکوك وهەولێر و دیالەوە بەکارئەهێنرێت کە بە (1300000 دۆنم) مەزەندە ئەکرێت جگە لەوەی (120000 کێلوات)  کارەبا لە

سەعاتێکدا ئەدات مەترسی لافاوی بەهاران لەسەر شارەکانی خواروو کەم ئەکاتەوە.
*بەنداوی دەربەندیخان لەسەر زێی سیروان: ساڵی 1961 دروستکراوە رووبەرەکەی (120کم) چوارگۆشەیە و (3)ملیار مەتر سێجا ئاوئەگرێ بۆ ئاودێری ناوچەکانی خوارووی کەلار و دیالا بەکارئەهێنرێت مەترسی لافاویان لەسەر کەمئەکاتەوە و بڕی (37500 کێلۆوات) کارەبا لە سەعاتێکدا ئەدات.
*بەنداوی دوبز لەسەر زێی بچووك: ئەم بەنداوە لە 8 کم خۆرئاوای شارۆچکەی پردێوە دروستکراوە و شانبەشانی بەنداوی دوکان بەنداوی دوکان یارمەتی نەهێشتنی مەترسی لافاو ئەدات و توانای کۆکردنەوەی (3ملیار) مەترسێجا ئاوی هەیە رووبەرەکەی 26 کم چوارگۆشەیە.جگە لە ناوچەکانی ئاودیری خواری خۆی بڕی 15000 هەزار کیلۆوات وزەی کارۆئاوی لە سەعاتێکدا ئەدات.
*بەنداوی حەمرین لەسەرزێی سیروان: لە کەنارەکانی زنجیرە چیای حەمریندا دروستکراوە رووبەرەکەی (374کم)چوارگۆشەیە و توانای کۆکردنەوەی (3,95 ملیار)مەتر سێجا ئاوی هەیە جگە لە سوود وەرگرتن بۆ کاروباری ئاودێری و نەهێشتنی مەترسی لافاو و توانای بەرهەمهێنانی (50 مێگاوات) وزەی کارەبای هەیە.
*بەنداوی موسڵ لەسەر رووباری دیجلە: دوای ساڵی 1980 دروستکراوە و (55کم) ئەکەوێتە باکووری شاری موسڵەوە، رووبەرەکەی 370کم چوارگۆشەیە و توانای کۆکردنەوەی (13,73 ملیارمتر سێجا) ئاوی هەیە و توانای بەرهەمهێنانی بڕی (1034 مێگاوات) کارەبای هەیە و جگە لەوەی زەوییەکی بەرفراوان ئاوئەدات، مەترسی لافاو لەسەر شاری موسڵ و بەغدا کەم ئەکاتەوە.
ئەمە جگە لەوەی چەند بەنداوێکی تر تەواو نەکراوە وەك بەنداوەکانی (ئەڵوەن و کەوڵۆس و دهۆك) و هەندێکیتر لەژێر لیکۆڵینەوەدایە وەك بەنداوی (عوزەیم و فەتحە )و بەنداوی (بەخمە)ش پەکخراوە.

4. کەشوهەوای هەرێمی کوردستانی ئێراق:

هەرێمی کوردستانی ئێراق ئەکەوێتە نێوان هێڵی پانی (33–37) پلەی باکوورەوە ئەمەش وایکردووە لە هاویندا رۆژ درێژبێت و لەزستاندا کورت، لە مانگی حوزەیراندا ماوەی تیشکی خۆری رۆژانە 14 سەعات زیاترە، بەلاّم لە کانوونی دووەمدا (9,5) سەعاتە.

هەروەها کوردستانی باشوور بەرووبەرە ئاوییەکانی دەریای سپی ناوەڕاست و کەنداو و دەریای سوور و دەریای قەزوین و دەریای ڕش دەورەدراوە و کاریگەریان بۆسەر کەش و هەوای کوردستان هەیە. جگە لەوەی ناوچە شاخاوی و گردۆڵکاوییەکانی کوردستان وا هەڵکەوتووە کە تا بەرەو باکوور و باکووری خۆرهەلاّت بڕۆی زەویەکەی روو لە بەرزبوونەوەیە و بڕی باران و بەفری سالاّنەش روو لە زیادبوونە بە پێچەوانەوە تا بەرەو باشوور و باشوی خۆرهەلاّت بچین زەوییەکان روو لە نزمبوونەوەیە و بڕی بارانی سالاّنەش ڕوو لە کەمبوونەوەیە. پاڵەپەستۆی هەوا وایکردووە بای خۆرئاوا و باکووری خۆرئاوا لە مانگی شوبات تا ئەیلول کوردستان بگرێتەوە بە ئاقاری چیاکانیدا هەروەها بای خۆرهەلاّت و باکووری خۆرهەلاّت و وەرزەبای هەیە بەگشتی ئەکرێت کەشوهەوای کوردستان بۆ دوو جۆری سەرەکی پۆلێن بکرێت: یەکەمیان کەشوهەوای دەریای سپی ناوەڕاست کە ناوچە شاخاوییەکان ئەگرێتەوە کە بە هاوین وشك و گەرمە بە زستان سارد و باراناوییە. دووەمیان کەشوهەوای (سهوب) کە ناوچەی گردۆڵکاوییەکان ئەگرێتەوە و تێکەڵە لە کەشوهەوای دەریای سپی ناوەڕاست و بیابانەکان.

دووەم: توانای کشتوکاڵی هەرێمی کوردستانی ئێراق:

ئاشکرایە کوردستان لە رووی گەشەکردن و قەوارە و دابەشبوون و پێکهاتەی دیمۆگرافی و شارستانی دانیشتوانەوە سامانێکی مرۆیی لەباری هەیە. لە بەرامبەردا خاوەنی سامانی سروشتی سەرزەوی و ژێرزەوی زۆر و زەبەندە کە ئەگەر بە باشی مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت تۆکمەیی و بنکەی ئابووری و

سەربەخۆیی رامیاری و بژێوی دانیشتوان مسۆگەرئەکات، هەروەها خاوەنی زەوی بەپیت و سەرچاوەی ئاوی زۆر و کەشوهەوای لەبار و کەسانی شارەزا و پسپۆڕە بۆ پەرەپێدانی زانستیانە کشتوکاڵ بە هەر دوو باڵی (رووەکی و ئاژەڵی)یەوە، بەگشتی لە کوردستاندا توانای بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی بەم شێوەیەیە:

1. بواری رووەکی :

* چاندن و بەرهەمێنانی دانەوێڵە و تەرەکاڵ وەك (گەنم، جۆ، نۆك، نیسك، ماش، کونجی، گەنمەشامی، پاقلە،کەتان، مەرەزە، لۆکە، گوڵەبەڕۆژە، توتن، چەنەوەریشەکر، بستە و...هتد).

*چاندن و بەرهەمهێنانی سەوزەی  وەك (شوتی، کاڵەك، خەیار،ترۆزی، بامیە، باینجان، تەماتە، کولەکە، بیبەر، پەتاتە، فاسۆلیا، قەرنابیت، کاهوو، کەلەرم، کەوەر، کەرەوس، تەڕەتیزە، پیاز، توور، شێلم، سلق... هتد) .

*چاندن و بەرهەمهێنانی میوەی وەك( ترێ، هەنجیر، هەنار، قۆخ، قەیسی، هەلوژە، چوالە، هەرمێ، گوێز، توو، سێو، پرتەقاڵ، لالەنگی، سندی، نارنج، ترنج، یەنگیدنیا، ترش، گێلاس... هتد).

* زۆری دارستانی سروشتی وەك(بەڕوو، مازوو، قەزوان، گۆیژ)و دارستانی دەستکرد وەك (سەرو، کالیبتوز، چنار، بی، پەلك... هتد).

*بوونی دەیان گژوگیای سروشت بۆ خواردنی مرۆڤ لە هەموو وەرزەکاندا وەك (قارچك، دوومەڵان، قنگر، توڵەکە، زاخ، پەڵپینە، کوزەڵە و دەیان گژوگیای سروشتی بۆ لەوەڕگا وەك (سێپەڕە، وێنجە، شەوەر)، جگە لە دەیان گوڵاڵە و گوڵ و رووەکی پزیشکی و دەوەن و گژوگیای گوێچەم  و رووبارەکان کە هەموویان سوودبەخشن.

2. بواری ئاژەڵی:

* لە کوردستاندا لەوەڕگا زۆرە بۆیە بە ئاسانی و کەمترین تێچوون وەك(بزن، مەڕ، مانگا، گا، وڵاخیبەرزە، کەروێشك بەخێوئەکرێن جگە لە بوونی ئاژەڵی

کێوی وەك(کەڵەکێوی، ئاسك، بەراز، ورچ، چەقەڵ، گورگ، کەمتیار، سەگ، پشیلە کە هەموویان سوودی سروشتیان هەیە.
*بوونی توانایەکی باش بۆ بەخێوکردنی پەلەوەری وەك (مریشك، قەل، قاز، کۆتر، هەنگ...هتد) جگە لە بوونی چەندین جۆری کێوی وەك (کەو، پۆڕ، قەتیٚ، سوێسکە، چۆلەکە، ریشۆڵە، باڵندەی جوانی).
*چەم و رووبار و بەنداوەکان زۆر لەبارن بۆ ماسی و پەلەوەری ئاوی بێجگە لە بواری گەشتوگوزاری بەتایبەتی لە ناوچە شاخاویەکاندا.
ئەگەرچی بوونی ئەو سامانە سروشتیانە بەتایبەتی نەوت و کانزا بەنرخەکان هەمیشە مایەی مەینەتی بوون بۆ کورد، بەڵام بۆ داهاتوو یەکێکن لە پایە گرنگەکانی هێزی دەوڵەت.
سێ یەم : ئاسۆی پەرەپێدانی کشتوکاڵ لە هەرێمی کوردستانی ئێراقدا:
کشتوکاڵ کۆنترین پیشەی مرۆڤە و سەرچاوەی دابینکردنی خۆراك و پۆشاك و بواری کار و دابینکردنی دراوی قورس و کەرەسەی خاوی پیشەسازییە کشتوکاڵییەکان و ئەمنی خۆراکی بووە. ئەمڕۆ خۆراك بەهۆی زۆری دانیشتوان و کەمی بەرهەمەوە گرنگییەکی زۆری پەیداکردووە لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا و رۆڵی گرنگی هەیە لە بازرگانی جیهانیدا وەك چەکێکی ستراتیژی بەکارئەهێنرێت لەلایەن دەوڵەتە بەرهەمێنەرەکانەوە لەدژی نەدارەکان، کە جگە لە کەمخۆراکی و بەدخۆراکی ناچارئەبن ببنە پاشکۆ. ئێراق بەهۆی سامانی نەوتەوە هەمیشە کشتوکاڵی پشتگوێ خستووە، جگە لەوەی کە داهاتەکەی بۆ شەڕ و ململانێی بەردەوام بەکارهێناوە و سیاسەتی چۆڵ و وێرانکردن و بە سووتماککردنی خاکی کوردستان و قڕکردنی دانیشتوانەکەی بە پارەی نەوت ئەنجامئەدا کە بێگومان بە فیڕۆدانی هەر دوو سامانەکە بووە. حکومەتی هەرێمی کوردستانیش لە ماوەی 15 ساڵی تەمەنیدا بەهۆی هەلومەرجی خۆیی و بابەتیەوە نەیتوانیوە وەك پێویست ئاوڕی لێبداتەوە. بۆیە ئەتوانین بڵێین ئەگەر ئاشتی هەمیشە هەبێت ئاسۆی پەرەپێدانی کشتوکاڵ لە

کوردستاندا زۆر روونه و پێویسته بەهیچ شێوەیەك پشتگوێ نەخرێ چونکە بەردی بناغەی پەرەپێدانی کەرتە ئابوورییەکانی ترە. بە گشتی بە رای من پێویستە ئەم خاڵانەی خوارەوە رەچاوبکرێت لە پەرەپێدانی کشتوکاڵ لە کوردستاندا:

1.دامەزراندنی دامودەزگای مۆدێرن و کاریگەر و دانانی فەرمانبەری بەتوانا و شارەزا لە هەموو ئاستە کارگێڕی هونەرییە کشتوکاڵییەکاندا.

2.داڕشتنی ستراتیژیەتی پەرەپێدانی ئابووری هاوسەنگ و هەمەلایەنە بۆ هەموو کەرتە ئابوورییەکان لە پێش هەموویانەوە کشتوکاڵ و تەرخانکردنی بەشێك لە داهاتی نەوت بۆ ئەومەبەستە.

3. چاوخشانەوە بە شێوازی موڵکایەتی زەوی وزاردا و پێدانی زەوی بەو کەسانەی کە توانای کشتوکاڵییان هەیە و حەزیان لێیەتی و هیچ ئیشێکی تریان نییە.

4.بایەخدان بە ئاوەدانکردنەوەی لادێکان و نزیککردنەوەیان لە شار و لەرووی هەلومەرجی ژیان و رێگاوبان و پرۆژە خزمەتگوزارییەکانەوە.

5.بەرزکردنەوەی مووچەی فەرمانبەرە کشتوکاڵییەکان و ناردنیان بۆ نیشتەجێبوون لە گوندەکان وەك مامۆستای خوێندنگاکان و دابینکردنی خانوو بۆیان. بە شێوەیەك کە بۆ هەر گوندێك 3-4 فەرمانبەری کشتوکاڵی لە بوارەکانی(رووەکی، ئاژەڵی، پاراستنی رووەك، پاراستنی ئاژەڵ )دابنرێت.

6. کردنەوەی بانکی کشتوکاڵی لە شار و شارۆچکەکاندا و پێدانی قەرز بۆ جوتیار بۆ مەبەستەکانی (خانوودروستکردن بەپێی نەخشەی ئەندازیاری، بۆکڕینی ئامێری کشتوکاڵی و دروستکردنی شوێن بۆ بەخێوکردنی ئاژەڵ و پەلەوەر و هەنگ و ماسی ).

7. دروستکردنی سایلۆ لەو شوێنانەدا کە بە بەرهەمهێنانی دانەوێڵە بەناوبانگن و کڕینی بەرووبوومەکانیان و دۆزینەوەی بازاڕ بۆیان.

8. بایەخدان بە پیشەسازییە کشتوکاڵییەکان و کڕینی بەرهەمی جوتیاران بۆ ئەو مەبەستە.

9. هێنانی تازەترین تەکنۆلۆجیای کشتوکاڵی تۆ و رووەك و ئاژەڵی بەرهەمبەرز و بایەخدان بە پاراستنی رووەك و ئاژەڵ.

10. کەمکردنەوەی مووچەخۆری بێبەرهەم و ئاراستەکردنیان بۆ کاری بەرهەمهێنان بەپێی نەخشەی هێزی کار.

11. قەدەغەکردنی راوی ئاژەڵی کێوی وداربڕین و سزادانی سەرپێچیکەران بە توندی و دانانی یاسا بۆ ئەو مەبەستە.

12.بەیاخدان بە بواری گەشتوگوزار بەتایبەتی لە ناوچە شاخاوییەکاندا و سوود وەرگرتن لە سامانی ئاوی سازگار بۆ فرۆشتن.

13.زیندوکردنەوەی هەرەوەزییە کشتوکاڵییەکان بە شێوەی ئارەزوومەندانە و بایەخدان بە رێنماییە کشتوکاڵییەکان لە رێگەی دەزگاکانی راگەیاندنەوە بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری جوتیاران و کۆمەڵگای لادێ لە هەموو بوارەکانی ژیاندا.

14–ناردنە دەرەوەی فەرمانبەرە کشتوکاڵییەکان بۆ خولی راهێنانی کورت کورت لەو ولاَتانەی کە لە ڕووی ئاژەڵداری و رووەکییە زۆر پێشکەوتوون.

15. بایەخدان بەپرۆژەی ستراتیژی و تەمەندرێژی کە ئەبنە بەردی بناغەی پەرەپێدانی کشتوکاڵ وەك پرۆژەی ئاودێری بیری ئیرتیوازی.

***


سەرچاوەکان:

1. دکتور شاکر خصباك : العراق الشمالی، مطبعە شفیق، بغداد 1975

2–خەبات عەبدوڵلاّ: بنەما تیۆرییەکانی جوگرافیای عەسکەری کوردستانی باشوور، چاپی دووەم، سلێمانی 2005

3– دکتۆر صلاح الحفید: الوضع الاقتصادی فی العراق واهم مشاكله –شباط .1992

4– مەحمود کەریم ئەحمەد: بەرهەمهێنانی گەنم لە هەرێمی کوردستاندا (1989 –1998) سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی 2003.

## کەناڵی سەحەری کوردی

### لە ڕاگەیاندنەوە بۆ شێوازێک لە هەژموونی داگیرکاری.

**کاریگەری فیلم و زنجیرە دۆبلاژکراوە کوردییەکان لەسەر لاوان لە راپرسییەکدا**

**ئامادەکردنی: ئەرسەلان تۆفیق**

**لە بری پێشەکی:**

**دەمێك بوو هەستم دەکرد لاوەکان (کچان و کوران) ی سنوورەکانی ئێران بە ئاراستەیەکدا دەڕۆن، لەسەر شەقامێك رێدەکەن ئەو سەرەکەی دەیانگەیەنێتەوە ئێران بە مانا فراوانەکەی، ئەو هەستەش ئەو ساتە لام گەلاڵە بوو کە بینیم لاوان وەك ئەوان پۆشاك لەبەر دەکەن و وەك ئەوان ماکیاژ دەکەن و هەڵبژاردنی رەنگەکانی جلوبەرگیشیان هەر لەوان دەچن، لەناو کاسێت و سیدی ماڵەکانیشدا هێندەی فیلم و زنجیرە و گۆرانیە فارسی و ئێرانیەکان هەن ئەوەندە کوردییەکان و ئەوانی تریش پەیدا نابن !! یان کچان و کوڕانی ئەو ناوچانە وێنەی گۆرانیبێژو هونەرمەند و ئەکتەرە قۆز پێکەوتووەکان بە بەرگی کتێب و دەفتەرەکانیانەوە دەکەن و خۆیانی پێوە دەنوێنن لە قوتابی سەرەتاییەوە بگرە تا ئامادەیی و پەیمانگا و کۆلیژەکانیش .. ئێمە حەقمان**

بەسەر ئەوەوە نییە ئەوانە باش دەکەن یان خراپ، نە هەڵیاندەنێین و نە سەرکۆنە و لۆمەشیان دەکەین، بەڵکو لەمیانەی ئەو لێکۆڵینەوەماندا شێوازی کاریگەری و چۆنیەتیەکەی دەخەینەروو و ئەوە و لاشی بەجێدەهێڵین بۆ خوێنەر .

## کاریگەری رۆشنبیری ئێران:

ئەدەب و هونەری ئێرانی بە شێوەیەکی گشتی لە ئاستێکی بەرچاوی جیهانیدایە بە شێوەیەك سالانە چەندین بەرهەمی جۆراوجۆریان بەشداری فیستیڤاڵ و پێشبرکێ جیهانیەکان دەکات و تا ئێستاش چەندینیان خەلاتی سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە.. ئاخر ئێرانێك خاوەنی سەدان ساڵەی ئەزموونی دەسەلاتداری و حکومەتکردنن، ئێرانێك لە پاشخان(خلفیە) ێکی هونەری و رۆشنبیری زۆر فراوان و گەورە ئاخاوتن دەکات، دەوڵەتێك بە هەموو توانا و ئیمکانیتیەوە دەیەوێت کارێك بکات دوانەکەوێت لە ململانێیەك کە سەراپاگیر و گشتگیرە، بۆیە دەبێ چاوەڕوان بین ئەو دەراویشتانەی کە لە رێگەی ئەدەب و هونەر و لایەنەکانی ترەوە دەبێت کاریگەربێت و جێگە بگرێت و لە پاش خۆی پاشماوەیەك بەجێبهێڵێ کە شیاوی هەوڵ و ماندووبون و ئەو خەرجیانە بێت کە بۆ پرۆژەکانیان دەکرێت .

ئێران بەو هەموو ئیمکانیاتەوە، ئێمەش بەو سەرەتایی و سادەیی و کەمتەرخەمیەوە، ئەوان لەو سەرەوە ئاخاوتن دەکەن و ئێمەش لەو خوارەوە گوێگرین، ئەوان دەبزaوێن و ئێمەش تەماشا دەکەین . بۆیە کاریگەرییەکان دەکرێ بەشتێکی ئاسایی وەربگیرێ لەسەرمان و بێ ئەوەی بە خۆمان بزانین(هەڵەبجەو شارەزوور و خورماڵ) وەك (پاوە و مەریوان) وابێ و ئەو

بەرهەمانەی لەوێ هەبن، ئەو ئەکتەر و گۆرانێبێژانەی لەوێ دەناسرێن، لێرەش بناسرێن.. ئیدی گرنگ نییە کورد بن یان فارس هەمووشمان کاریگەری کەناڵەکانی راگەیاندن بەتایبەتی تەلەفزیۆنەکان دەزانین .. لێرە لەم مەملەکەتە فرە خاوەن و بێ خاوەنەدا نە چاودێری هەیە و نەکەس بەکەسە .. هەرکەس و لایەنێ بەرهەمی جۆراوجۆر ئامدیو دەکات.

رەنگە ئەم باسەی ئێمە بەلای هەندێك کەسەوە ئەو بایەخەی نەبێت و بڵێن بادینی و هەولێریەکانیش ئەوەندە گرنگی بە هونەری تورکی دەدەن بە ئەندازەی بایەخدانی سنوورەکەی ئێمە بە ئەدەب و هونەری فارسی دەدەین .. گەر بەبازارەکانیاندا تێپەڕین لەشوێنێکەوە گوێمان لە گۆرانیەکی کوردی دەبێت لە دەیان شوێنەوە گۆرانیە تورکیەکانمان بەرگوێ دەکەوێت.. ئەو وتەیەش راستەو بەهەند وەردەگیرێ کە (ئێمەی کورد لە سێ لاوە لە ژێر کاریگەری کلتور و رۆشنبیری بێگانەکانداین، لەرۆژهەڵاتەوە فارس و لە باکورەوە تورك و لە باشەر و خۆرئاواشەوە عەرەب ) بەڵام ئەوەی کەجێگەی باس و سەرنجی ئێمەیە کاریگەرییەکانی رۆژهەڵاتی کوردستانە(فارس) لە سەر ناوچەیەکی دیاریکراوی وەك (هەڵبجە و شارەزوور و هەورامان) .. دەشکرێت لە سۆنگەی باسەکەوە هەندێ لێکچوون هەبن و حاڵتەکان بۆ ئەو سنوورانەش هەمان حاڵەتەکانی ئێرە بن و جۆرێك خزمەت بە خوێنەران بکات بەشێوەیەکی گشتی ..

بۆ ئەوەی زیاتر بچینە ناو باسەکەمان دەکرێت خوێنەر هەندێك خاڵ رەچاو بکات تا رێگاکانی کاریگەرییەکەی لا روونتر بێت :

1. پێکهاتەی ئەم ناوچەیە پێکهاتەیەکی تێکەڵاوی کۆمەڵایەتییە لە گەڵ کوردستانی رۆژهەڵات و زۆربەی عەشیرەت و بنەماڵەکان دابشبوون بەسەر (ئەمدیو) و (ئەودیو)دا، بۆ نمونە هەڵەبجە(هەورامییەکان، ئێناخیەکان، کاکەییەکان، ئیمامیەکان و ئەوانی تریش) ئەمەش خاڵی تێکەڵبوون و

کاریگەری دروستکردنە لە سەریەکتری لە هەموو رووەکانەوە و هەورامان و شارەزووریش لەم حاڵەتە بەدەر نین.

2. شوێن و جیۆپۆلۆتیکی ناوچەکە، لە کاتی شۆرشی کورددا پێگەیەکی زۆر باشبوو بۆ باڵە جیاجیاکانی شورشە یەك لەدواییەکەکان و داڵدەدانی شۆڕشیش لە لایەن ئێرانەوە بۆ مەبەستی جیاجیا، یەکێکی تر بووە لەو خاڵانەی کەهانی خەڵکەکەی داوە بۆ تێکەڵاوی و سەرەتاییترین دەستپێکی تێکەڵاویش فێربوونی زمانە بەتایبەتی لە ڕێگەی کەسوکاری پێشمەرگەوە کە ئاوارەی شار و ئۆردوگاکانی ئەو وڵاتە ببوون .

3. ساڵی 1988 کاتیٚ کیمیابارانی هەڵەبجە و دەوروبەری کرا بوویە هۆی ئاوارەبوونی خەڵکی تەواوی ناوچەکە و زۆربەیان رووە و ئێران رۆشتن و زۆرینەشیان لە ناوچە سنوورییەکان نیشتەجێنەکران و بردنیانە قووڵاییەکانی خاکی ئێران و ئەمەش بووە هۆکارێکی گەورە بۆ فێربوونی زمان و ئاشنابوونیان بە رەوشی کۆمەڵایەتی و کلتوری فارسی با لە شێوەیەکی سادە و ساریشدا بووبێت .

4. جارێکیتر لە راپەڕینی بەهاری 1991 دا زۆرینەی خەڵکی سنوورەکە و بگرە زۆرینەی ناوچەکانی سلێمانی وگەرمیان و کەرکوکیش بەناچاری چوونە ئێران و ژمارەیەکی زۆریشیان تا ئەم دووایییەش نەگەڕابوونەوە و هەندێکیشیان لەڕێگەی ژن و ژنخوازییەوە بەتەواوی تێکەڵاو بوون.

5. گەڕانەوەی ئەو خوێندکار و مامۆستایانەی کە لە ئێراندا درێژەیان بە خوێندن داوە و بە تەواوی فێری زمان و تا رادەیەکیش کردار و رەفتاری ئەوانیان هەڵگرتووە ئێستە رێگەیان پێدراوە کە وانەی زانکۆ و پەیمانگاکان بڵێنەوە یان درێژە بە خوێندنەکەیان بدەن.

ئەو خاڵانە و چەندانی تر هۆکاری گەورە بوون بۆ کاریگەری و درێژ بوونەوەی دەسەڵاتی رۆشنبیری و هەونەری ئێرانیەکان لە سەر ناوچە سنوورییەکانی ئێمە (کە ئێمە ناومان لێناوە بە جۆرە داگیرکاری یەك لەرووی

کلتور و رۆشنبیرییەوە)، لە گەڵ ئەمەشدا خەڵکانێکی زۆریش هەبوون کە هەم زمانی فارسیان نەدەزانی و هەم فرسەتی تێکەڵاو بوونیان لە گەڵ ئێرانیەکاندا بۆ نەرەخسابوو بۆیە دەکرێ بگوترێ دامەزراندنی کەناڵی ئاسمانی سەحەر لە دەورو بەری ساڵی 2000 دا دوو کاتژمێری لە شەو و رۆژدا بۆ زمانی کوردی تەرخان کرد، دەتوانین بڵێین بە کۆمەڵە بەرنامەیەکی ئامانجدارەوە هاتە ناو میدیای کوردی و پاشان کەناڵە کوردییە حیزبییە ناوخۆییەکانی خۆمان کەوتنە گواستنەوەی بەرنامە و فیلم و گۆرانی و تەنانەت وێنەی سروشت و هەواڵەکانیشیان با زۆرکاتیش لە زیان و بەرژەوەندی میللەت وئلین و نیشتمانەکەشمان بووبێت، تا کار گەشتە ئەوەی لە سلێمانی کەناڵیکی تایبەت و ستۆدێی تایبەت بکەنەوە و پەخشی لێوە بکەن .

سەحەر هەنگاوێکی چاوەروان نەکراو بوو لەئێراندا بەو هەنگاوەشی توانی دەرگایەکی پەیوەندی زۆر لەگەڵ کوردەکاندا بکاتەوە و بەشی وەرگێڕان و دۆبلاژی ئەو کەناڵە دەستیکردە دۆبلاژ کردنی زنجیرە تەلەفزیۆنییە فارسیەکان بۆ سەر زمانی کوردی بەشێوەکی زۆر سەرکەوتوو لەئاستێکی هونەری بەرزدا کە گونجاو بێت لە گەڵ وتار و گوفتاری کۆمەڵایەتی گشتیدا بە زمانێکی (عامیە) ی خەڵکی و ئەمەش بوویە هاندەرێکی گەورە بۆ تەماشاکردن، دواتر هەندێك کەناڵ ویستیان بە رچەکەی سەحەردا بڕۆن بەڵام سەرکەوتوو نەبوون، هەرچۆنێك بێت سەحەر و بەشی دۆبلاژی ئەو کەناڵە بوییە کلیلی کردنەوەی پەیوەندی و ئاشناکردنێکی جەماوەری کوردستانی ئێمە لەگەڵ رۆژهەڵات و کەلتوری ئەو ولاتە بە هەژموونە.

هەلومەرجی تایبەتی ناوچەی راپرسیەکە:

لەپێش راپەڕینەوە دەسەڵاتێك کە لە ئێرانەوە نزیك بوو لە ناوچەکەدا حوکمدارییان دەکرد و کەناڵە جیاجیاکانی ناوچەکەش بە حیزبی سۆسیالستیشەوە بەردەوام کەناڵی سەحەریان دەگواستەوە، هەژاری و کەم

دەستی بەرهەمی تەلەفزیۆنی بزووتنەوەی ئیسلامیش کە بە بەرنامەکانی سەحەر پڕ دەکرایەوە دواتریش یەکگرتوو و ئێستەی کۆمەڵیش هەلومەرجێکی تایبەت و یارمەتیدەرێکی باشبوون بۆ بلاۆبوونەوە و ناساندنی بەرهەمە بەکوردیکراوەکانی سەحەر، دەاتریش دوکانی سێدی فرۆشەکان کەوتنە کۆپیکردنی بەرهەمەکانیان و ئیدی فیلمی کوردی و زنجیرەی کوردی دۆبلاژ کراوی فارسی بوویە میوانی یەك بە یەکی ماڵەکانمان و لە زنجیرەی پیاوانی ئەشکەوتەوە بگرە تائاوازی قاز و ئەوانی تریش، دواتریش بە سەرنجدانێکی خێرای لاوانی سەرجادە و خوێندکارانیشدا و لە رازاندنەوەی دوکانەکان و گۆڕینی (گەلەبی –حجاب) دەستور عەرەبی بۆ (مانتۆ) ی ئێرانی بە ئاشکرا و خێرا هەستپێکرا.

هەلومەرجی دەسەلأتداری هەندێك هێز و گروپی ناو بزوتنەوەی ئیسلامی ئەوسات دەستیان نابوویە بینی خەڵك و زۆرشتیان قەدەغە دەکرد و دەستیان دەخستە کاروبارە ئەوپەڕە کەسیەکان و تەنانەت حوکمی سمێڵ و ریشی هەموو پیاوێك و سەرپۆش و ماکیاژی هەموو ژنێکیان دەکرد، وەك حکومەتێك خۆیان دەنواند و دەیانویست هەموو کەس وەك ئەوان بێت، دەسەلأتیان لە ناوچەکەدا هۆکارێکی گەورە بوو بۆ شاردنەوەی هەندێك شت و رەفتار کە بە بڕوای من کە ئەگەر بەکارێکی ئاسایی وەربگیرایە و هێندەش قورس نەکرایە ئێستە (ردالفعل) ەکەی ئەوەندە گەورە نەدەبوو، ئێستە زۆرێك لە ریشدارەکان سمێڵەکانیشیان نەماوە و زۆرێکیش لە دەستکێش لە دەستەکان مانتۆ و شەرواڵی ئێرانی فەتحە درێژیان لەبەردایە و ماکیاژەکەشیان سەرباری هەمووی، نەك چاوبڕکێ و تەماشاکردن بە ئاسایی وەرناگرن بەڵکو زۆریان خۆیان بە مەغدور دەزانن کە قۆناغێك لە تەمەنیان تێپەریوە و ئەو شتانەیان لە دەستچووە..؟ !

یەکێك لەو دیاردە گرنگ و سەرنجڕاکێشانەی فیلم و زنجیرە ئێرانیە بە کوردی کراوەکان، بوونی دوو کارەکتەری کچ و کوڕە و نمایشی جۆرە

خۆشەویستییەکی سەرنجڕاکێشە کە لەم ساڵانەی دوایدا لە کەناڵە سینەمایی و ڤیدیۆیی و تەلەفزیۆنیەکانەوە ڕێگەیان پێدرا، خۆشەویستییەك تەنها لە سیاقی وتە و بینین و بیستندا کورت هەڵدێت و وەك فیلمە بیانیەکانیتر، کە بە بڕوای من ئەمە پاڵنەرێکی زۆری تەماشاکردنی ئەو فیلم و زنجیرانەن و بگرە لەم ڕێگەیەشەوە فێری جۆرە خۆشەویستییەکیان دەکات و پەیوەندییە نائاساییەکان نۆرماڵ و ئاسایی دەکاتەوە و لە ناخەوە لاوان ئامادە دەکات کە بەدووی کەسێکی لەو شێوەدا بگەڕێن و لەسەر بنەمای لاسایی کردنەوەوە هەندێك هەنگاو هەڵبگرن و سەرجەم خێزانەکانیش بەدایك وباوك و خوشك و براکانیشەوە (پێکەوە) تەماشای بکەن و کچان سەرنجی کوڕەکان بدەن و کوڕەکانیش تەنها کچەکان ببینن..!! لەبەر ئەوەش کە (بدیل) لەوە باشتر نییە بۆ خێزانەکان بەناچاری دادەنیشن و پێکەو گوێ لەچیرۆکەکانی (سام ونێرگس)و (میوانی دوور ولات) و (ئاوازی قاز) بگرن، ئەوان بەر لەوەی بیر لە فیکرەی فیلم و ئامانجی فیلمەکە بکەنەوە جوانی و ساف و لووسی ئەکتەرەکان و پلانەکانی یەکتر بینین فێری گەنجان دەکات .. بەر لەوەی حیوار و مشتومڕە سەرەتاییەکانی فیلم و زنجیرەکان کاریگەرییان هەبێت و لە پەڕەی دەفتەر و یاداشتی یەکێکیاندا تۆمار بکرێت وێنەکانی (سیتا) و (رامین) و (محەممەد ڕەزا گولزار) و چەندانی تر بەبەرگی کتێب و دەفتەرەکانیانەوە دەدرەوشێنەوە و بە خۆشیان نازانن کە ئەوانە (دڵ ودەروون و ڕۆشنبیرییان) داگیرکراوە.

راپرسی سەنگی مەحەکە:

ئەوەی کە پێشتر گوتمان ئەگەر راپرسیەکی مەیدانی پاڵپشتی نەکات، لە رووی زانستی و توێژینەوەوە کاڵ و کرچ دەردەچێت و لەوانەیە کەسێك رای پێچەوانەی هەبێت، بەلام ئەگەر راپرسییەکی رێژەییمان لە بەردەستدا

هەبوو ئەوا لانی کەم لە رمڵلێدان و لە خۆوە قسەکردن دەرباز دەبین و هەنگاوێك باسەکە بەرەو ئەکادیمی بوون دەبەین.

پاش وردبوونەوە و رامانێکی زۆر گەشتینە ئەو ئاکامەی کە لە رێگەی (12) پرسیارەوە (100) کچ و کوڕی خوێندکاری پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانی هەڵەبجە بدوێنین بەبێ ناوهێنانیان وەڵامەکانمان بدەنەوە و رای خۆیانمان پێشکەش بکەن کە پێم باشە هەر لێرەوە سوپاسیان بکەم .

فۆرمی راپرسیەکەش بەم شێوەیە :

1. رەگەز : نێر مێ تەمەن ساڵ .

2. ئایا سەیری زنجیرە تەلەفزیۆنییە کوردییە ئێرانییەکان دەکەیت؟ نەخێر زۆر کەم

3. ئایا سەیری فیلمە فارسییەکان دەکەیت؟

نەخێر زۆر کەم .

4. لە چ کەناڵێکەوە تەماشای دەکەیت؟

سەتەلایت کۆمەڵ یەکگرتوو بزوتنەوە .

5. ئایا چەندە سەیریان دەکەیت و حەزیان لێدەکەیت؟

زۆر کەم مام ناوەندی هیچ .

6. ئایا چ شتێك لەو فیلم و زنجیرانە سەرنجیان ڕاکێشاویت؟

فیکرە وتە جلوبەرگ ماکیاژ پەیوەندی کۆمەڵایەتی

7. ئایا حەزدەکەیت وەك ئەوان بیر بکەیتەوە؟

رەفتاربکەیت قسە بکەیت جلوبەرگ بپۆشی ماکیاژ بکەیت

8. جۆری خۆشەویستی نێوان کچان و کوڕانی ناو زنجیرە و فیلمەکان چۆن دەبینی؟

باشە خراپە ئاساییە

9. ئایا ریکخستن و تەرتیبکردنی ناو ماڵ و جلوبەرگ و بابەتی زنجیرە و فیلمەکان سەرنجیان راکێشاوی؟

**بەڵێ        نەخێر       تاڕادەیەك**

10**. بە شێوەیەکی گشتی کاریگەری ئەو زنجیرە و فیلمانە لەسەر هەڵسوکەوت و رەفتارت چۆنە؟**

**زۆرە         کەمە         مام ناوەندییە**

11**. لە رووی بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیرییەوە کاریگەرییان لەسەرت چەندە؟**

**زۆر       کەم        مام ناوەندی**

12**. چ زنجیرە یان فیلمێك سەرنجی راکێشاوی و بۆچی ؟**

(            ) **تکایە بە کورتی**

**خوێندنەوەی راپرسییەکە بە ژمارە:**

**ژمارەی فۆرم** : (100) **فۆرم** .

1**. کوڕ** : (40) **کەس، کچ** : (60) **کەس – تەمەن لە نێوان** (19 ـ 35) **ساڵ** .

2**. کوڕ**: (4) **نەخێر**، (28) **زۆر**، (8) **کەم** .

**کچ** : (6) **نەخێر** (48) **زۆر** (6) **کەم** .

3**. کوڕ** (10) **نەخێر**، (19) **زۆر**، (11) **کەم** .

**کچ** : (12) **نەخێر** (37) **زۆر** (11) **کەم** .

4**.** (40) **سەتەلایت**، (35) **کۆمەڵ**، (10) **یەکگرتوو**، (15) **بزوتنەوە** .

5**. کوڕ**:(19)، (6) **کەم**، (13) **مام ناوەندی**، (2) **هیچ**

**کچ** (32) **زۆر** (10) **کەم**، (12) **مام ناوەندی**، (8 ) **هیچ** .

6**. کوڕ**: (7) **فیکرە**،(19) **وتە**، (5) **جل وبەرگ**، (1) **ماکیاژ**، (8) **پەیوەندی کۆمەڵایەتی** .

**کچ** : (8) **فیکرە**،(25) **وتە**، (9) **جل وبەرگ**، (7) **ماکیاژ**، (11) **پەیوەندی کۆمەڵایەتی**.

7. **کوڕ:** (15) **بیرکردنەوە**، (5) **ڕەفتارکردن**، (7) **قسەکردن**، (11) **جل وبەرگ**، (2) **ماکیاژ** .

**کچ** : (10) **بیرکردنەوە**، (9) **ڕەفتارکردن**، (22) **قسەکردن**، (13) **جل وبەرگ**، (6) **ماکیاژ** .

8 **. کوڕ** : (16) **باشە**، (5) **خراپە**، (19) **ئاساییە** .

**کچ** : (25) **باشە**، (13) **خراپە**، (28) **ئاساییە** .

9**. کوڕ:** (22) **بەڵێ**، (5) **نەخێر**، (13) **تارادەیەك** .

**کچ** : (40) **بەڵێ**، (9) **نەخێر**، (11) **تارادەیەك** .

10**. کوڕ:** (9) **زۆر** (14) **کەم**، (13) **ناوەندی**، (4) **هیچ** .

**کچ** :) **زۆر** (14) **کەم**، (13) **ناوەندی**، (4) **هیچ** .

11 **. کوڕ:** (15) **زۆر**، (4) **کەم**، (20) **ناوەندی** . (1) **هیچ** .

**کچ** : (22) **زۆر**، (8) **کەم**، ( 23) **ناوەندی** . (7) **هیچ** .

.12

**ا. میوانی دوور وڵات (سیتا)** : 39

**ب. پیاوانی ئەشکەوت (اصحاب الكهف):** 22

**ج . ئاوازی قاز** : 16

**د** : **سام ونێرگس** : 16

**هـ . دوای باران** : 5

**و** : **خاب و بیدار** : 2

**ئەوانەی سەرەوە زمانی ژمارەیی ئەو ڕاپرسییە بوو کە ئەنجامدراوە و دەکرێ تارادەیەك لە ڕاپرسییەکی زانستییەوە نزیك بێت، لەو شوێنانەدا کە پێویست بووبێت ڕێژەی کوڕان و کچانمان جیاکردووەتەوە، لێرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە کاریگەری ئەو فیلم و زنجیرە دۆبلاژ کراوانە تا چ ڕادەیەکە و**

**چەندەش لاوانی ئەم سنووره بە کچ و کوڕەوە ئامادەگییان تێدایە بۆ کەوتنە ژێر کاریگەرییان .**

**جیاوازی کچان و کوڕان لە راپرسیەکەدا:**

**ئەو گریٚ و لوغزانەی کە فیلم و زنجیرە ئێرانیەکان لە ناخیاندا حەشاریانداوە کۆمەڵە شتێکن کاریگەری سۆزداری زۆر لەسەر بینەر بەجێدەهێڵن و ئەو دەربڕین و دەستەواژانەش کە بەکار دەهێنرێن مەسەلەکەیان کاریگەرتر و قووڵترکردووەتەوە، بۆیە دەبینین کچان زۆرتر تەماشادەکەن و زۆرتریش دەکەونە ژێر کاریگەریەکان، ئاخر باگراوندی پەروەردەی کچان لەم مەملەکەتەدا ناسکتر و سۆزدارانەترە لە کوڕان و لەبەر ئەوەش کەمتر لەگەڵ رووداوەکاندا رووبەڕوو دەبنەوە و کوڕان زیاتر دەست و پەنجە لە گەڵ کێشەکاندا نەرم دەکەن لەچاو کچاندا، هەر بۆیە هەست و نەستی سۆزداری لای کچان و ژنان هەستیار تر و ویژدان و لایەنی ورووژانیان بە خەبەرترە، ژمارەکان ئەو راستییە زیاتر دەسەلمێنن و وەڵامی پرسیارەکانیش بە ئاشکرا هاواردەکەن .**

**پێم چاکە ئەوەش بۆ خوێنەری بەڕێز روون بکەمەوە کە من حاڵەتی کەوتنە ژێر کاریگەری لە سەداسەد رەتناکەمەوە و بە حاڵەتێکی مرۆڤانەی تەواوی دەزانم، بەو ئەندازەیەی مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە بەو ئەندازەیەش دەبێت چاوەڕوانی ئەوەی لێبکرێت کاریگەری لەسەریەک**

دروستببێت، هەر لە رێگەی کاریگەریشەوە ژیارەکان و کلتور و رۆشەنبیرییەکان تێکەڵاوی یەکتر دەبن وسوود لە ئەزموونەکانی یەکتر وەردەگرن. من بڕوام وایە کاریگەری وەك دیاردەی سروشتی (بەرز و نزمی پەستان)ە، لە هەر جێگەیەك پەستان بەرز بێت لەێوە با هەڵدەکاتە سەر ناوچە پەستاننزمەکان و ئەو بایەش هەڵگری هەموو ئەو سیفەتانەیە کە لە ژینگە و شوێنەکەیدا هەن، بەمانایەکی تر ئەگەر ئەو بایە لە شوێنێکی فێنك و شێدارەوە هەڵبکات جیاوازە لەوەی کە لە شوێنێکی کرێن و وشکەڵانەوە بێت.

قسەی من لەسەر ئەوەیە ئەگەر ئێمە خۆمان لە دەفرێکی خاڵی، لە شووشەیەکی بەتاڵ بچین، ئەوا بەدڵنیاییەوە بە بیٚ ئەوەی بە خۆمان بزانین دەروونمان، رۆشەنبیری و رەفتار و گوفتارمان پڕدەبێت لە شتەکانی ئەوانی تر و دەبینە گوێزەرەوەی رەفتار و گوفتارە هاوردەکان و بۆ دواجاریش داگیرکراو(مستعمرە)ێکی تەواوەتی بێدەنگوباس دەبین !! داگیرکراوێك بەدڵ و دەروونی خۆمان هەڵمان بژاردووە و بە دڵخۆشی و حەزی خۆمانەوە بەرەو سوپای داگیرکەر رۆشتووین .

فیلم و زنجیرە هەڵبژێراوەکان:

ئەو فیلم و زنجیرانە کە ناویان هاتووە من بۆ خۆم بە فارسی و بە کوردیش بینیوە و لێشتان ناشارمەوە هەندێکیان کاریگەری زۆریان لە سەر دروستکردووم و بگرە هەندێك دیمەن و حیواری وایان هەیە بە شێوەیەك لە بیرمدا ماوەتەوە کە دەکریٚ بڵێم وەك رێنما و چاوساغێك لە ژیانمدا رۆڵیان هەیە، دەکریٚ ئاماژەش بەوە بکەم مەرج نییە منیش لە گەڵ هەڵبژاردنەکەی لاواندا بم و دەنگ بۆ ئەوانە بدەم کە ئەوان هەڵیانبژاردووە، چونکە دیدگا و

**جیهانبینی من جیاوازە لەوان و پێدەچێت لە تەمەن و ئاستی رۆشنبیری جیاوازیشمانەوە سەرچاوە بگرێت ... بەهەرحاڵ**

**لە فیلمەکاندا (ئاوازی قاز) و(سام ونێرگس) زۆرترین دەنگیان بەدەستهێناوە و بە یەکێك لەو فیلمانە دەستنیشان کراون کە لاوان زۆر تەماشای دەکەن و بە کورتی هۆکارەکەشیان گەڕاندووەتەوە بۆ:**

**1. پەیوەندی خۆشەویستی نیوان کچان و کوڕان بە ئاشکرا و بە شێوەیەکی سەرنج راکێشانە و هونەرمەندانە خراوەتە بەردەست و بە ستایلێکی نزیك لە دیدگا و جیهانبینییەکانی لاوانی سنوورەکە بە کچ و کوڕەوە ئامادەکراوە، چونکە ئەو جۆرە فۆرمەی خۆشەویستی کە تەنها لە جوغزی گفتوگۆ و نیگاکردن و مەسیج گۆڕینەوە و ئیمەیل کردندا قەتیس ببێ لە دونیای فەنتازی خەیاڵ و ڕۆح نەگوازرێتەوە بۆ دونیای جەستەو شەهوەت کە لەم سنوورەدا باوە، تا رادەیەکی بەرچاو وەك یەك تەماشا ناکرێن و حیساباتیان وەك یەك نییە .. هەرچەندە من بۆچوونم وایە زۆر کچ و کوڕ هەن تەنها بە جەستەو لایەنی فیسۆلۆژی ومادیات کچ و کوڕن، ئەگینا بە رۆح و ناواخن سایکۆلۆژی ژن و پیاوێکن ئاو لێڵ ناکەن .. ئاخر زۆر کچ هەیە بە ئەندازەی ژنانی مێرددار یا بێوەژنەکان دەم لە مەسائیلە زۆر تایبەتەکان دەکوتن و شارەزاییان تێدا هەیە، و کوڕانیش بە قەدەر پیاوێکی زۆر شارەزا دەزانن . ئیتر مەگەر تەنها لە رووە تقلیدی و مادیەکەیەوە پێیان بگوترێ کوڕ و کچ ئەگینا حەق وایە پێیان بگوترێ ژن و پیاو، بۆیە فیلمەکانی سام و نێرگس تەقە لە دەرگای خۆشەویستییە (وەك دەڵێن) پاکەکان دەدەن و هەموو هەم و غەمێکیشیان بریتییە لە بەیەکگەشتن و بۆیەکتری بوون و پێکهێنانی ژیانێکی پێکەوە بوون و وەك لەپێشەوەش باسم کرد ئەم شێوازی خۆشەویستی و حەز لە یەکتریکردنە لە ناوچەکەدا باوە و دەکرێ لەو روانگەیەشەوە هەڵبژێرابن کە موعاناتەکانی**

**کچان و کوڕانمان لە یەکەوە نزیکن باس لە گرفتەکانیان دەکات، کە زۆربەیان لە هۆکاری هەڵبژادنەکەیاندا ئاماژەیان پێداوە .**

2. **پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ناو ئەو دوو فیلمە مایەی سەرنجڕاکێشانی کچان و کوڕان بووە، دەستەواژەی پەیوەندی کۆمەڵایەتی کە زۆربەی کچەکان بەکاریانهێناوە من پێموایە زۆربەیان لە شەرمکردنێکەوە یان بەهەر هۆیەکی تر نەیانتوانیوە راستەوخۆ هۆکاری پەیوەندی خۆشەویستی نێوان کچان و کوڕان ئاماژە پێبکەن، خۆ ئەگەر مەبەستیشیان ڕێگریەکانی دایکان و باوکان بێت لە ڕێڕەوی بە یەکنەگەشتنی خۆشەویستان، ئەوا دەبێت بڵێین ئەو جۆرە دەستتێوەردانە تا ئێستەش لە ناو زۆر خێزاندا ماوە و پەیڕەو دەکرێت، بە ئەندازەیەك لە هەندێ خێزاندا ئەوەندە دەستتێوەردانەکە رەنگی داوەتەوە کە بوون و وجودی کچ و کوڕەکانیان سفرکردووەتەوە و وەك خۆیان دەڵێن لە کاتی شووکردنیشیاندا دایك و باوك و خوشك و براکانیان حسێبە !! لە کاتێکدا کە کوڕ و کچ ژیانی نوێ دروستدەکەن و نەخشەی خێزانێکی نوێ دادەڕێژن کە لەوانەیە ئەوەندە دیدوبۆچوون و دونیابینیەکانیان لە یەکەوە دووربێت بە ئەندازەی ئاسمان و ڕێسمان، لەوانەیە کوڕ و کچێك بە مانای کەلیمە تەواوی تەرح و بۆچوون و هەڵوێست و دنیابینییەکانی دایکان و باوکان و برا و خوشکەکانیان بەلاوە رەفز بێت و بیانەوێت جۆرێك بژین کە خۆیان دەیانەوێ، جۆرێك هەڵسوکەوت بکەن کە خۆیان مەبەستیانە، با دایکان و باوکانیش بڕوبیانووی دڵسۆزی و شارەزایی زیاتر و دونیادیتەیی بێننە بەرباس، بەڵام ناکاتە ئەوەی کوڕ و کچێکی گەنجی ئەم سەردەمە ئیجبار بکەیت کە وەك بیست سی ساڵ بەر لە ئێستە بژین و بیر بکەنەوە و هەڵسوکەوت بکەن، بە بڕوای من ئەوەش هۆیەکی تری هەڵبژاردنی ئەو فیلمانەیە.**

یاخی بوون له دەسەڵاتی چەپاندن و ڕێگەگرتن له بینینی کچان و کوڕان له ئەمڕۆدا نەك هەر شتێکی ئاساییانیه بەڵکو لەسایەی تەکنۆلۆژیا و رازی نەبوون به بێدەنگی و وەستانەوه له ڕووی سیستەمی خێزان و دەوڵەتیشدا به ئاشکرا هەستپێدەکرێت و ئەگەر ئەمڕۆ کچ و کوڕێکی ئەم ناوچەیه بۆخۆیان به قورسی بزانن بەڵام دەستخۆشی لێدەکەن و له فیلمەکانی سام و نێرگس و ئاوازی قازدا دەبێته مایەی سەرنجراکێشانیان و دەستخۆشی لێدەکەن!! قەستیانه پەلاماری ئەو دایك و باوك و پۆلیسانه بدەن که ڕێگرن له بەردەم به یەکگەشتن و یەکتربینین و پیاسەکردنێکدا.

هەرچی زنجیره دۆبلاژکراوەکانیشه (میوانی دوور وڵات) و (پیاوانی ئەشکەوت) زۆرینەی دەنگەکانیان بەدەستهێناوه و ئەمەش به بێ هۆ نییه و دەکرێ ئاماژەگەلێکی قووڵ و هەستیاریان هەبێت، وا لەچەند خاڵێکدا کورتیان دەکەینەوە:

1. هەڵبژاردنی ئەکتەری قۆز و جوانخاس و پێکەوتوو و شیك له کچان و کوڕان هۆکارێکی زۆرکاریگەره به تایبەتی له کارەکتەری (سیتا . رام) و (هێلین – ماکسیمیلیان).

2. نیشاندانی خۆشەویستی نێوان کچان و کوڕان به ستایلێك که لەم ناوچانەدا باوه .

3.حیوار و گفتوگۆ سەرنجڕاکێش و پڕ له ئەدەبیاتەکەیان، بەتایبەتی ئەو وەرگێڕاوانەی که (رایەڵەی جیهانی سەحەر)جێبەجێیان کردووه، چونکه نەك له کرۆك و ڕۆحی فیلمەکەیان کەم نەکردووەتەوه بەڵکو ئەگەر کەسێك زۆر شارەزا نەبێت هەست ناکات دۆبلاژکراون و (تقنیات)و به خەرجدانی لایەنی هونەری

وێنەگرتن و مۆسیقا و دیکۆرات و ئێکسسوار و پاڵپشتی دەقی مێژوویی و چەندانی تر.

ئەو فیلم و زنجیرانەی تر بەڕێژەی کەم بەشداری راپرسییەکەیان کردووە کەمترین لایەنی خۆشەویستی و سۆزدارییان تێدا دەردەکەوێت و کەمتر باس لە کێشە و موعاناتی لاوان دەکەن، بۆیە بەبڕوای من ئەوەندە دەنگیان نەهێناوە، ئەگینا لە روانگەکانی ترەوە دەکرێ لەو فیلم و زنجیرە دۆبلاژکراوانە کەمتر نەبن کە لاوان دەستنیشانیان کردوون .

دەرئەنجام:

هەرچەندە ئەم باسە زۆر لەوە زیاتر هەڵدەگرێت و حەق وایە بەو ئەندازە کەمە کۆڵی لێنەدەین و رازی نەبین بەو راپرسییە سەد کەسییەو بەو پرسیارە قەتیسماوانەوە خۆمان قایل نەکەین، بەڵام ئەو هەوڵەی ئێمەش لە رووی تازەیی بابەتەکە و زیندوویەتی دۆزەکە و سەرەتای لێکۆڵینەوەکەی ئێمەش جێگەی خۆی هەیە و دەخوازم ئەو رچەیەی من شکاندم ببێە شارێگەیەك و کەسانی بەتواناتر و قەڵەم و بیر فراوانتر و زمان پاراوتر لە سەر ئەم دیاردەیە راوەستن و قسەی جیدی تری لەسەر بکەن، هەرچۆنێك بێت لە روانگەی ئەو چەند لاپەڕەیەوە گەشتینە ئەو ئەنجامەی کە (کاریگەری زنجیرە و فیلمەکان شایانی باس و خواسن و کەسانێك هەن لە دونیای فەراغ و هەست بەکەمی کردن و خۆ بە نەوی زانیندا دەژین زۆر لەبار و گونجاون بۆ کۆنترۆڵکردنیان) و رێگەی زۆر لەبار و گونجاویش لایەنی ئەدەب و هونەرە و

بەتایبەتی فیلم و زنجیرە تەلەفزیۆنییەکان کە روویەکی گشتگیرتر و فراوانترە لەبوارەکانی تری وەك نووسین یان بڵاوکراوە و بەرنامەی فیکری و پەروەردەیی و خەڵکانێکی زۆرتر و چینە جیاجیاکانی کۆمەڵگەش موتابەعەی دەکەن.

بەبڕوای من چەندە وەرگێڕانی ئەو زنجیرە و فیلمانە خزمەت بەزمان و ئەدەبی کوردی بکات، چەند ئەوەندە خزمەت بە کلتور و رۆشەنبیری فارس و پانئیرانیزم دەکات و من دەیخەمە ریزی بردنەدەرەوە(تصدیر)ی کلتور و رۆشەنبیری ئەوان، دەستکوتان و پەلکوتانی ئەوانە بەرەو نەتەوە جیاجیاکانی چواردەوریان و کوردیش لەو حەملەیە بێبەش نەکراوە!!

لەو راپرسیەوە لە شێوازی بیرکردنەوە و ئاستی حەز و خولیای کچان و کوڕانی سنوورەکەمان هەستپێدەکەین، تێدەگەین کە ئەوان گرنگی بە چی دەدەن و گوێ بەچیش نادەن .. جگە لەمەش دەبێت لەوە تێبگەین کە فیلم و زنجیرە تەلەفزیۆنییەکان کاریگەری جەماوەری زۆریان هەیەو دەکرێ ئەو کەناڵانە رۆڵی کاریگەر بگێڕن لە گۆڕنکارییە کۆمەڵایەتییەکاندا و ئاراستەکانی ئەو گۆڕانکارییانە دیاریبکات .. لەوەش تێگەشتووین کە هونەر و تەمسیل و زنجیرە تەلەفزیۆنییە کوردییەکانی ئێمە چ کەلێنێکی گەورەی بەجێهێشتووە تا کچان و کوڕانی ئێمە بە فیلم و زنجیرە تەلەفزیۆنییە مەبەستدارە بیانیەکان پڕیان بکەنەوە و لە بری شانازی بە کلتور و رەسەنایەتی خۆمانەوە بکەن، لەبری وێنەی ئەکتەر و هونەرمەندە ناکوردەکان بە دەفتەر و کتێب و جانتاکانیانەوە بکەن، با ئەوەندە بۆشایی و فەراغیان نەبوایە کە لە هەموو شتێکدا پەنا بەرینەوە بەرئەوانی تر.

جگە لەمانەش کەناڵە تەلەفزیۆنیە ناوخۆییەکانی ناوچەکەش رۆڵی سەرەکی و بنەڕتییان هەیە لە گواستنەوەی ئەو فیلم و زنجیرانەدا ئەوەتا

تەلەفزیۆنەکانی(یەکگرتوو . کۆمەڵ . بزوتنەوەی ئیسلامی) (60٪ ) ی بینەرانیان بۆخۆیان ڕکێشاوە و ئەوانیش لە کەناڵی سەحەری کوردییەوە بەبێ هیچ ڕێگری و سانسۆرێك دەیگوازنەوە، هەرچەندە لەڕووی یاساییەوە کارێکی یاساغ و قەدەغەکراوە بەڵام سەحەر چاوپۆشی لێدەکات ؟ چونکە ئامانجەکانی ئەو پەرەپێدەدات بە جۆرێك لەجۆرەکان دەچنە خانەی خزمەتی ئەوانەوە، بۆیە ئەگەر ( باش بکەن یان خراپ) یاخود عاقیبەت و دەرئەنجامەکەی چۆن بکەوێتەوە ئەوا بەڕێژەی دیاریکراو(60٪) بەردەکەوێت.

ماوەتەوە بگوترێت پرسیارەکان و وەڵامەکانیش لەبەردەستدان، دەکرێ کەسێکی تر خوێندنەوەتریان بۆ بکات و دەرئەنجامی قووڵتر و شیاوتریان لێوە دەستبخات یان لەسەر ئەو بیرۆکەیەوە بە دووی شتی باشتردا بگەڕێت و بگاتە توێژینەوەیەکی ئەکادیمیانەی باشتر.

## پرسیارە حەرام کراوەکان

شەهرام هوژەبری

### تەوەرەی یەکەم: جیاکارییەک لە نێوان عەشق وخۆشەویستی

دیارە ئەم بابەتە هەڵگری قسەی زۆرە، هەڵگری بۆچوونی جیاوازییە، چونکە قسەکردن لەسەر عەشق و خۆشەویستی قسەکردنە لەسەر تایبەتیەکانی مرۆڤ. هەر یەکە لە بۆچوونەکان قابیلی گفتوگۆیە. هەروەها عەشق چەمکێك نییە یاساو رێسایەکی هەبێت و هەر کەسێك لەو یاسا و رێسایانە دەرچێت ئەوە عاشق نییە، نەخێر لەبەر ئەوەی عەشق توانای زۆر لەوە فراوانترە و توانیویێتی هەموو ئەو قەید و بازنانە بشکێنێ کە لە چوارەوری چەمکەمانی تردا هەیە بە فیکر و ئەدەب و هونەریشەوە ، لێرەوە دەتوانم بڵێم کە کەسایەتی عاشق زۆر گەورەتر و ئازاتر و ناسکتریشە لە کەسایەتی سیاسی و فیکری و ئەدەبیش. مادام عەشق لە قودەرەتیا هەبێت باس بە سەر هەموو ئەو

بەربەستانەدا بنێت کەواتە عەشق هەمیشە نوێیە گرنگ نییە کە یەك جار یا دوو جار لەژیاندا خۆشەویستی کردبێت .

مرۆڤ هەمیشە لەبەردەم شوێنگەیەکی نادیار دایە ،عەشق دەتوانێت ئێمە بۆ دۆزەخ یان بەهەشت بەرێت بەڵام هەمیشە بۆ یەك شوێنی دەبات، پێویستە پەسەندی بکەین، چونکە عەشق پەروەردە و ناندێنی دەکات، ئەگەر خۆ گێلکەین لە برساندا دەمرین لە کاتێکادا لە لقە پڕ لە میوەکانی درەختی ژیان لەبەردەماندایە و ئێمە جورئەت ناکەین بۆ لێکردنەوەی میوەکان دەستدرێژ بکەین .هەر لەبەر ئەمەشە لەو ساتەوە ئێمە بەدوای عەشقدا دەگەرێین، ئەویش بەدوای ئێمەدا دەگەڕێت، دیارە بە دواداچوونی عەشق هەروا کارێکی ئاسان نییە، چوونکە عەشق زۆر دژوارە گەر نەمانەوێت سنوورەکانی تێپەرێنین سنوورەکانی عەشق واتا دوورکەوتنەوە لە سنوورەکانی حەقیقەت، واتا ئیشکردن لەو دیو عەقڵەوە. هەر بۆیە ناشتوانین پێناسەیەك بۆ عەشق بکەین، چونکە عەشق لە کایە میتافیزیکیەکانەوە سەرچاوە دەگرێت، وا دیارە گەر مرۆڤ ئازایانە بەدوای عەشقا بگەرێت ئەوە بوونی خۆی ئاشکرا دەکات و ئەو کات عەشقێکی گەورەتر بۆ لای خۆی رادەکێشێت کە بیر بکاتەوە و پرسیار لە خودی خۆی بکات. هەر وەکو پاولۆ کۆیلۆ دەڵێ: "مرۆڤی عاقڵ کاتێك عاقڵە کە عاشق بێت، مرۆڤی بێعەقڵیش بۆیە بێعەقڵە چونکە وا خەیاڵ دەکات تێگەیشتووە" . لێرەوە وا تێدەگەین کە عەشق مەودایەکی نییە تا لێی تێبگەین. هەر بۆیە عەشق بەردەوام پرسیارت بۆ دروستدەکات، بەردەوام بازنەکانی بیر کردنەوەت فراوان دەکات.

کاتێ کە باس لە عەشق و خۆشەویستی دەکەین دەبێت ریزبەندییەك بکەین بەسەر دوو بەشی سەرەکی کە

1. عەشقی حەقیقی
2. عەشقی مەجازی.

عەشقی حەقیقی بریتییە لەو پەیوەندییە ڕۆحیەی کە لە نێوان کەسێکی ئیماندار و خودا هەیە و ناتوانم ناوی بنێم عەشق ، چونکە بەستراوەتەوە بەکۆمەڵێ یاسا ، ئەو یاسایانەش ئایدۆلۆژیای مەزهەبە کە دایناوە ، ئەگەر تەماشای هەریەك لەو سێ دینەی بکەین کە ئەمڕۆ زۆرینەی کۆمەڵگاکانی جیهانی پێکهێناوە کە بریتین لە: ئیسلام و مەسیحی و جوولەکە، خاڵێکی جەوهەری هەیە کە هەرسێکیان موافیقن لەسەری ئەویش گەیشتنە بە بەهەشت و دیارە کۆمەڵێ یاسا هەیە بۆ جێبەجێکردنی کە بتگەیەنێ بەو بەهەشتە ، لەنێوان ئەو یاسایانەدا ، خۆشەویستییە بۆ خوا. کەواتە خۆشەویستی بۆ خوا لەدنیا ئیجبارییە، کەواتە لە دنیا خۆشەویستی بۆ خوا عەشق نییە بەڵکو خۆشەویستییە. بە واتایەکی تر لە دنیا خۆشەویستی بۆ خوا مەبەست نییە بەڵکو هۆیەکە بۆ گەیشتن بە بەهەشت.

ئەمە لەڕوانگەی مەزهەب و دینەکانەوە. بەڵام لە روانگەی ئەو کەسانەی کە بە راستی عاشقی خوا بوون پێچەوانەی ئەم خۆشەویستیەن، چونکە ئەمانە هەموو ئەو یاسایانە تێکدەشکێنن کە دانراوە بۆ خۆشەویستی خوا. هەر بۆیە بەم جۆرەیان دەڵێم عەشق بۆ خوا . چونکە عەشق لای عاشقانی خوا پەیوەندییەکی روحییە و هیچ هۆیەك نییە تا بە هۆیەوە بگات بەو لەزەتەی کە پێی دەڵێین عەشق بۆ خوا. ئەوەتا کەسێکی وەك (رابیعەی عەدەوی) کە کچە گەورەیەکی دنیای ئیسلامە دەڵێت: "خوایە لەبەر ئەوە خۆشم ناوێیت کە بمخەیتە بەهەشت و لەبەر ئەوەش خۆشم ناوێیت کە لێتدەترسم بە دۆزەخەکەت بمسوتێنی، بەڵکو تەنها لەبەر ئەوە خۆشم دەوێیت چونکە عاشقی زاتی خۆتم". کەواتا عەشق هیچ یاسایەك نایگرێتەوە کاتێك کەسێکی عاشق یا سۆفییەك لە مزگەتێکدا یا لە هەر جێگایەك دادەنیشێ و دەگری ئەوە پەیوەندییە روحییە کە هەیەتی لەگەڵ خوا ئەوەیە عەشقی حەقیقی کە بەڕادەیەك لە مەنتیقی ئایدۆژیا مەزهەبیەکە دوور دەکەوێتەوە وەك ئەو کەسەی کە ئیماندارە و دەبێت پەیوەستی یاسا ئاسمانییەکان بێت .ئەگەر نموونەیەکی

تر لەسەر عەشقی حەقیقی باس بکەین دەبێت مەنسوری حەلاج باس بکەین کە بەڕادەیەك عاشقی خوا بوو، کەخوای بەبەشێك لە خۆی دەزانی یان خوای لە ناو خۆیدا بەرجەستە دەکرد، دیارە ئەم عاشقەی مەنسور کاریگەری وای لەسەر نووسەران وشاعیران درووستکرد کە یەکێکی وەك مەحوی ئەو تێکشکانانەی کە مەنسور لە یاسا مەزهەبیەکەیدا شکاندی بە حەق بزانی، بۆیە دەڵێ:

بە حەق هەر حەق، بەناحەق ناحەقم وتووە لە ڕۆژێ بووم
وەکو مەنسور ئەگەر بیشمکوژن ناکەم لەحەق لادەم.

قسە کردن لەسەر شتی حەقیقی هەڵگری زیاترە بەلاّم وابزانم ئەمەبەسبێت بۆ تێگەیشتن لەسەر عەشقی حەقیقی یان عەشقی خوا.

گەرباسی عەشقی مەزاجی بکەین، لە عەشقی مەجازیدا تەنها پەیوەندی دایك لەگەڵ ئەولاددا هیچ موقابیلێکی نییە هیچ مەرجێك نییە چونکە هیچ یاسا و ڕێسایەك نییە کە دایك ئەولادی خۆی خۆشبوێت یان خۆشینەوێت کەواتا ئەم پەیوەندییە عەشقە نەك خۆشەویستی بەلاّم لەدوای ئەمەوە پەیوەندی ئینسانەکان لەمە دەردەچێت ودەبێت بە خۆشەویستی ئەگەر بمەوێت پێناسەی خۆشەویستی بکەین دەڵیم خۆشەویستی بریتیە لە ئارەزوویەکی ڕاستەقینە بۆ ژیان و پەرۆشبوون بۆ ئەوەی فێری سۆزداری بین. سەرەتا کە باسی خۆشەویستی دەکەین نابێت ئەوەمان لە بیر بچێت کە لە عەشق جیای بکەینەوە بە تەواوی چونکە عەشق پابەندنییە بە هیچ یاسایەکەوە بەلاّم خۆشەویستی دەبێت پەیوەستی یاسا عەقلاّنییەکان بێت.

خۆشەویستی چەمکێکی ئازاد و فرە لایەنییە، سەرەتا دەبێت ئەوەمان لە بیر نەچێت کە باس لە خۆشەویستی دەکەین بێئاگایانە دەکەوینە ناو گێرمە و کێشەیەکی ئالّۆز لەگەڵ داب و دەستورە باوەکان لەگەڵ یاسا سەپێنراوەکانی

ناو کۆمەڵگا. بە دروستکردنی ئەم جەنگە تۆیەك کە هەڵگری ئەم چەمکەی تاوانبار دەکرێی بەوەی کە قسە لەسەر کایە حەرامکراوەکان دەکەیت.

داوای گۆڕینی ئەو یاسایانە دەکەیت کە کۆمەڵگا تەحەکوم دەکات بەسەریاندا بۆ روبەڕووونەوە لەو جەنگە دەبێت پەیوەستی یاسا عەقلآنییەکان بین یاساعەقلآنییەکان پێویستی بە رۆشنبیرییەکی زۆر و هەمەلایەنە هەیە تا بتوانێت هاوسەنگییەك دروستبکەین لەنێوان یاسا عەقلآنییەکان و یاسا باوەکانی ناو کۆمەڵگا چونکە ئێمە یەکێکین لەم کۆمەڵگایە.

گەر بمانەوێت فێری هونەری خۆشەویستی بین دەبێت هەوڵبدەین لە هەموو پانتایەکاندا بابەتی بین و سەبارەت بەو شوێنانەی کە بابەتییانە هەستیار بین واتا لە گشت لایەنەکانی ژیان بە کۆمەلأیەتی و سیاسی و ئەدەبیش، لێرەوە خالێکی تریشمان بۆ روون دەبێتەوە کە خۆشەویستی و هەوڵدان لە یەکتری جیانابێتەوە مرۆۋ شتێکی خۆشدەوێت کە پێوەی ماندووبێت، هەوڵدان شتێك بۆ خودی هەموار دەکات کە عاشقی بێت.

بەجۆرێك لەجۆرەکان خۆشەویستی بەخشندەیە هەروەها ناڕاستەوخۆ لایەنی بەرامبەری دەکاتە بەخشندە، سەرئەنجام هەر دوو لا لە خۆشی شتێك کە خۆیان ژیانیان پیّ بەخشیوە کە خۆشەویستییە بەشداری دەبن، کەواتە خۆشەویستی هێزێکە خۆشەویستی بەرهەمدێنیّ، هەروەها لەناو خۆشەویستیدا جەوهەرێك هەیە کە دڵسۆزییە، دلسۆزی بەواتای هەست بە لێپرسراویکردن، لێپرسراوی بەو مانایەیە کە جێبەجێکردنێکی کوێرانەی بەرامبەرت بیّ، بەڵکو بە مانا راستەکەی کە پرسێکە بە تەواوی ئیرادە، وەلأمی مرۆڤە بە پێداویستیەکانی مرۆڤێکی تر جا ئەم پێداویستیە راگەیەنرابێت یان نا، واتا تۆانا و ئامادە بێت بۆ وەلأمدانەوە، دیارە ئەم لێپرسراویەتیە شێوازی دەگۆڕێت لەدایك بۆ منداڵ جیاوازەن لە کوڕ و کچێك یان لەژن و مێرد جیاوازە زیاتر بەمانای پێویستییە جەسەدییەکانە، بەلأم لە خۆشەویستی گەورە سالأندا زیاتر رووی لە پێویستییە دەرونییەکانە.

لێرەدا نابێت ئەوەمان بیر بچێت کە هەست بە لێپرسراویکردن رێزی لەگەڵدا نەبێت، ئەوە بەئاسانی دەگۆڕێت بۆ دەسەڵاتخوازی و ئارەزووی مەیلی کۆنترۆڵکردنی بەرامبەر بەم شیوەیەی کە ئەمڕۆ لەم کۆمەڵگایەدا بەرجەستە دەبێت، واتا گەر لە نێو خێزان رێز نەبوو ئەوا تاکدەسەلاٌتی درووستدەبێت، لێرەوە کێشەکانی ناو خێزان سەرچاوە دەگرێت، هەروەها شێوەیەك لە شێوەکانی خۆشەویستییە سەقەتەکانی ناو ئێمە خۆپەرستییە، واتا تەنها بۆچوونەکانی خۆم راستە و ئامادە نیم گویٚ لە بۆچوونەکانی تۆ بگرم. ئەم بۆ چوونە بەرەو ئەم هەڵدێرانەمان دەبات کە بە تەنها خودی خۆمان خۆشبوێت و کەسی بەرامبەر تەنها لەبەر تێرکردنی غەریزە جنسییەکان خۆشمان بوێت.

گەرلەڕوانگەی دەروونناسییەوە سەیری ئەم حاڵەتە بکەین ئەوە ئەو کەسە توانای خۆراهێنانی نییە لەسەر خۆشەویستی، کەواتا ناشتوانن خودی خۆیانیش خۆشبوێت ئەوەندەی کە مابێت بیڵێم بۆ راهێنان لەسەر هونەری خۆشەویستی دەبێت چالاکبین. مەبەستم لەچالاکی ناوەوەیە و سوود وەرگرتنی بەرهەمدارانە لە هێزەکانی خودی مرۆڤ .گەر من کەسێکم خۆشبوێت ئەوا هزری من بە شێوەیەکی چالاك رووی لەو کەسەیە ،بەلاٌم ئەگەر هەمیشە هۆشیار و چالاك نەبم بێگومان ناشتوانم پەیوەندی خۆشەویستی لەگەڵ ئەو کەسەدا بپارێزم.

کەواتا خۆشەویستی هونەرە، هەروك چۆن هونەری مۆسیقا پێویستی بە کۆمەڵێك فاکتەر هەیە وەك (مامۆستا، ئامێر، رۆشنبیری گشتی، پەیوەندی رووحی هونەرمەند لەگەڵ ئامێرەکەی، بەفەنتازیاکردنی خەیالاٌتەکان) ئاوهاش هونەری خۆشەویستی پێویستی بە کۆمەڵێك فاکتەر هەیەوەك (راستگۆیی، چالاکی رۆح، هەوڵدان لە بوارە رۆشنبیریەکان، خۆشەویستی بە واتای دوور لە خۆپەرستی ).

بە وتەیەکی(مایستر ئیکهارت ) کۆتایی بە تەوەرەی یەکەم دێنم کە دەڵێت: ( ئەگەر خۆتت خۆشدەوێت دەبێت خەڵکانی تریشت خۆش بوێت ،

ئەگەر خەڵکانی ترت لەخۆت کەمتر خۆشویست، ئەوا لە خۆشەویستی خودی خۆت سەرکەوتنی، راستەقینە بەدەست ناهێنیت) .

## تەوەرەی دووەم : پەیوەندی خۆشەویستی نێوان کوڕ و کچ.

پێش ئەوەی بچمە سەر ئەم تەوەورەیە ئەمەوێت باس لەوە بکەم بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەم تەوەرەیە سوودم لەو راپرسیە وەرگرتووە کە لە نێوان گەنجانا کردبووم. قسەکردن لەسەر ئەم تەوەرەیە رووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ داب و دەستووره باوەکانی کۆمەڵگا لەگەڵ یاسا دیسپلین کراوەکان.

رووبەڕووبوونەوەش بە واتای جەنگ، جەنگ لەگەڵ کەسایەتی دووەمی خۆت دیارە، هەموو کەسێك بەردەوام دەمامکێکی لەسەرە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی کەسانی بەرامبەر. لێرەوە کەسایەتی حەقیقی دەکەوێتە جەنگ لەگەڵ ئەو دەمامکەی کە لەسەر کراوە، حەز دەکەم بەپرسیارەوە داخڵ بە تەوەرەکە بم، تا پرسیار لە ناخی ئێوەش دروستبکەم، ئەو پرسیارانەی کە نەمانویستووە لە خۆمانی بکەین، ئاخۆ ئەو پەیوەندیە خۆشەویستیەی لای ئێمە بەرجەستە دەبێت بنەمایەکی عەقڵی هەیە، ئەوبنەماعەقڵیەی کە (سەلامە موسا)ی موفەکیری عەرب بە بنەمای دەزانێت بۆ دروستکردنی پەیوەندی خۆشەویستی کە بریتیە لە سیٚ خاڵ (العقل، العگف، الجنس) ئاخۆ ئێمە وەك گەنجێك کاتێك ویستوومانە عیلاقە درووستبکەین یا ئەگەر عیلاقەشمان هەیە تاچەند توانیومانە ئەم سیٚ خاڵە بکەینە بنەما بۆ ئەو خۆشەویستیە یان بە پێچەوانەوە وەك شکسپیر دەڵێت (دڵداری لاوان لە دڵیانەوە سەرچاوە ناگرێت، بەڵکو لە چاویانەوەیە ) لێرەوە سەرەتای هەموو ئەو کێبڕکێیانەی ناو کۆمەڵگا دروستدەبێت، ناکۆکی نێوان کوڕ و کچ یان ژن ومێرد دروستدەکات .

ئەگەرچی خۆشەویستییەکی ئەفلاتونی هەبێت لە نێوانیاندا. ئەگەر لەسەر ئەو بنمایانە نەبێت ئەوا وەك ئەو ژن و مێردە تەقلیدیەیان لێدێت کە لە پێش ئێمەدا هەبوون.

ئەگەر ئێمە بمانەوێت پەیوەندیەکی باش وسەرکەوتوو درووستبکەین، سەرەتا کۆمەڵێك پرسیار لە خۆمان بکەین یان کەمێك لەگەڵ خۆماندا بدوێین بەم شێوەیە:

1.ئەگەر عیلاقەی خۆشەویستی جۆرێك بێت لە یاخیبوون لە کۆمەڵگا، تا چ رادەیەك ئامادەی یاخیبوونمان تێدایە ؟

2. ئایا عیلاقەی نێوان کوڕ و کچ پەیوەندی هەیە بەجەنگ و بەرگرییەوە!

3.ئایا پەیوەندی نێوان عیلاقە و ئازادی چۆن دەبینین ؟

4.ئایا ئامانج لەدروستکردنی عیلاقە خولقاندنی خۆشەویستییە یا راکردنە لە تەنهایی ؟

5. ئایا دروسکردنی عیلاقە کاریگەری لەسەر پرۆسەی زەواج دادەنێت؟

6.ئایا سەرکەوتنی عیلاقە پەیوەستە بەئەنجام گەیاندنی زەواجەوە ؟

7.ئایا دوا پلەی خۆشەویستی زەواجە ؟

دیارە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە لای من ئەکرێت وەلامێکی گشتی نەبێت، بۆیە ئەمەوێت ئەم پرسیارانە لای ئێوەش بوروژێت و هەر یەکێك کە ئەیەوێت عیلاقە دروستبکات یان ئەگەر عیلاقەشی هەیە با هەوڵبدات بە عەقڵێکی کراوەوە وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە، من وەکو خۆم وەڵامی ئەم پرسیارانە ئەدەمەوە بۆ ئەوەی رێگا خۆشکەربێت بۆ ئێوەش، نابێت ئەوەمان لە بیر بچێت کە خۆشەویستی شتێکی زاتییە وەك ئەریك فرۆم دەڵێت: (خۆشەویستی هەستێکی خودی وتایبەتییە کە هەر کەسێك دەتوانێت خۆی دەرکی پێبکات)، بۆیە دەکرێت وەڵامەکانی من جێی پرسیاربێت، بەڵام بەپێویستی دەزانم کە ئەم پرسیارانە لە خۆمانی بکەین و وەڵامیشیان بدەینەوە .

سەرەتا ئەو پرسیارەی کە دەبێت لەخۆمانی بکەین "عیلاقە گەر جۆرێك بێت لەیاخی بوون "؟

دیارە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە جۆرە ئازاییەکی دەوێت، ئەو ئازایەتییەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو باگڕاوندە رۆشنبیریەی کە تۆ هەتە بەتایبەتیش لەم کۆمەڵگایە کە قسەکردن لەم بابەتە قسەکردنە لە حەرامکراوەکان، هەر بۆیە کاتێك کە عیلاقە دروستدەکەین لائیرادیانە دەبینە کەسێکی یاخیبوو. تەنها چەکێکیش بۆ درێژەدان بەم یاخیبوونە وشیارییە. وشیاری کۆمەلأیەتی و رۆشنبیری چونکە تۆ کە چەمکی خۆشەویستی هەڵدەگری لە هەمانکاتدا دەبێت ئامادەی شەڕێکیش بیت کە سوونەتی کۆمەڵگا فەرزی دەکات بەسەردا، چونکە تۆ دەست بۆ کایە حەرامکراوەکان ئەبەیت. لێرەوە تۆ پێویستییەکی زۆرت بە وشیاری کۆمەلأیەتی رۆشنبیری هەیە تا لەم شەڕەدا سەرکەوتن بەدەستبێنی. هەروەها ئەمەش وەلأمە بۆ ئەو پرسیارەی کە"ئایا عیلاقە پەیوەندی بەجەنگ و بەرگرییەوە هەیە..؟"

وەك باسمانکرد کە تۆ کەسێکت خۆشدەوێت. لێرەوە سەرەتای ئەو جەنگە دروستئەبێت سەرکەوتن لەم جەنگە تەنها تەزحیەی دەوێت تەزحیەنەدانیش واتە جەنگەکەت دۆڕاند کەواتە کەسێکی فاشیلیت. ئەگەر چی زەواجیشت کردبێت. بەدروستکردنی ئەم جەنگەش بەرگریکردنە لە سەرەتاترین ماف، کە مافی هەڵبژاردنی کەسێکە بۆ پێکەوە ژیان .

لێرەوە دەچمە سەر ئەو پرسیارەی کە (ئایا ئازادی چ کاریگەریکی هەیە لەسەر عیلاقە..!) کاتێك فەزایەکی ئازادی نەبوو یاخیبوون سەرهەڵئەدات ئۆپۆزسیۆن دروستدەبێت بەرامبەر بەو کۆمەڵگا تەقلیدیە، لەپەنا ئازادیدا دەتوانین عیلاقەیەکی بێبەربەست درووستبکەین ئەو خەونە رەنگا و رەنگانەی کە هەمانە دەتوانین بەرجەستەی بکەین و بیهێنینە واقیع. ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ئازادی نەبوو ئیتر خۆشەویستی مەحاڵبێت، نەخێر لە ناو ئەو هەموو قەید و بازنانە کە بەدەوری خۆشەویستیدا هەیە کە لەناو ئەو هەموو فەزایەی کە

**ئازادی نییە، بەڵام خۆشەویستی درێژەی هەر بووە. بەڵام لێرەدا پرسیارێکی تر دروستدەبێت کە (ئایا دروستکردنی عیلاقە خوڵقاندنی خۆشەویستییە یان ڕاکردنە لە تەنیایی..؟) گەر تەماشای دەورووبەری خۆمان بکەین عیلاقەیەکی زۆر دەبینین جا بە ئاشکرا یان بە نهێنی، ئەگەر عیلاقە پشتئەستوور نەبێت بە رۆشنبیرییەکی شارستانی و پەیوەندیەکی رۆحی نەبێت ئەوا ئەو عیلاقەیە نەیتوانیوە خۆشەویستی دروستبکات. ئێمە نە پەیوەندییەکی رۆحیمان هەیە لەگەڵ بەرامبەر و نە بانگڕاوندێکی رۆشنبیریمان هەیە لەسەر خۆشەویستی واتا پێش دروستکردنی عیلاقە قسەیەکمان نەبووە لەسەر خۆشەویستی ،بۆیە دەتوانم بڵێم ئەو عیلاقانە ڕاکردنە لە تەنهایی، ڕاکردنە لەو تەنهاییەی کە هەموو تاکەکانی ئەم کۆمەڵگایەی گرتووەتەوە بەتایبەتی گەنج. کاتێك کە بەردەوام خۆی لە چوار دیوارییەکی دووبارەدا دەبینێتەوە. خەتەریەکە لێرەوەیە کە لەم کەناڵەوە هەڵدەستێ بەدروستکردنی عیلاقە کە لەوە و پێش هیچ بنەمایەکی نەبووە و هیچ قسەیەکی نەبووە لەسەر خۆشەویستی لە یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەیەکی خۆشەوستی کتوپڕدا دەسنیشانی کەسی بەرامبەر دەکات و ئامادەیشی تێدایە بۆ زەواجکردن. بۆیە دەتوانم بڵێم کە عیلاقە بنەمایەکی رۆشنبیری نەبوو خوڵقاندنی خۆشەویستی نییە بەڵکو بۆ چارەسەری نەخۆشی تەنهاییە. دروستبوونی کێشەکانی ناو زەواج و دوای زەواجیش لەمەوە سەرچاوە دەگرێت. لیرەوە پرسیارێکی تر دروستدەبێت: (ئایا عیلاقە کاریگەری ئەبێت لەسەر زەواج..؟)**

**بە بڕوای من عیلاقە کاریگەرییەکی گەورەی پۆزەتیڤانەی هەیە لەسەر پرۆسەی زەواج و زەواج ئەگەر لەسەر عیلاقە دروستنەبێت ئەوا زەواجێکی فاشیلە، بەڵام کێشە لێرەدایە ئایا عیلاقەکە کام عیلاقەیە ئەگەر عیلاقەکە لەسەر بنەمای خۆشەویستییەوە درووستنەبووبوو بێگومان کاریگەرییەکی نێگەتیڤانە دروستدەکا و زەواجێکی بەرە و کەناری جیابوونەوە دەبات بەڵام ئەگەر عیلاقەکە بریتی بوو لە خۆشەویستییەکی ئەفلاتونی لەسەر حەقیقەتی**

خۆشەویستی دروستبوو، ئەگەر روونتر بڵێم عەقڵ تەحەکومی کرد بەسەر ئەوخۆشەویستییەوە و لە پشت ئەو عیلاقەیەوە رۆشنبیرییەکی گشتی حزووری هەبوو. ئەوا بێگومان زەواجێکی سەرکەوتوو دروستدەکات بەهۆی ئەمەشەوە گرنگی عیلاقەمان بۆ دەردەکەوێت لێرەوە دەچمە سەر ئەوپرسیارە کە دەڵێ: (ئایا سەرکەوتنی ئەوخۆشەویستی پەیوەستە بە ئەنجامگەیاندنی زەواجەوە. هەروەها ئایا زواج دوا پلەی خۆشەویستییە..؟ ) بێگومان نەخێر لە هیچ کاتێکدا سەرکەوتنی عیلاقە پەیوەست نییە بە زەواجەوە چونکە رۆژانە زەواج دەکرێت و رۆژانەش جیابونەوە هەیە، جیابوونەوەی دوو کەس کە بە عیلاقە زەواجیان کردووە لەبەر ئەوە زەواج هەنگاوێکە لەو هەنگاوانەی کە لە پرۆسەی عیلاقەدا بەر جەستە دەبێت و  بە ئەنجامگەیاندنی زەواج کۆتای نایەت بە عیلاقە، بەڵکو لەدوای زەواجەوە وەفاداری و دڵسۆزی و تەزحیە هەیە کە ئەمانەش درێژەپێدانی ئەو عیلاقەیەیە کە لە پشت زەواجەوە هەبووە و لێرەدا خاڵێکی جەوهەری هەیە کە بریتییە لە خاڵی(وەسڵ) واتا بە یەکگەیشتن.

دیارە ئێمە وەك میللەتی کورد توانای دروستکردنی خەیاڵات و بە فەنتازیاکردنی خەیاڵاتمان نییە یان زۆر کەمە، ئەمە کاریگەرییەکی زۆری هەیە لەسەر زەواجی ئێمە، ئێمە لەکاتێکدا کە عیلاقاتمان هەیە دەتوانین کۆمەڵێك خەلاٌتی زۆر جوان دروستبکەین لە فەنتازیایەکی ئێجگار ناسکدا ئەم خەیاڵاتانە کۆ بکەینەوە. وابزانم ئەمە خاڵی جەوهەری سەرکەوتنی عیلاقەی ئێمەیە  لە پێش زەواج، بەلاٌم کاتێك کە دەگەینە خاڵی بە یەکگەیشتن (وەسڵ) ئیتر خاڵی دەبینەوە لەهەموو خەیالاٌتێك و جارێکی تر ناتوانین خەیاڵ بەرهەم بێنینەوە. دیارە نموونە زۆرە گەر تەماشای ئەدەبی کوردی بکەین "نالی" لە پێش هەموویاندا  تا لە سلێمانی بوو نەیتوانی قەسیدەیەك بۆ سلێمانی بنووسێ ،بەلاٌم کاتێك کە دوورکەوتەوە جوانترین قەسیدەی "نالی" لە دایکدەبێت و کە بۆ سلێمانی نوسیوێتی و (بەچامەکەی  نالی و سالم)بە ناوبانگە.

دیاره خاڵی به یەکگەیشتن کە زەواجە دەبێت ئێمە هەوڵبدەین هەروەك چۆن لە پێش زەواج توانای بەرهەمهێنانی خەیاڵاتمان بووە ئەوهاش دەبێت لە دوای زەواج بتوانین دووبارە خەیاڵات بەرهەم بێنینەوە دیارە خاڵی بە یەکگشتن بەدیوە پۆزەتیڤەکەیدا کە بریتییە لە زەواج و هێنانەدی هەموو ئەوخەیاڵاتانەی لە کاتی عیلاقەدا هەبووە، بەڵام بەدیوە نێگەتیڤەکەی بریتییە لە خاڵی بوون لە خەیاڵات و نەتوانین بۆ دروستکردنەوەی خەیاڵات هەر ئەم هۆیەشە کە پێمان وایە کە زەواج کرا ئیتر گەیشتووینەتە دوا پلەی خۆشەویستی هەموو رێڕەوەکانی عیلاقەمان تەیکردووە و گەیشتووینەتە دوا چڵەپۆپی خۆشەویستی و ئەوین. لێرەوە کێشەکانی ناو خێزانی ئەمڕۆ دروستدەبێت و هەروەها خێزانێکی تەقلیدی سەر لە نوێ دروستدەکەینەوە.

دوا وتەم لەسەر خۆشەویستی ئەوەیە دەبێت کۆمەڵگا بەجۆرێك رێکبخرێت کە سروشتی کۆمەڵایەتی عاشقانەی مرۆڤ نەك تەنها لە ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو جیا ناکرێتەوە بەڵکو لەگەڵیدا ببنەیەك. گەر بەم شێوەیەی لەم بابەتەدا گوتراوە بە راستی خۆشەویستی تاکە وەڵامێکی پڕاوپڕ و عاقڵانەیە بە پرسبوونی مرۆڤ. کەواتە هەر کۆمەڵگایەك رێگە لە کامڵبوونی خۆشەویستی دەگرێت بە ناچاری لە دەرئەنجامی ناکۆکیدا لەگەڵ پێویستییە زەرورییەکانی سروشتی مرۆڤدا مەحکوم بە لەناوچوونە.

لە راستیدا گفتوگۆ دەربارەی خۆشەویستی ئامۆژگاری نییە، لەبەر ئەم هۆکارە سادەیە کە بابەتەکە دەربارەی کۆتایی و راستەقینەی مرۆڤە. ئەگەر بە ئاشکرا هەست بە ئاوها پێویستییەك بکرێت، بەڵگەی ئەوە نییە کە لە بنەڕەتدا بوونی نییە. شیکردنەوەی ماهیەتی خۆشەویستی سەرەڕای ئێمە بەم دەرئەنجامە دەگەیەنێ، کە بە شێوەیەکی گشتی هیچ خۆشەویستییەك بوونی نییە، خۆی لە خۆیدا بەمانای رەخنە لەو رەوشە کۆمەڵایەتییەی کە خۆشەویستی لەناوبردووە، باوەڕبوون بە خۆشەویستی وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی، نەك وەك دیاردەیەکی تاکەکەسی تایبەتی باوەرێکی عەقڵانییەو

که له سرووشتی مرۆییانەوە لە دەرکردنی سرووشتی خۆیەوە سەرچاوە دەگرێت.

***

## شۆڕشی بەلشەفیک و بزوتنەوەی کەمالی

نووسینی

ئاسو ئازاد

**بەرایی:**

بێگومان جەنگی یەکەمی جیهانی تافێکی نویٰ بوو بۆ سەرجەم گەلانی دونیا، چونکە هاوکێشەی هێزە نێو دەوڵەتییەکانی ئەوکاتی جیهان بەشێوازێکی دی رەنگرێژکرانەوە کە لە هەناویدا پەیامی سەرکەوتنی پێبوو بۆ هەندێ گەل و نەتەوە و لە هەمانکاتدا نسکۆ و تێکشکاندنی بوو بۆ هەندێکی تریان لەم سۆنگەیەوە کوردیش وەك نەتەوەیەك لە بەرایی ئەو گۆڕانەدا خەریکبوو ئەستێرەی بەختی بدرەوشێتەوە، بەڵام زۆری نەخایاند واقیعی سیاسی و رەوتی مێژوو بە ئاکارێکیتردا رۆیشت کە ناتەبابوو لەگەڵ چارەنووسی دۆزی کوردا، چونکە هەر زوو لە منداڵدانی جەنگی یەکەمی جیبهانیدا دوو گۆڕانکاری گرنگ لە دایکبوو کە سەرەتا شۆڕشی بەلشەفیك، دواتریش سەرهەڵدانی بزووتنەوەی کەمالیزم بوو لە تورکیادا. ئەم

گۆڕانکاریانەش لەلایەن گەلانی ناوچەکەوە وەك پێداویستییەکی مێژوویی لەو قۆناغـەدا پێشـوازی کـران. کـوردیش بەشـبەحاڵی خـۆی و بـەپێی ئـەو توانـا دیبلۆماسـی و تێگەیشـتنی گەمـە سیاسـی و زمـانی قسـەکردنەی کـە ئـەو کـات هەیبوو چووە پێشەوە، تا دواجار بەختی خۆی لەگەڵ ئەم هێزە تازانـەش تـاقی بکاتـەوە، بـەو سـیفەتەی ئـەمان بـەزمان و سـتایلێکی نوێـوە دەدوان جـا لـە گوتارەکانی باوی سەردەم وا خۆیان دەنواند کە فریشتەی رزگارین بۆ گەلانی بنپـێ و ژێردەسـتەی ناوچـەکە، بـەلاّم نـەك هـەر وا نـەبوو بـەڵکو لـەپێناو بەرژەوەنـدی ئـابوری و سیاسـیان پرانسـیپ و ئایـدۆلۆژیا دژ و جیاوازەکـەی خۆشیان وەلانا و لەم پێناوەدا چەندین نەتـەوەی وەك کـورد و ئەرمـەن... هتـد بوونـە قوربـانی فەراهـەمکردنی ئـەم ئارەزووانـەی ئـەوان. لـە راسـتیدا سـەبارەت بەهەڵبژاردنی ئەم قۆناغـەی مێـژووی کـورد گرنگـی و هەسـتیارییەکەی لەوەدایـە کە ئەم دابەشبوونی جوغزە جوگرافی و ژینگـە سیاسـییەی کـە ئـەمڕۆ کـوردی تێدا دەژی کۆمـەڵێك بڕیـاربوون لـە دەرهاویشـتەی گەمـەی سیاسـی و سـتراتیژی ئـابوری ئەوکاتـەی وڵاتـانی زلهێـز گەلاّڵـەیان کـرد. ئـەم ڕێوشـوێن و دەرکردنـی بڕیارە نێو دەوڵەتیانەش بەو جۆرە بەهۆی دروستبوونی پەیوەنـدی (کەمالی – بەلشـەفیك )ەوە راسـتبوونەوەی ئـەم جەمسـەرەی رۆژهـەلاّت بـوو لـە بەرامبـەر هێزەکانی رۆژئاوادا. ئەگەر نا لەوانەبوو ئەجێندا و نەخشەی سیاسـی ئـەوان بـۆ ئەم ناوچەیە بەجۆرێکی تر بوایە، هەرچەندە ئەو کاتیش لـە نیـازی پـاکی ئـەوان هـەر بـەدگومانم و دروسـتبوونی پەیوەنـدی (کـەمالی– بەلشـەفیك)هـیچ لـە لێپرسراوێتی ئەوان کەم ناکاتەوە. لە دروستکردنی ئەو واقیعەی کە بۆ کـورد و چـەند گـەلێکی تـری ناوچـەکە هاتەکایـەوە و بـە زۆر لکانـدنیان بـە چـەند نەتەوەیـەکی تـرەوە کـە بـە زمـان و کلتـور و ئـەدەبیات و سـایکۆلۆژییەتی یـەکتر نـامۆن. سـەبارەت بـە توێژینەوەکـەش، لەبـەر ئـەوەی کـە کـەمترین نووسـینی لەسـەربووە بـە زمـانی کـوردی و ئێمـەش شـارەزاییەکی تـەواومان لـە زمـانی بێگانـەدا نـەبووە، بەتایبـەتی زمـانی هـەر دوو ووڵاتـی پەیوەندیـدار و نـەبوونی

ئەرشیف خانەی دەوڵەمەند لەلای خۆمان، وایکردووە کەنەتوانین زۆر بچینە ناو وردەکارییــەکان، بەتایبــەتی لــە بــواری چــۆنێتی دروســتبوونی پەیوەنــدی (کــەمالی-بەلشــەفیك)دا، لەبــەر ئــەوە بــەزۆری لــە هێڵــە گشــتییەکاندا قســەمان کردووە بەشێوەیەکی گشتی سوودم لە چەندین سەرچاوە وەرگرتووە، بەڵام بەتایبەتی چەند نوسراوێك ستوونی راگری توێژینەوەکەن ئەوانیش: (الترکیا المعاصرە - الموسوعە السیاسیە/ د.عبدالوهاب الکیالی)و دوو وتاری مەحمود رەزا و یوسف گۆران لە گۆڤاری سیاسەتی دەولیدا، هەروەها وتارێکی د.کەمال عەلی لە گۆڤاری زانکۆی سلێمانیدا.ماوەتەوە بڵێم کاری مرۆڤ بێکەم و کورتی نییە، هیچ سەرەتا و دەستپێکێك کامڵ و تەواو نییە، بۆیە هەرکەس هەڵەیەکم بۆ راستبکاتەوە و دەستم بگرێت. ئەوە لە تەواوی ژیانمدا بەمامۆستام حسابی دەکەم.

## بەشی یەکەم

### چارەنووسی کورد

### لە نێوان بیری

### تۆرانیزم و بزووتنەوەی کەمالیدا

## باسی یەکەم

### یەکەم : سەربوردێکی کورتی مێژوویی ئایدۆلۆژیایی تۆرانیزم.

سەرهەڵدانی ئایدۆلۆژیای تۆرانیزم وەك جووڵەیەکی فیکری و سیاسی ڕەنگە نەگەڕێتەوە بۆ مەودایەکی دووری مێژوویی، ئەم دەرنەکەوتنەش بە

جۆرێــك نــەبووە لــە ســاتەوەختێكدا بێــت و راســتەوخۆ بچــێتە قۆنــاغی پراكتیكیەوە، بەڵكو وەك هزر بە رێڕەوێكی مێژوویی گەشەی كردووە، پاشان لە قاڵبێكی سیاسیدا رەنگرێژكراوە.

ئەم ئایدۆلۆژیایە كەجەخت لەسەر رەگەزی تۆرانیزم دەكاتەوە و باس لە شانازی كردن دەكات پێوەی و دەیەوێت رەگەزێكی سەردەستە و خاوەن دەسەڵات بێت تاماوەیەكی درەنگ باس وخواسی وەها لە ئارادا نەبووە.

هەروەك (ئەرمینۆس و ئیمبری) رۆژهەڵاتناسی ناوداری مەجەر لە كۆتاییەكانی سەدەی نۆزدەدا و لە بیرەوەرییەكانی خۆیدا دەنووسێت: "چل ساڵ پێش ئێستا واژەی (تورك لوك) كە مانای توركبوونی دەدا وەك جنێو وا بوو" (1)

بەڵام ئەوكاتەی كە هەژموونی ئیمپراتۆریای عوسمانی بەرەو نەمان دەچوو بەتایبەتی لە كۆتاییەكانی حوكمی سولتان(عەبدولعەزیز 1861-1867)دا و سەروەری وڵات هەرەشەی دارمانی لێدەكرا لەلایەن روسیا و وڵاتانی تری ئەورووپاوە (2) هەر بۆیە چارەی مانەوەی دەوڵەت بە بڕوای (یوسف ئاقچۆرا) لەوەدابوو "كە دەستی لە نەریتە سیاسییە-دینییەكەی بشوات و سیاسەتێك رەچاو بكات كە بەرژەوەندی نەتەوەیی دەستە بەر بكات،(3) كار لە سەرژیاندنەوەی شادەمارەكانی نەتەوە بكات وەك جێگرەوەی ئاین كە ژیانی سیاسی و كۆمەڵایەتی ئەوكاتی رێكدەخست.

بۆیە لەبەراییدا ژۆن توركەكان بەم كارە هەستان لەسەرەتادا كە كۆمەڵێكی نهێنی بوون.(4) زۆربەی ئەندامەكانیان لە رۆژاوا، بە تایبەت پاریس خوێندنیان تەواو كردبوو كە هەڵگری بیری ناسیۆنالیستی توركی بوون، پاشان كاریان دژایەتی سوڵتان وگومان خستنە سەر مامەڵەی بوو.( 5)

ستراتیژی ژۆن توركەكان ئەوە بوو كە دەیانوت"ئێمە توركین وقیبلەی ئێمە تورانە"، هەروەها (یوسف ئاقچۆرا) تیۆریستی ئەم ئایدیایە لە وتارێكدا بەناوی "زیندووبوونەوە لەدوای مردن هەقە " بە ئاشكرا دەڵێت:"پێویستە توركەكان لە عارەبەكان جیاببنەوە، هەر چەندە زوو ئەو كارە بكرێت ئەوا زووتر دەتوانین

دەوڵەتی عوسمانی بکەینە دەوڵـەتێکی تورکی". (6) دواتـر کەسایەتیەکی وەك (ئیبراهیم شوناسی) کە هەوڵیدەدا زمانی تورکی لە وشەی فارسی و عەرەبی پاکبکاتەوە و (نامیق کەمال) دەرکەوت کە بە یەکەمین شاعیری میللی دادەنرێت و هۆنراوەی لەمەڕنەتەوە شانازی کردن پێوەی دەنووسی، پاشان (ئەحمەد وەفیق) و (ژەنراڵ سلێمان)یش نەوەی نوێیان فێری ئەوە دەکرد کە نەژادی ئەوان تورکە نەك عوسمانی و زمانیان زمانیان تورکییە نەك عوسمانی. (7)

هەروەها تیورسێنە ناسراوەکانی ناسیۆنالیزمی تورکی وەك زیا گوگ ئالب و ئەحمەد ئاغا ئۆغلۆ، زیاتر تیۆریزەیان بۆ ئەم بیرە و دەوڵەمەندکردنی دەکرد. گوگ ئالب پێی وا بوو: "هەتا فەرهەنگێکی هاوبەش نەبێ هیچ کۆمەڵێك نابێتە نەتەوە و ئەو فەرهەنگە نەتەوەییەش کاتێك پوختە دەبێت کەبنیاتەکانی بە گشتی پەیوەندی دەروونیان وەها لێکجۆش بدەن وەك ئەندامی لەشێکی زیندوویان لێبێت". هەستی ناسیۆنالی خۆی بەم شێوەیە مشتوماڵ دەکات و دەڵێت: "نیشتیمانی تورکان، تورکیانییە، تورکستانیش نییە .. دوورترە .. ولاَتێکی پانوبەرین و نەمرە، توران ".(8)

بۆیە ئەم ئایدیایە کاری لەسەر ئەوە دەکرد کە نەك هەر خەڵکی تورکیا بەڵکو هەموو ئەو گەلانەی کە بەڕەگەز تورانین لە سنووربەندێکی سیاسیدا کۆیان بکاتەوە .ئەمەش پاشخان وپێشدەستەیەکە بۆ ئەوەی باشتر لە بزافی کەمالیەکان تێبگەین، چونکە هەر یەك لە کەمالیەکان و تورکە لاوەکان کە ماوەیەك لەسەر شانۆی سیاسی تورکیا دەرکەوتبوون، هەرچەندە هەریەکەیان خۆی بە کۆمەڵێك درووشم دەمامکدار کردبوو، بەڵام لە راستیدا خۆیان جێبەجێکار و بە دامودەزگاکاری ئەم بیرەبوون. ئەحمەد فەرید ناسیۆنالیستێکی تورکە و لە 1914دا وتبووی: "دەوڵەتی دوارۆژی تورك دەبێت ئەنادۆڵ بکاتە بنکەی ولاَتی خۆی". (9) بەم پێودانگەش دەتوانین بڵێین بزافی کەمالییەکان کە لە راستیدا مەبەستی ئێمەیە ژێلەمۆ و ئاراستە پێدەرەکەی لەلایەن ئەم ئایدۆلۆژیاوە بووە. هەر بەپێی قسەی ئەو

ناسیۆنالیستە مەکۆی شۆڕشەکە لە ئەنادۆڵەوە دەستپێدەکات. کاتێکیش چواچێوەیەکی فەرمی وەردەگرێت و دەبێتە قەوارەیەکی سیاسی ئیتر بوورکانی تورکبوونی خۆی دەتەقێنێت و بە جارێك هەرچی هەیە لەسەرخان و باری رۆشنبیری و تەنانەت مرۆڤەکانیش بە تورك دەکات و چیتر شتێك لە تورکیادا نامێنێت جگە لە تورکبوون یان خزمەتی تورك نەبێت.

***

<u>پەراوێزەکان:</u>

1. حوسێنی مەدەنی: کوردستان و ئیستراتیژی دەوڵەتان، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، هەولێر، 2000، ل 253
2. اورخان محمّد علی: السلطان عبدالحمید حیاته واحداث عصره، الطبعه الاولی، العراق، 1987، ص58
3. حوسێنی مەدەنی: سەرچاوەی پێشوو،ل256
4. م.ر.هاوار: کورد و باکووری کوردستان لە سەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دووەمی جیهانی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، خاك، سلێمانی، 2000، ل443-445.
5. اورخان محەممەد علی: سەرچاوەی پێشوو، ص60.
6. سەلام ناوخۆش: هۆکارەکانی لکاندنی ویلایەتی موسڵ بەعێراقی عەرەبییەوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی ژین، هەولێر، 2000، ل50.
7. زارەڤاند: تۆرانچێتی ودەرکەوتن لە ئایدۆلۆژیا و بەرنامە، وەرگێرانی، ئەبوبەکرخۆشناو، چاپی یەکەم، هەولێر، 1996
8. حوسێنی مەدەنی: سەرچاوەی پێشوو ل 256
9. حوسێنی مەدەنی:سەرچاوەی پێشوو،ل 257

## دووەم: هۆکار و چۆنێتی سەرهەڵدان وبزاڤی کەمالیزم.

پاش جەنگی جیهانی یەکەم و رووخانی حکومەتی ئیتیحادیەکان، دواجار هاوپەیمانان لە چواردەی تشرینی یەکەمی 1918دا حکومەتێکیان دروستکرد بەسەرۆکایتی ئەحمەد عزەت پاشا پاشان ئەوحکومەتە رزامەندی

خۆی دەربڕی لەسەر مەرجەکانی ئاگربەستی مۆدرۆس لە 31 تشرینی یەکەمی 1918دا. (1)ئیدی ئەم ئاگربەستە جاڕێك بوو بۆ دۆڕاندنی دەوڵەتی عوسمانی، چونکە گرنگترین مەڵبەندە ستراتیژییەکانی داگیرکران لەلایەن هاوپەیمانانەوە، هێڵکاری پلانە سیاسییەکانیان هێنایە رۆژگاری جێبەجێ کردنەوە،(2) بەپێی ماددەی حەوت لە ئاگربەستەکە ولاّتانی سوێندخۆر هەر ناوچەیەکیان بەگرنگ بزانیایە دەیانتوانی داگیری بکەن،(3) پاشان هاوپەیمانان سوپای عوسمانیان هەڵوەشاندەوە تاکو بە ئاسانی بە ولاّتدا تەڕاتێن بکەن و بێ گیروگرفت بن.(4)

ئینجا لیژنەیەك پێکهێنرا لە نوێنەری هەرسێ ولاّتی بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتالیا بە ناوی (لیژنەی سەرۆکایەتی هاوپەیمانان) کە کاریان چاودێریکردنی کردەوەکانی وەزارەتی عوسمانی بوو، بەکارهێنانی کەماتیەتیەکان، بە تایبەت ئەرمەن و یۆنانیەکان کە بارودۆخێکی وا هاتبووە کایەوە دەیانتوانی بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاریان بهێنن.(5) تێکڕای ئەمانە مۆتیڤ و حاڵەتیکی ئیلهامبەخشی وای فەراهەمهێنا کە بیری نەتەوەیی لای تورك زیندوو بکاتەوە و بورووژێنێت و جۆرێك لە وەلاّمدانەوەیان بۆ ئەم واقیعە هەبێت ودەستپێکی ئەم هاتنەگۆیەش بە دروستکردنی چەندین رێکخراو دەستیپێکرد، دواتر بەناوی پارێزگاری لە مافی ناوچەکان کەوتنە دژایەتی بێگانە و ئەم ڕێکخراوانە لە چەندین شوێن بە تایبەتی ناوچەی ئیزمیر و تراکیا لقیان هەبوو.(6) تێکڕا ئەم کۆمەلاّنە لە سەرەتادا بە شێوەیەکی هەڕەمەکی کاریانکردووە و پاشان چەند کۆبونەوە و کۆنگرەیەکیان سازداوە بۆ یەکخستنی کارەکانیان و تواناکانیان، بەلاّم بێسوود بوو.(7) دواتر کۆمەڵێك جەنگاوەر لە ئەستەمبوڵ لە رێگای کۆمەڵەیەکی نهێنییەوە بەناوی (قەرەقول) خۆیان ئامادەکرد بۆ بەرەنگاربوونەوە و توانیان سەرکەوتووبن لە کۆکردنەوەی چەکوچۆڵ و زەخیرە و ناردنی بۆ ئەنادۆڵ.(8) ئەمەش ترس و دڵەڕاوکێی لەلای هاوپەیمانان دروستکرد بۆیە بەخێرایی کەوتنە بلاّوە پێکردنی هەموو کۆڕ و کۆبوونەوەیەك و هەموو ڕۆژنامەیەکیان خستە ژێر چاودێرییەوە ئینجا

حکومەتی تۆفیق پاشایان پێکهێنا بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی هاوپەیمانان.(9)
لەلایەکی تریشەوە سەربارى جیاوازی هاوپەیمانان لەسەر چۆنیەتی دابەشکردنی کەلاکی دەوڵەتی عوسمانی، بەڵام دواتر لە کۆنگرەی ئاشتی لەسەر ئەوە رێکەوتن، کە لە پاشماوەی خاکی عوسمانی دەوڵەتێکی بچووك لە ناوچەی ئەنادۆڵ دروستبکەن ولە ژێر چاودێری هاوپەیمانانندا بێت وناوچەکانی تریش بڕیاری دابەشکردنی درا لە نێوانیاندا.(10)

پاشان لەمانگی شوباتی 1919دا (فینزولویس)ی سەرۆك وەزیرانی یۆنان بەرەسمی داوای لە کۆنفرانسی ئاشتی کرد کە خاوەنداریێتی شاری ئیزمیر و ناوچە یۆنانشینەکانی پێ بدەن وەك یاداشتێك لە بەرامبەر بەشداریکردنیان لە جەنگدا، دواجار هاوپەیمانان رەزامەندییان نواند و ئەوانیش لە 15ی ئایاری 1919دا بە بیست هەزار سەربازی یۆنانیەوە بە پاڵپشتی هێزەکانی هاوپەیمانان لەئیزمیر دابەزین وتوانییان هێزەکانی تورکیا لەو ناوچەیە دەرپەڕێنن.(11) لەم ساتەوەختەشدا خەڵکی سەرباری ئەو هەموو شکستەی کە تووشیان بووبووکە چی ئامادە نەبوون سەر بۆ ئەو پرۆژانە نەوی بکەن، بۆیە دەستیانکرد بە بەرگری و بزووتنەوەی چەکداری بەشێکی زۆری وڵاتی گرتەوە و خۆپیشاندان و دەنگی ناڕەزایی لە هەموو لایەکەوە بەرزبووەوە و تەنانەت (ئەستەمبوڵ )یشی گرتەوە وەك ئەوەی لە 19 مایسی 1919دا خۆپیشاندانێکی گەورە روویدا و چوار رۆژ دوای ئەوە ژمارەی بەشداربووان گەیشتە 200 هزار کەس.(12)

لەڕستیدا ئینگلیزەکان زوو لەمە تێگەیشتن و بە پەلە لە بنگوێی سوڵتانیان چرپاند کە بۆ هێمنکردنەوەی بارودۆخی پاراستنی ئاسایشی ناوچەکە پێویستە ئەو بزافە کپبکرێتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش کەسێکی شیاو بدۆزێتەوە.(13) ئەوە بوو مستەفا کەمال دواکەس بوو بۆ ئەم کارە، چونکە تاکە ئەفسەر بوو هیچ کارێکی پێنەسپێرا بێت. دیارە (کەمال)یش چاوەڕێی چانسێکی وەهابوو بۆیە خۆی دەڵێت:"ئەو دەم تەنها بیرم لەوە کردەوە کە چۆن

خـۆم بگەیەنمـە ئـەنادۆڵ و دەسـتبەجێ لـە دژی یۆنانییـەکان و ئـەو دەوڵەتـەی کەدەسـتەمۆی هاوپـەیمانان بـوو، هـیچ کاردانەوەیـەکی لـە خـۆی نیشـاننەدەدا بەرەیەکی مقاوەمەت دروستبکەم "(14).

مسـتەفا کـەمال پێـنج ڕۆژ دوایـی دابـەزینی هێزەکـانی یۆنـان گەیشـتە ئەستەمبوڵ بۆ ئەوەی بە سیفەتی پشکنەری سوپای سێی عوسمانی بنێردرێت بـۆ ناوچـە یاخیبووەکـان لـە ئـەنادۆڵ. (15) لەگـەڵ یەکـەم ڕۆژی گەیشـتنی بـە ئەسـتەمبوڵ ئـەوەی بـۆ دەرکـەوت تـا چ ئاسـتێك هێزەکـانی بێگانـە مەترسـییان لەسـەر سـەروەری وڵات دروسـتکردووە، بۆیـە ڕاسـتەوخۆ ڕوویکـردە شـوێنی عیزەت پاشا و داوای لێکرد کە بگەڕێتـەوە بۆ سـەر حوکم، ئینجا وتـی: نابێت سوڵتان دۆڕانی بەم شێوەی پێ قبوڵ بێت، چونکە ئەمە واتـای کۆتـایی هێنانـە بـە ورکیـا وەك دەوڵـەت و میللـەت و نەتـەوە، لەبـەر ئـەوە پێویسـتە حوکمـەتێکی بـەهێز دروسـتبکرێت کـە وەلأمـدەری ئـەم قۆناغـە چارەنووسسـازە بێـت و تورکـەکان پێویسـتە خۆیـان بـە خۆیـان ڕزگاربکـەن و نابێـت مانـداتی هـیچ دەوڵـەتێك قـەبوڵ بکـەن.(16) هەرچـەندە مسـتەفا کـەمال ئـەوکات نـاوی لـە سەرەوەی ئەو لیستە بوو کە هاوپـەیمانان دایاننـابوو بێگـرن و دووری بخەنـەوە بۆ دورگـەی ماڵتـا، بـەلأم هەرچۆنێك بێـت دواجـار ڕازیبـوون کـە بـە دەسـەلأتێکی زۆرەوە بینێـرن بـۆ ڕۆژهـەلأت.(17) پـاش گەیشـتنی ئـەتاتوك بـۆ دەڤەرەکـە زۆر چـالاکانە کەوتـە کـارکردن بـۆ ڕێکخسـتنی ئـەو کۆمەڵـە و ڕێکخراوانـەی کـە لـە جموجووڵـدا بـوون و زۆر بـە وریاییـەوە مامەڵـەی لەگـەڵ ئـەو بارودۆخـەدا دەکرد.(18)

مسـتەفا کـەمال زیـرەك بـوو لـە هەڵبـژاردنی ئـەو ناوچـەیەی کـە بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی هاوپـەیمانان دیـاریکردبوو، چـونکە ئـەو ناوچـەیە پـاش کشانەوەی هێزەکانی ڕوسیا و بەپێی پەیمانی (بریست–لیتۆڤسك)چۆڵکرا بوو، هـەروەها هێزەکـانی عوسمـانی و ئنگلیـز نـەیانتوانی بـوو کـۆنتڕۆڵی بکـەن.(19) بۆیـە لێزانانـە کەوتـە ورووژانـدنی چـەند مەسـەلەیەکی گـرنگ وەك بەنـدەکانی

مۆدرۆس و پاشەڕۆژی وڵات بە دەست خەلیفەی بێدەسەڵاتەوە، دواتر لە 21-22ی حوزەیرانی 1919دا برووسکەیەکی نهێنی نارد بۆ سەرجەم ئەو کاربەدەست و کارگێڕی و سوپاییانەی کە جێگەی متمانەی خۆی بوون، و ناوەڕۆکەکەی بەم شێوەیە بوو :

1.حکومەتی ئەستەمبوڵ توانای لێپرسراوێتی نییە و سەروەری نشتیمان لە مەترسیدایە.

2.بۆهێنانەدی ئەم ئامانجە پێویستە کار بکرێت بۆ رێکخستنی نیشتمانی بکرێ.

3.لە هەموو ناوچەیەکەوە سێ نوێنەر بنێرێت بە نهێنی بۆ سیواس.(20)

دوای ئەوەی سوڵتان بەمەیزانی داوای لە مستەفا کەمال کرد کە دەست لەکار بکێشێتەوە، ئەویش فێڵبازانە کردی بە هەلا و لە بروسکەیەکدا کە بۆ سوڵتانی نارد دەستی لە کار کێشایەوە، هەڵبەتە پێشتر وەك پارێزگاری لە خەلیفە و شەرەفی وڵات دەستی بەکارکردبوو بۆیە کازم قەرەبەگ کە سەرکردەی سوپایی بوو وازی لە پلەی خۆی هێنا بۆ مستەفا کەمال بەمەش توانی زیاتر بەرەی ئۆپۆزسیۆن رێکبخات.(21) دواجار کار گەیشتە ئەوەی کە بەرەی ئۆپۆسیۆن بتوانن لە 23ی تەمووزی 1919 لەژێر سەرکردایەتی ئەتاتورك کۆنگرەیەك گرێبدەن ونوێنەری چەندان ناوچە بەشداری تێدابکەن لە ئەرز روم.(22) دەرئەنجامەکانی کۆنگرە ئەم راسپاردانەی تێدابوو.

1.هەموو بەشەکانی وڵات بە سنووره نەتەوایەتیەکانەوە یەك پارچەن و دابەش ناکرێن.

2.لەکاتی رووخانی دەوڵەتی عوسمانیدا بەرگری لە هاتنە ناوەوەی بێگانە دەکرێت.

3.هەرکاتێك حکومەتی عوسمانی دەستەوەستان بوو لەبەردەم پارێزگاری لە سەربەخۆیی وڵات، ئەوکاتە بۆ ئەو مەبەستە حکومەتێکی کاتی دروستدەکرێت لەئەنادۆڵ ئەو حکومەتە لەلایەن کۆنگرەی نیشتمانیەوە هەڵدەبژێرێت.

4.بنەمای حکوم بەویستی گەل دەبێت.
5.هیچ جیاوگێك (ئیمتیازێك) نادرێت بەتوێژی مەسیحییەکان کە دەبێتە هۆی پشێوی سیاسی وتێکچوونی بالأنسی کۆمەڵأیەتی.
6.رازینەبوون بە هیچ ماندات و سەرپەرشتی هیچ وڵاتێك.
7.دابینکردنی هەموو رێوشوێنێك بۆ گرێدانی کۆنگرەی داهاتووی ئەنجوومەنی نوێنەران.(23)

هەرچەندە ئەم کۆنگرەیە نەیتوانی دەورێکی یەکلاکەرەوە بگێڕێت لە دۆزینەوەی سەرکردایەتییەك بۆ بزووتنەوەی نیشتمانی، بەڵأم رێگەی بۆ گرێدانی کۆنگرەیەکی تر خۆشکرد لە سیواس. (24)

ئەوەبوو کۆنگرەی سیواس لە 4 -12ی ئەیلوولی 1919 بەسترا و لیژنەی نوێنەرایەتی بە سەرۆکایەتی مستەفا کەمال هەڵبژێرا،(25) ئیتر لەوکۆنگرەیەدا بنەما سەرەکییەکان بۆ بزووتنەوەی نیشتمانی داڕێژرا و بڕیاردرا لەسەر بنەمایەکی فراوان کار بکرێت. (26) جەخت لەسەر ئەوە کرایەوە ئەو سنوورەی کە ئاگربەستی مۆدرۆس دیاریکردووە بپارێزرێت و گوێڕایەڵی هیچ فەرمانێکی سوڵتان نەکرێت و بۆ جێگرتنەوەی ئەو دەسەڵأتە کۆنگرەیەکی نیشتمانی پێکبهێنرێت.(27) پاشان دانوستان لەگەڵ حکومەتی سوڵتان کرا و لەگەڵ عەلی رەزا شا سەرەك وەزیران گەیشتنە ئەوەی کە ئەنجومەنی نوێنەران بە بەشداری هەموو لایەك هەڵبژێرنەوە، دواتر دەرکەت کە کەمال و لایەنگرانی لەو هەڵبژاردنەدا لەکۆی 175کورسی نزیکەی 116کورسی بەدەست هێناوە، ئەمەش گرینگترین هەنگاو بوو کەنایان، چونکە فۆڕمێکی رەسمیان بەدەستهێنا و دانپیانانێکی سوڵتانیش بوو.(28) دوای قەبوڵنەکردنی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن و پەرتەوازەکردنی لایەنگرانی مستەفا کەمال، لەبەر ئەوە ئەوانیش بڕیاریان دا لە23ی نیسانی1920دا لە ئەنقەرە یەکەمین ئەنجومەن دروستبکەن، بەناوی(شورای نیشتمانی گەورە)کە گرینگترین بڕیارەکانی راگەیاندنی (بڕوانامە نیشتمانی )بوو. کە ئەجێندای

کاری کەمالییەکان و بە تاکە سەرچاوەی یاسا دانرا لەو ولاتەدا و یەکەمین دیکۆمێنتی رەسمییە کە نەرێی هەموو نەتەوەکان دەکات لە تورکیادا، هەروەها داوای سەربەخۆیی ئەو ناوچانە دەکات کە زۆربەی دانیشتوانەکەی تورکن.(29) لەپاشاندا هەنگاوێکی گرنگتریان هاویشت ئەویش دروستکردنی حوکمەتێك بوو بە سەرۆکایەتی مستەفا کەمال لە1920/5/30دا، دواتر هەستان بەهەڵوەشاندنەوەی سەرجەم ئەو پەیماننامانەی کە حکومەتی سوڵتان مۆری کردبوو.(30)

ئەوەی رۆڵی زیاتری هەبوو لە بەهێزکردنی حکومەتی ئەنقەرە و بزووتنەوەی کەمالیدا و زۆرتر بە جەماوەری کرد، سەپاندنی پەیمانی سیڤەر بوو بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا لە 10ی ئابی1920 و ئیمزا کردنی لەلایەن حکومەتی سوڵتانەوە، پاشان فراوانبوونی دەسەلاتی یۆنانییەکان و راستبوونەوەی ئەرمەنەکان و کورد بۆ دروستکردنی دەوڵەت.(31)

ئەمەش پاڵی بەحکومەتی ئەنقەرەوە نا کە رووبکاتە سۆڤیەت و داوای یارمەتی و هەماهەنگ لێبکات و رێکەوتنامەی هاوکاری و برایەتی لەگەڵدا ببەستێت، دواجار بە تێپەربوونی کات وگۆرانی هاوکێشە سیاسییەکان لەسەر ئاستی جیهان و ناوچەکە و بەهێزبوونی پێگەی مستەفا کەمال وئەگەری ئەوەی لێدەکرا کە ئامانجەکانی هاوپەیمانان دەستەبەر بکات یان بەرژەوەندییان بخاتە مەترسییەوە، بۆیە ئیتر هەر یەکە لە ئیتالیا لە13ی مارتی 1921دا لەگەڵ فەرەنسا رێکەوتننامەی فەرانکلین –بیلۆنی لە 20ی تشرینی دووەمی 1921 لەگەڵ کەمالدا مۆرکرد.(32)

ئەمانە ئەوناوچانەی داگیریانکردبوو لێی کشانەوە و چەك و زەخیرەکەشیان بە شۆرشگێران فرۆشت. دیارە ئەم پاڵپشتە سەربازی و دبلۆماسییە بووە هۆی ئەوەی کەمالییەکان بتوانن بە ئاسانی یۆنانییەکان لەتورکیا دەرپەرێنن و شاری ئیزمیر بگرنەوە، بۆیە یۆنان و بەریتانیا هەستیان کرد کەمال و بزووتنەوەکەی بوونەتە واقیعێك و رەنگە سڕینەوەی ئاسان نەبێت

و ئەگــەری لەدەستچــوونی بەرژەوەنــدی هاتــە ئــاراوە، بۆیــە ناچــاربوون لــە ئاگربەستی (مودانیا) لە 11/ 10 /1922 دەستبەرداری هەموو خاکی تورکیا بن.(33)

ئــیتر هاوپــەیمانان لــە24ی تــەمووزی 1923دا لــە دوای واژۆکردنــی پەیمانی لۆزان، دانیانا بە سەربەخۆیی سیاسی تورکیادا و سەروەری بەسەر هــەموو ئــەو زەویانــەی کــە لــە پەیماننامەکــەدا هــاتبوو، لەبەرامبــەردا دەســـتهەڵگرتنی تورکیـــا لـــە خـــاکی عێـــراق و ســـوریا و فەڵەســـتین و قوبرس...هتد،(34) جگە لە ویلایەتی موسڵ کە تا ماوەیەکی زۆر مەیدانی کێبڕکێی نێوان تورکیا و بەریتانیا بوو، بەڵام دواجار لە رێگای کۆمەڵەی گەلانەوە کێشەکە چارەسەرکرا.بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین ئەوەی رۆڵی هەبوو لەسەرخستنی بزاڤی کەمالییەکان و گەشەکردنیدا چەند فاکتەرێك بوو:
1.گەشەکردنی بورژوازی نیشتمانی تورکی کە کاتی ئەوە هاتبوو بێنە سەر دەسەلأت.
2.برەو سەندنی بیری نەتەوایەتی.
3.بــوونی پاشمــاوەی دەوڵــەتی عوسمــانی لــە رووی سیاســی و ســەربازی و کارگێڕییــەوە، کــە وەك بنــەما و دەســتمایەیەك ســوودی لێــوەردەگیرا.(35)
ســەرباری ئەمــەش پێموایــە یارمــەتی کوردەکــان لەسەرخســتنی بزووتنــەوەی کەمالیــدا نەقشــێکی بەرچــاوی گێــڕا و لــە کــاتێکی چارەنووســسازی ئــەم بزووتنەوەیەدا بوو، هەروەها رۆڵی دەوڵەتانی زلهێز و بەتایبەتی سۆڤیەت بوو کە داکۆکیکەرێکی باشبوو بۆ گەیشتنە قۆناغی کامڵبوونی بزووتنەوەکەی کەمال و نەیهێشت هەر لە بێشکەدا بخنکێنرێت.

***

**پەراوێزەکان:**

(1)د.ئیبراهیم خەلیل احمەد، د.خلیل علی مراد :ایران وترکیا، دارالکتب للطبع والنشرموصل، 1992، ص229.

(2)**تەلار عەلی ئەمین : سیاسەتی کەمالی و بزافی ڕزگاری خوازی نەتەوەی کورد لەباکوری کوردستان، نامەی ماستەر پێش کەش بەزانکۆی سەلاحەدین کراوە،هەولێر،**2000، **ل**21.(**بلأونەکراوە**).

(3)مصطفى الزين: اتاتورك وخلفاؤه،الطبعه الاولى، بيروت، 1982، ص93.

(4)**تەلار عەلی ئەمین: سەرچاوەی پێشوو،ل**22.

(5)**د.خليل ابراهيم واخرون: تركيا المعاصره، بغداد،** 1988، **ص**28.

(6)**د.ايبراهيم خليل احمد، د.خليل علي مراد: سەرچاوەی پێشوو، ص**230.

(7)كارل بروكلمان: تاريخ الشعرب الاسلاميه،ت:نبيه امين فارس، منيرالبعلبكى، الطبعه الاولى دارالعلم للملاين،بيرت،2000، ص689.

(8)**د.ابراهيم خليل احمد، د.خليل علي مراد :سەرچاوەی پێشوو،ص ص** 230–231.

(9)**تەلار علی امیر : سەرچاوەی پێشوو،ل**.23

10. **د.ئيبراهيم خليل احمد واخرون، سەرچاوەی پێشوو، ص** 26–.27

11. **نوئیل باربەر: فەرمانڕەوایانی قۆچی زێڕین لە سوڵتان سلێمانی قانونییەوە تا ئەتاتورك، و: ڕێبوار کەریم، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر،**2001 ، **ل**.231

12. **د. اخليل ابراهيم احمد واخرون: سەرچاوەی پێشوو، ل**27.

13.**تەلار علی ئەمین:سەرچاوەی پێشوو، ل**.23

14.**نوئیل باربەر:سەرچاوەی پێشوو،ل**232.

15.د.احمد نورى النعيمى: الحياة السياسية في تركيا الحديثه (1918-1938)دار الحرية، بغداد،1990، ص 14-15.

16.مصطفى الزين: سةرضاوة ثيَشوو،ص .98

17.مصطفى الزين: هةمانسةرضاوة، ص 101.

18.**تەلار عەلی ئەمین : سەرچاوەی پێشوو ل** 23.

19.**سەلام ناوخۆش :دراسه سياسيه حوله اختلال وتقسيم كردستان، ت: يوسف كمال، الگبعه الاولى، مكتب التفسير،** 2002، **ص** 80

20. **د.ابراهيم خليل احمد واخرون : سەرچاوەی پێشوو ص** 231

21.**تەلار عەلی ئەمین : سەرچاوەی پێشوو،ل** 25.

22.**د. احمد نوری النعیمی: سەرچاوەی پێشوو،ل** 20

23.محةممةد عزت دروزة: تركيا الحديثه، مطبعة الكشافه، بيروت، 1946، ص

24.**د.خليل ابراهيم احمد واخرون: سەرچاوەی پێشوو، ص**29

25.یوسف گۆران: روسیای بەلشەفیك و بزووتنەوەی کەمالی، سیاسەتی دەولی، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، سلێمانی، ژ34، 2001، ل48
26.د.خلیل ابراهیم احمد واخرون: سەرچاوەی پێشوو، ل29
27.تەلار عەلی ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل27
28.تەلار عەلی ئەمین: سەرچاوەی پێشوو،ل28
29.کارل برۆکلمان: سەرچاوەی پێشوو،ل
30.تەلار عەلی ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل32
31.سەلام ناوخۆش: کوردستان چۆن داگیرکراو دابەشکرا، چاپی دووەم، 2000، ل 51
32.د.فوئاد حەمە خورشید، جەزا تۆفیق تالیب: کۆنفرەسی لۆزان، کۆنفرەسی دابەشکردنی کوردستان، سیاسەتی دەولی، سەنتەری لیکۆڵینەوەی ستراتیژی، سلێمانی، ژ 33، 2001، ل5-6
33.سەلام ناوخۆش : کوردستان چۆن داگیرکرا، ل 53.
34.د.ابراهیم خلیل احمد، د.خلیل علی مراد: سەرچاوەی پێشوو،ص.237
35. تەلار عەلی ئەمین:سەرچاوەی پێشوو،ل32.

## باسی دووەم

### هۆکار و پاڵنەری بەشداریکردنی کورد لە جووڵانەوەی کەمالیدا و پێگەی لەسەرخستنی ئەو بزاڤەدا:

بێگومان ناتوانین باس لە جەنگی سەربەخۆی تورکیا بکەین بەبێ ئەوەی پەنجەنمای رۆڵی کورد نەکەین لە هەماهەنگی و پشتگیری ئەو بزووتنەوەیەدا. دەبێت ئەوە بزانین کە سەرەتای لە دایکبوونی بزووتنەوەی دژ بە ئیمپریالیزم لە ناوچەکانی رۆژهەلات و کوردستاندا بوو، چونکە ئەم ناوچەیە خاوەنی چەند تایبەتمەندیەکی ستراتیژی بوو بۆ نمونە: بۆشاییەکی کارگێڕی و سیاسی لە کوردستاندا دروستبووبوو چونکە پێشتر بەهۆی رێکەوتنامەی سایکس - بیکۆ - سازەنەڤەوە باکوری کوردستان بەر روسیای

تـزاری کـەوتبوو، بـەلاّم بـەهۆی کودەتـای بەلشـەفیکەکان و پـەیمانی (بریسـت لیتۆفسـك)لـە ئـازاری 1918روسـیا لـەم پەیماننامەیـە کشـایەوە، لەلایـەکی تریشـەوە ئـەو ناوچـەیە هـیچ کـات لەلایـەن هێزەکـانی حکومـەتی عوسمـانی ئینگلیزەوە نـەتوانرابوو کۆنترۆڵ بکرێت. سـەرباری ئەمـەش کاریگـەری کۆمەڵـە سیاسییە کوردیەکان لەسەر عەشائیرەکانی ئەم ناوچەیە زۆر لاواز بوو.(1)

بـەم شـێوەیە کوردسـتان بـەهۆی هەڵکەوتـە جوگرافیاکـەی گـەورەترین خزمەتی بەکەمالیەکان کـرد، وێـڕای ئـەوەش کـەمال کەسێك بوو بۆ گەیشتن بە دەسـەلاّت هـەموو کـارێکی دەکـرد و بە بـەکارهێنانی سیاسـەتێکی دیماگۆگیانـە هەوڵیدا خۆی لە پیاوماقولاّنی کورد نزیك بکاتـەوە، بۆیـە زۆر جار بەجلوبـەرگی کوردییەوە لە دیار بەکر و ناوچە کوردییەکانی تـر دەگـەڕا و خوازیـار بـوو کچـی پیاوماقوڵێکی کورد بهێنێت بۆ ئەوەی شوێن پێی خۆی لەودەڤەرەدا قـایم بکـات و سوود لە توانستەکانی کورد وەربگرێت لـە پێنـاو بەرجەستەکردنی مەبەستە شاراوەکانی خۆیـدا، پاشـان ئاراستـەکردنیان بـەرەو ئامانجـە خوازراوەکـان. بـەو پێیـەی ئـەم ولاّتـە بنکەیـەکی گرینگـی سـەربازی و سەرچـاوەیەکی سـامانی دەوڵەمەند و توانای مرۆڤی زۆری هەیە، کە بۆ مستەفا کەمال لەم قۆناغـەدا زۆر پێویسـتە. (2) دواجـار کەمالیبـەکان بـە سیاسـەتە دوالیزمەکـەیان دەرەبەگـە کوردەکانیـان بـۆ لای خۆیـان راکێشـا، بـەوەی کەپـەیمانیان پێـدان حـوکمی خۆجێییان پێدەدرێت لـە ناوچـەکانی خۆیانـدا، لەبـەر ئـەوە هەنـدێ لـە سـەرداره کوردییـەکان بەشـداریان لـە کـۆنگرەی ئەرزڕومـدا کـرد و هاوسـۆزی خۆیـان بـۆ بزووتنەوەکـــەی کـــەمال دووپـــاتکردەوە. (3) دیـــارە بەشـــداریکردنەکەش بەشێوەیەکی چالاکانە بووە، بەجۆرێك کە سەرۆکایەتی کۆنگرە لەلایـەن هەشـت کەسـەوە دەکـرا، کـە سـیانیان کـورد بـوون، ئەمـە و جگـە لـەوەی کـە لەشـورای نیشتمانی گەورەدا پێگەیـەکی دیاریـان هـەبوو، بەنزیکـەی حـەفتا و دوو نوێنـەر بەشداربوون. (4)ئـەو سـێ کـوردەی کەسـەرۆکایەتی کـۆنگرەی ئـەرزڕومیان کـرد (شێخ فەوزی و سەعدولاّ بەگ وحاجی موسا )بوون.(5) پاشـانیش لـە کۆنگرەی

(سیواس) دا (ڕەئوف بەگ و خواجە ڕەئیف ئەفەندی و شێخ حاجی فەوزی ئەفەندی و بەکرسامی بەگ ) بەشداری بوون. (6) لە لایەکیترەوە مستەفا کەمال توانی بەناوی یەکێتی دین و یەك پارچەی وڵاتەوە شەقاری نێوان ڕوناکبیرانی کورد و عەشائیرەکان کە هەبوو زیاد بکات. دواجار توانی لە وتارێکدا دەست بەسەر سایکۆلۆژیای سادەی کۆمەڵگەی کوردیدا بگرێت بەمەی کە دەیگوت : "ئێمەی کورد و تورك براین لەسەر ئەو خاکە خوێنمان ڕژاوە، ئەمڕۆ هەر دوو لا یەك دوژمنمان هەیە و یەك زۆردار ئەمان چەوسێنێتەوە، بۆیە پێویستە هەموومان هەست بەوە بکەین کە پێویستییەکی لەوە گەورەترمان لەسەر شانە کە هەر نەتەوەیەك بە جیا بۆ خۆی تێبکۆشێت ".(7) سەرباری ئەمەش دەیویست لە ڕێی پڕوپاگەندە و بڵاوکردنەوەی مەترسی ئەرمەن، کە گوایە دەیانەوێت لەسەر خاکی کوردستان دەوڵەت دروستبکەن، کورد بەلای خۆیدا ڕاکێشبکات و بەمەش دەیویست بیانکات بە هاوسەنگەر و هاوخەباتی خۆی. پاشان لە ئابی 1919دا بڕیارەکانی کۆنگرەی ئەرزڕوم ڕەوانەی ژمارەیەك لە دەرەبەگی کورد کرد و پێی ڕاگەیاندن کە پێویستە هەموو لایەك دژی خواستەکانی ئەرمەن بجەنگین (8)، لەبەر ئەوە هەندێ لەدەرەبەگە کوردەکان هەستی نەتەوەییان لاواز بوو بۆیە وەڵامی ئەم بانگەوازی کەمالیان دایەوە، لە لایەکیترەوە دەرکی بەرژەوەندی نەتەوەییان نە دەکرد.(9) هەروەها لە کۆنگرەی ئەرزڕومدا کە کوردەکان بەشداریان تێدا کرد، تێدا هاتبوو:"ویلایەتی ئەرزڕوم و سیواس و دیاربەکر و خەربوت و وان و بەتلیس، یەکپارچەن و قابیلی دابەشکردن و دابڕین نین، چونکە زۆربەی خەڵکی ئەو ناوچەیە سەرباری جیاوازی ڕەگەزی و کۆمەڵایەتیان بەڵام موسڵمانن".(10) بەم جۆرە کورد چوونە یەکەم دابەشکردنی هاوچەرخانەی کوردستانەوە کە نیوەی کوردستانی بە پارچەیەکی تر لە قەڵەم دا و نەدەبوو لە تورکیا جیاببێتەوە.(11)

لەلایەکی تریشەوە نابێت ڕۆڵی هاوپەیمانان فەرامۆش بکەین بەهۆی ئەو بارودۆخەی هێنابوویانە ئاراوە، چونکە وایکرد کورد بەو جۆرە هەڵوێست

وەربگرێت و بچێتە پاڵ بزووتنەوەی کەمال هەروەك مەحمودی مەلا عیزەت دەڵێت:" ئاڵۆزی لێدوان و لاستیکی قسەکردنی هاوپەیمانان ئەوەی دەرخست کە سیاسەتێکی ئاشکرا و نەخشەیەکی کۆنکرێتیان بەرامبەر بە کورد نەبێت" (12) دەرهاویشتەی ئەم سیاسەتەی هاوپەیمانانیش نەك هەر دەرەبەگە کوردەکان و سەرەك خێڵەکان بگرە سەرکردە سوپاییەکانیش هەڵوێستێکی لایەنگریان بەرامبەر بەکەمال ئەتاتورك و بزووتنەوەکەی وەرگرت وەك ئەوەی ئیحسان نوری پاشا و کۆمەڵێك ئەفسەری تری کورد لەناو سوپای عوسمانیدا بۆ پشتیوانی کەمال هەوڵی رووخاندنی حکومەتەکەی فەرید پاشایان دەدا. لە باشوری کوردستانیشدا ئەحمەد تەقی و رەقیب سورچی لە رەواندز ئەنجومەنی میللیان بۆ پشتیوانی کەمالیەکان دروستکرد، هەروەها هەر دوو خێڵی هەمەوەند و جەباریش پشتیوانی خۆیان بۆ دووپات کردەوە. لە هەمووی گرنگتر ئۆزدەمیری ئەفسەری تورکی لە رەواندز توانی جۆرێك لە نزیکبوونەوە لەگەڵ شێخ مەحمودا بکات.(13) هەروەها لە بەڵگەنامەیەکی وەزارەتی بەریتانیادا هاتووە، بە ژمارەی"fo37(4193)" لە رێکەوتی 23/12/ 1919دا "لۆرد کیرزن لەگەڵ وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسادا گەیشتوونەتە ئەوەی کە هیچ چاودێرییەکی بەریتانیایی یان فەرەنسی بەسەر سەراپای کوردستاندا نەکرێت، تەنها چەند ناوچەیەکی بچووکی باشوور نەبێت" (14) لەبەر ئەوە ئەم هەڵوێست گرتنەی هاوپەیمانان رۆڵێکی پاسیڤی گێڕا لەوەی کە پڕوپاگەندەی کەمال زیاتر نزیکیبکاتەوە لە کورد، تابتوانێت بەو ئاقارەیاندا ببات کە کەمال وەك رزگارکەری دین و نیشتمان لە ئاسۆی بیریاندا بێتە بوون.

لە گۆشەنیگای ئەوەی کە کوردەکان هیچ پشتیوانێکی ستراتیژییان دەستنەکەوت بۆ بزاڤە رزگارییەکەیان ناچار بە ئاراستەیەکدا رۆیشتن کە ببنە لایەنگری کەمال ئەتاتورك(15)، چونکە ئەوبارودۆخە جۆرێك لە دڕدۆنگی لای کورد دروستکرد بە شێوەیەك کە مستەفا کەمال بتوانێت ئەو دودڵییە لە بەرژەوەندی خۆی بقۆزێتەوە و بە پڕوپاگەندەی ئەوەی گوایە دەسەڵاتێکی

خۆجێیان پێدەدات زۆر فراوانتر لەوەی کە دەوڵەتانی سوێندخۆر لە پەیمانی سیڤەردا بە کوردیان دابوو. (16) ئەمەش ئەو کاتەبوو کە مستەفا کەمال لە رووی سەربازییەوە حاڵی زۆر خراپ بوو، وەلێ هەرکە لە ساڵی 1921 ترسی لەسەر نەما لە هەموو بەڵێنەکانی خۆی پاشگەزبووەوە و وەك بڵێی هەرگیز قەول و قەرارێکی نەدابێت.(17) لە لایەکی تریشەوە دواکەوتووی باری کۆمەلایەتی خەڵکی کوردستان ڕێگربووە لەوەی کە کارێکی بەهێز و نەخشە کێشراو بۆ بزووتنەوەی رزگاری بکرێت، هەروەها نەناسینی رووی راستەقینەی تورکەکان و روپۆشکردنی خۆیان بەماسکی ئاینی و نیشتمانی.(18) هەر بۆیە کەسێکی وەك شێخ عەبدولقادر شەمزینی لە قۆناغێکی چارەنووسسازی وەك ئەو کاتەدا ئەوە رەتدەکاتەوە کە شۆڕشێکی سەراپاگیر لە کوردستاندا و تێکڕای بێگانەکان بە تورکەکانیشەوە بکرێنە دەرەوە.(19)هەر لەو کاتانەدا بوو کە کامەران بەدرخان دەڵێت: "لەسەر داوای لیژنەیەکی بەریتانی من و برایەکم لە ساڵی 1919دا سەردانی کوردستانمان کرد، بۆ ئەوەی وەزع و حاڵی کوردستان هەڵبسەنگێنین، پاشان هاوپەیمانان بەڵێنیان دابوو کە دان بەکوردستاندا وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ بنێن، کەچی کوردەکان پێیان نەنگ بوو لەم زروفەدا لە پشتەوە خەنجەر لە تورك بدەن".(20) ئاشکرایە ولاتانی زلهێز لەو کاتەدا مەبەستێکی ستراتیژیان بەرامبەر بەکورد نەبووە، بەڵکو بە دڵنیاییەوە ویستویانە وەك کارتی فشار کورد بەکاربهێنن، هاوکات لەگەڵ ئەوەدا ئەم هەڵوێستە جۆرێك لە دڵپاکی و بەوەفای کورد بەرامبەر پەیمان و هەروەها نامەردی نەکردن بەرامبەر گەلانی تر دەردەخات. لەلایەکی تریشەوە سادەیی و ساویلکەیی کورد لەو کاتەدا رۆشندەکاتەوە هەر وەك (عەبدولڕەحمان قاسملۆ ) گازەندی ئەو هەڵوێستە دەکات و دەڵێت:" ئەو هەڵەیەی کە کورد لەو سەروبەندەدا کردوویانە ئەوە بووە پشتیان بە بەڵێنی زارەکی و ئەو راگەیاندنانە بەستووە کە کەمالییەکان پێیان داون، لەکاتێکدا دەبوو کورد سووربێت لەسەر ئیلتیزامات و زەمانەتی نوسراو، جگە لەوەش

پشتیان بەدابونەریتی ناوخۆیان بەستووە و لەو بەڵێنانە پاشگەز نەبوونەتەوە کە داویانە و سیاسەتیان بە کاری دیوەخان زانیووە "(21). بەم شێوەیە کورد پشتگیری تورکەکانیان کرد تا لە سەرکەوتنی تەواوەتی نزیکیان خستنەوە و بەیارمەتی ئەمان توانیان سوپای حکومەتی ئەستەمبوڵ ببەزێنن، پاشان ئەنجومەنی باڵای نیشتمانی تورکی ئامادەبوونی 380 نوێنەر لە ئەنقەرە، کۆنگرەی خۆی بەست، ئینجا بڕیار لە دامەزراندنی حکومەتێك درا لە ئەنقەرە، (22) دواجار توانیان لە 1920/5/30حکومەتێکی کاتی بە سەرۆکایەتی مستەفا کەمال دروستبکەن و ئیتر بوونە دیفاکتۆ و واقیعێك کە نەدەتوانرا بە ئاسانی بسڕێنەوە و جۆرێك لە دانپیانانی رەسمیان وەرگرت، لێرەدا کاریان بە کورد نەما، بۆیە ئەتاتورك لەبەردەم ئەنجومەنی شورای نیشتمانی باڵادا دەڵێت: "ئـــــــەم دەوڵەتـــــــــەی کــــــــە ئێســـــــــتە پێکمانهێنــــــــاوە.(23) بەم شێوەیە تورکەکان دەمامکی خۆیان لاداو شێوەی راستەقینەیان دەرکەوت، بۆیە تا دواسنوور وترۆپکی و بێوەفایی بەرامبەر بە کورد ناپاك بوون. لە تورکیادا کەوتنە تواندنەوە و لەناوبردنی کلتور و پێکهاتەی نەتەوەی کورد، پاشان راگواستنەوەیان و بەتورکاندنیان.(24)بەم جۆرە نەك هەر خود موختاری و پێنەدرا، بەڵکو ناویشی لە مێژووی تورکدا سڕایەوە و ئینکاری ئەوە دەکرا کە کورد لەتورکیادا هەبێت، بەڵکو ئەوەی هەبوو تورکی چیایی بوون و جوگرافیایەك بەناوی کوردستانەوە نەما ئەوەی ناوزەد دەکرا ناوچەی رۆژهەلات بوو. هەر بۆیە شەرعیەتی بوونی لە تورکیادا گەیشتە ئەوەی کە نوسەری ئەڵمانی(هایکوف فلوت ئاو)بڵێت: "لە تورکیادا مرۆڤ دان بە کورد بوونی خۆیدا بنێت تا ئەمڕۆش بڤەیە و سەرئێشە بۆ خاوەنەکەی دروستدەکات ".(25) لە قوتابخانەکانیشدا جگە لە باسی تورك و رەگەزی تورك شتێکی دیکەیان فێر نەدەکردن، لە فایلەکانیشدا خانەیەك بۆ پڕکردنەوە زیاد کرا: "ئەفەندی تاکویێ ئامادەی خۆت بە رەگەزی تورك بزانیت ."(26) بۆیە هەر

**کوردێك خۆی بە تورك نەزانیایە تەنانەت نە دەبوو بە کارمەندیش، چ جای دەستەبەرکردنی مافی نەتەوەیی.**

**پەراوێزەکان:**

1.**سەلام ناوخۆش: کوردستان چۆن داگیرکرا، ل**51-52.

2.**تەلار عەلی ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل**34

3.جلیلی جلیل واخرون : الحركة الكردية فی العصر الحديث، ت: عبدی حاجی، الطبعة ألأولی، دار الرازی، بيروت، 1992، ص.105

4.**کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، دەزگای رۆشنبیری و بلأوکردنەوەی کوردی، بەغداد،** 1985،ل73

5.**تەلار عەلی ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل** .35

6.البرو فيسور م.أ. هسرتيان: كردستان تركيا بين الحربين، ت: د.سعدالدين ملاباظی نازی، الطبعة الاولی دارالكتاب، بيروت، ص22.

7.**سەلام ناوخۆش: کوردستان چۆن داگیرکرا، ل**62

8.**جلیلی جلیل واخرون: سەرچاوەی پێشوو، ل**105.

9.**البرو فيسور م.أ. هسرتيان: سەرچاوەی پێشوو، ص.**21

10.**البرو فيسور م.أ. هسرتيان: سەرچاوەی پێشوو، ص.**19

11.**تەلار عەلی امین: سەرچاوەی پێشوو، ل**35

12.**بازنەکانی ململانێ وستراتیجی ئاسایشی نەتەوەی کورد،چاپی دووەم،سلێمانی،** 1919، ل17

13.**سەلام ناوخۆش: کوردستان چۆن داگیر کرا، ل**62

14.**د.مارف عومەر گولّ: پەیمانی سیڤەر لە سیاسەت و یاسای نێودەوڵەتاندا، سیاسەتی دەولی، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، سلێمانی، ژ** 17، 1996، ل35.

15.**تەلار عەلی امین: سەرچاوەی پێشوو، ل**32

16.**عەبدولڕەزاق عەبدولڕەحمان محەممەد: تێڕوانینێك بۆ دۆزی کورد، چاپی یەکەم، چاپخانەی تیشك، سلێمانی،** 2001، ل10-11

17.**کریس کۆچێرا: کورد لە سەدەی** 19-20**دا ، و:حەمە کەریم عارف، چاپی یەکەم، چاپخانەو ئۆفیسی شڤان، سلێمانی،** 2003، ل46

18.**تەلار عەلی امین: سەرچاوەی پێشوو، ل**32

19. **جلیلی جلیل واخرون: سەرچاوەی پێشوو، ص**104

20.د.گوینتەر دیشنەر: کورد گەلی لەخشتەبراوی غەدەرلێکراو، و: حەمە کەریم عارف، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، 1999، ل72
21.د.گوینتەر دیشنەر: سەرچاوەی پێشوو، ل76
22.سەلام ناوخۆش: کوردستان چۆن داگیرکرا، ل66
23.تەلار عەلی امین: سەرچاوەی پێشوو، ل40
24.هیوا عەزیز سەعید: ناسیۆنالیزمی کوردی 1880-1939، مەکتەبی بیرو هۆشیاری (ی.ن.ك)، سلێمانی، 2003، ل24
25.د.گوینتەر دیشنەر: سەرچاوەی پێشوو، ل67
26.حوسێنی مەدەنی: سەرچاوەی پێشوو، ل259-260

# بەشی دووەم

# گۆڕانی هاوکێشە سیاسییەکان
# و
# رۆڵی لەدروستکردنی پێوەندی کەمالی و بەلشەڤیکدا

## باسی یەکەم

### یەکەم: شۆڕشی بەلشەفیک و ئەو زەمینە مێژووییەی کەتێیدا هاتەبوون.

بنەماڵەی تزاری رۆمانۆف زیاتر لە سێ سەدە فەرمانڕەوایی گەلانی روسیایان کردبوو، بەدەست و مەچەکی ئاسنین توانیان سنووری پانوپۆڕی

ئیمپڕاتۆرییەکەیان بپارێزن، ئەم بنەماڵەیە لە هەر لاوازی جڵەو شلکردنێکدا تووشی شۆڕشی گەلانی سەربەخۆخواز دەبوون، هەر وەك شۆڕشی 1905 بە هۆی تێکشکانی لە شەڕی دژی یاباندا، هەروەها شۆڕشی 1917 بە هۆی نشوستی بەرامبەر ئەڵمانیا.(1)

پاش ئەوەی روسیا بەقۆناغێکی ئابووری ترسناکدا تێدەپەڕی و ئاشکراترین دیاردە بڵاوبوونەوەی برسێتی بوو لە پترۆگرادی پایتەختدا.(2) چونکە هەموو شت لەو وڵاتەدا رووی لە کەمبوونەوە دەکرد بە هۆی هەڵئاوسانی پارە بەبێ زیادبوونی بەهاکەی ئەمەش دەرهاویشتەی جەنگ بوو، دواجار بەرزبوونەوەی نرخ و کرێی گواستنەوە خراپ بوونی دۆخی ئابووری لێکەوتەوە، بە جۆرێك حکومەت ترسا لەوەی کە سەر نەکەوێت لە جەنگدا.(3) ئەم بارودۆخە ئاڵۆز و داتەپیوە خۆپیشاندانی گەورەی لێکەوتەوە و دروشمەکانی(نان، ئاشتی، زەوی)یان بەرزکردەوە، ئەمەش گوزارشتی لە ئامانجی کۆن ونوێی ملیۆنەها روسی هەژار دەکرد، هەر بۆیە هاوپەیمانان لەوە دەترسان ئەمە ببێتە هۆکارێك کە سوپای روسیا لە شەڕ کۆڵ بدەن، دواتر سوپای ئەڵمانیا دەستی بەتاڵ بێت بۆ بەرەی رۆژئاوا و لە لایەکی تریشەوە شوێنە ستراتیژیەکانی ئۆکرانیا و قەوقاس داگیربکات. (4) بۆیە قونسوڵی بەریتانی لە کۆتایی ساڵی 1916دا (لۆر بوشانان)هاتە روسیا و مەترسی هاوپەیمانانی لە بارودۆخی ناوخۆی روسیا بە قەیسەر راگەیاند و ئاگاداری کرد کە پێویستە جۆرێك لە کرانەوە بە رووی گەلدا بکرێت و بەشدارکردنی دەسەڵاتیان پێبدرێت، بەڵام قەیسەر ئەمەی رەتکردەوە.(5) لە لایەکی تریشەوە دەنگی ناڕەزایی خەڵك بەرزبووەوە و خۆپیشاندان دەکرا، بە تایبەت لە 9ی کانونی دووەمی 1916 نزیکەی 150 هەزار کەس لە پترۆگراد مانیانگرت ئەمەش دەنگ و سەدایەکی زۆری لە شارەکانی مۆسکۆ و باکوور.. هتد دایەوە، هەر بۆیە حکومەت لە 26ی کانوونی دووەمدا فەرمانیدا سەرکردەکانی بەلشەڤیك دەزگیر بکرێن، چونکە گومانی ئەوەیان لێدەکرا کە لە پشتەوەی ئەم

خۆپیشـاندانەنەوە بـن.(6) پاشـان قەیسـەر (نیقـۆلای دووەم ) هەوڵیـدا ئـەو مانگرتنـەی کـە کارگـەکانی پترۆگـرادی گرتـەوە نـەهێڵێت و سـەرکوتی خۆپیشـاندانەکان بکـات.(7) بـەڵام ئـەم هەوڵانـەی بێسـودبوو، نـەدەتوانرا خۆپیشاندانەکان سەرکوت بکرێت، لەبەر ئەوەی سەربازەکان خۆشیان برسی و بیٚ توانابوون بەهۆی:

1. تێکشکانی بەردەوام لە شەڕەکاندا.

2. خراپی و لێنەهاتوویی سەرکردە سەربازییەکان

3. ئـەو ستراکچـەر و بنـەما ئازادییانـەی کـە بەلشـەفیکەکان لـە نـاو خەڵکیـدا بڵاوەیان پێکردبوو.(8)

ئەوکات کە پلەی گەرما لە ژێر (سفر)دا بوو خـەڵکی بە چەندان ریز لە بەردەم فرنەکاندا و بە چەندین کاتژمێر دەوەستان بۆ نان، کەچی قەیسەر هەر خـەریکی سـەفەر کـردن بـوو ئەمـەش وایکـرد خـەڵکی متمانـەیان بـە حکومـەت نەمێنێت، بۆ رۆژانی دواتر خەڵك رژانە ناو شەقام و کۆڵانەکان، بە تایبەت پاش ئـەوەی کـە لـە 18ی شـوباتدا (بوتیلـۆف)ی بەڕێوبـەری گـەورەترین کارگـە لـە پایتەختـدا کارگەکـەی داخسـت و رۆژی دواتـر بیسـت هـەزار کرێکـار خۆپیشاندانیان سازکرد.(9) پاشان سەرۆکی لیژنەی دۆما (زودزیانکو) داوای لە قەیسەر کرد کە وەزیری ناوخۆ (برۆتو پۆپۆف) لەسەر کار لابدات، چونکە خراپ و گەندەڵ بوو، بەڵام قەیسـەر پێشنیاری وای پیٚ قەبوڵ نەبوو و رەتـی کردەوە ئەمەش دەستپێکێك بوو بۆ گەرمبوونی شۆڕش، سەرهەنگ (خابالوف) هەوڵیـدا بـە دەسـتی ئاسـنین خۆپیشـاندانەکان سـەرکوت بکـات، سـەرئەنجام ئەمـەش زیـاتر خزمـەتی گەشەسـەندنی شۆڕشـی کـرد تەنانـەت هەنـدێك لـە یەکەکانی سوپا بە تایبـەت لەشکری (سمینۆفسکی) بەشداری شۆڕشیان کرد دژ بە سوپای حکومەت، دواجار خابالوف لە 27ی مانگدا هەڵهات و لە 28ی مانگدا گرتیان و قەیسەریش بنکەی سەرکردایەتی جێهێشت و چووە ناوچەی تسـارکوبە – سـیلان، ئینجـا وەزارەتـی حکومـەتی قەیسـەر وەسـتێنرا و بـەم

شێوەیە حکومەت رووخا و  پاشان دەست بەسەر سەراپای دام و دەزگاکاندا گیرا و هەموو زیندانیەکان ئازاد کران، ژمارەی قوربانیەکانیش لە پترۆگراددا 1443 کوژراو و بریندار بوو لە نێوانیاندا 869 سەرباز و 60 ئەفسەر هەبوو، لە دەرەنجامی شۆڕشەوە سۆڤێتات (شووراکان ) دروستبوو. (10) کە ئەنجومەنێکی دانراو بوو لە فەرمانبەری سەربازی و کرێکار و نوێنەری جوتیار، دەسەلآت بەم ئەنجومەنە سپێردرا، سەرەتا ئەم هیچ قسەیەکی لە کشانەوەی هێز نەکرد لە بەرەکانی جەنگ، بۆیە هاوپەیمانان خۆشییان پیشاندا.(11) ئینجا لە 21 ی ئازاردا حکومەتێکی کاتی بۆرژوازی دروستبوو بە سەرۆکایەتی (ئەمیر لڤۆڤ )، بەلآم پاش ماوەیەك هەندێك كێشە لە نێوان حکومەت و سۆڤێتاتدا دروستبوو، چونکە گەلی روسیا داوای کشانەوەی لە شەڕی ئیمپریالی و  وازهێنان لە دۆستایەتی هاوپەیمانانیان دەکرد، هەروەها خوازیاری داگیرکردنی ئاشتی و رەتکردنەوەی دەرەبەگایەتی و کەمکردنەوەی کاتی کارکردن، داوای مافی ئازادی ودیموکراسییان دەکرد.(12)

پاش ئەوەی حکومەت نەیتوانی ئاواتەکانی گەل بێنێتەدی لەجێبەجێ کردنی داواکارییەکانیان، بۆیە بڕیاریاندا خەڵکی خۆیان دەسەلآتبگرنە دەست و لەم هەڵوێستەشیاندا بەلشەفیکەکان پشتگیرییان لێکردن، هەروەها کاریان بۆ دەستبەسەراگرتنی دەسەلآت دەکرد بێ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ (دۆما ) و لە 3ی نیسانی1917دا ( لینین ) لە سویسرا گەڕایەوە کە لە مەنفا و تاراوگە بوو دوور خرابووەوە، ئینجا بەسەرکردایەتی حیزبی بەلشەڤیك نەخشەیان بۆ گواستنەوەی دەسەلآت لە قۆناغی (بۆرژوای دیموکراتی )یەوە بۆ قۆناغی (ئیشتراکی )دادەڕشت. پاش سێ ڕۆژ لە گەیشتنی لینین بۆ روسیا، رۆژنامەی پراڤدا کە زمان حاڵی بەلشەفیکەکان بوو بابەتی (لینین)ی بلآودەکردەوە و دەیوت قۆناغی یەکەمی شۆڕش کۆتایی هاتووە و سەرەتای قۆناغی دووەمە لە شۆڕش، چونکە پێویستە دەسەلآت بەدەست چینی کرێکارەوە بێت هاوشان لەگەڵ جوتیار و زەحمەتکێشدا.(13) هەروەها بەلشەفیکەکان رۆڵێکی کارایان

له بلاۆوەپێکردنی بەدگومانی و بیٚ متمانەیی بەرامبەر حکومەت هەبوو، دواجار دروشمی (هەموو دەسەلاَت بۆ شوراکان )یان بەرزدەکردەوە، بەم شێوە خەلَکیان هاندەدا بۆ راپەڕین و لە3ی تەمووزدا سەربازانی لەشکری (الرمات)ی یەکەم بۆ خۆپیشاندانێکی چەکدارانە لە دژی حکومەت رێکخران، دواتر نوێنەریان نارد بۆ کارگەکان و باقی هێزەکانی پترۆگراد، بەم جۆرە یەکە سەربازییەکان و هێزی دەریایی وکرێکاران لە بەردەم کۆشکی (توریـد)دا ئامادەبوون کە لە 7/23 داوای رووخانی حکومەتی کاتییان دەکرد. بەلشەفیکەکان دەیانوت با دەسەلاَت بسپێردرێت بە شوراکان، بەلاَم بە ئاگر و ئاسن وەلاَمدرانەوە و رۆژنامەی پراڤدا داخرا، ئیدی لینین و هەندیٚ لە هاوڕێکانی خۆیان شاردەوە و دواتر دەسەلاَت بە تەواوی گەڕایەوە بۆ بۆرژواکان.(14)

لە لایەکی ترەوە کۆنگرەی شەشەمی بەلشەفیکەکان بەسترا و لینین ئامادەنەبوو، بەلاَم ستالین راپۆرتی لینینی خوێندەوە و تێیدا وتی: "ئێمە ناتوانین بە دروشمی دەسەلاَت هەمووی بۆ شوراکان بگەیەنینەنە دەسەلاَت "چونکە هەموو ئەمانە (شوراکان ) کلکی حکومەتن. دوای ئەوەی ولاَت تووشی نەهامەتی هات و قەرزەکانی گەشتبوونە 60ملیۆن رۆبلَی ئالَتون، ئا لەو کاتەدا 27ی ئاب کورنیلۆف سەرکردەی سوپای هێزەکانی خۆی ئاراستەی پایتەخت کرد بۆ ئەوەی کودەتایەکی سەربازی بکات. (15)

ئەو کات (کیرنیسکی ) کە چینی بۆرژوای گەورە بوو، وایزانی دوای ئەوەی کورنیلۆف زالٚ بوو بەسەر شۆڕشگێڕاندا ئیتر دەسەلاَت دەسپێردرێت بە خۆی و چینەکەی، لە راستیدا دواتر ئەوەی بۆ دەرکەوت کە کورنیلۆف نەك بە تەنها دژی بەلشەفیکەکان نییە، بەلَکو دەیەوێت بەسەر هەموو لیبرالٚ و دیاردەیەکی دیموکراتیدا خۆی بسەپێنێت. (16) هەر بۆیە کیرنیسکی دەستیکرد بە چەکدارکردنی کرێکاری کارگەکان و دەرهێنانی ترۆتسکی لە زینداناو ئازاد کردنی سەرکردەکانی تری بەلشەفیك، بۆ ئەوەی ئامادەسازییان بکات بۆ رووبەرووبونەوە لەگەلٚ کورنیلۆفدا. لە ئەنجامدا

**توانیان بیشکێنن و لە زینداندا توندی بکەن.(17) ئینجا کیرنیسکی لە 31ی ئابدا کرا بە سەرکردەی سوپایی و هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا پرۆژەی نوێنەری بەلشەفیکەکان کە دەیوت بادەسەلآت بگەڕێتەوە بۆ شوراکان قبوڵ نەکرا و پاشان کیرنیسکی لە دروستکردنی حکومەتێکی کۆماری کە لە مانگی ئەیلولدا بەڕێوەدەبرا لەلایەن پێنج ئەندامەوە پەلەی کرد و حکومەت نەیتوانی بارێکی سەقامگیر بەخۆیەوە بگرێت و بەردەوام کێشەی لە دەسەلآتدا هەبوو لە هەمان کاتدا لەناو ریزەکانی مەنشەفیکدا بەشێك جیابوویەوە بە ناوی (سۆسیال دیموکراتی ئینتەرناسیۆنال ) کە داوایان دەکرد پێویستە لەگەڵ بەلشەفیکەکاندا هاوکاری و هاوپەیمانێتی ببەسترێت.(18)**

**لەو کاتەی لینین سەرگەرمی نەخشە و پرۆگرامەکانی بوو بە ناو ئەندامانی حیزبدا بە شێوەیەکی نهێنی و دەیووت پێویستە سەرکردە سەربازییکان بە وریاییەوە هەنگاوبنێن هەتا خودی تروتسکی خۆشی تا ئەو کاتەی هۆشیاری تەواو دەدرێت بە چینی زەحمەتکێش و پرۆلیتار و بێدار دەکرێتەوە.(19) دواجار لینین لە نامەیەکدا بۆ کۆمیتەی ناوەندی پترۆگراد و کۆمیتەی مۆسکۆ لە 12-14ی ئەیلولی 1917دا لەژێر ناونیشانی (پێویستە بەلشەفیکەکان دەسەلآت بگرنە دەست) بە ڕاکشکاوی داوای دارمانی حکومەت و بانگەواز بۆ راپەڕینی چەکدارانە و خۆشکردنی زەمینەی ئەو راپەڕینە دەکرد، لە هەمانکاتدا لە 13-14 ئەیلولدا و لە گوتاری (مارکسیزم و راپەرین) هەمان داوا دووپاتدەکاتەوە. ئاشکرایە لینین ئەو بڕیارەی پاش زاڵبوونی بەلشەفیکەکان لە شوراکاندا و دوای ئەوەی کە دڵنیابوون زۆربەی سەرباز و جوتیار و کرێکاران بەرەو سیاسەتی بەلشەفیك راکێشراون، ئینجا راپەرموونی لاخەمڵیوە بەتایبەت پاش شکستی کودەتای ئاژاوەگێڕی کورنیلۆڤ.(20) لینین پەیامی خۆی لە تاراوگە لە فنلەندەوە بۆ سەرکردایەتی لیژنەی ناوەندی حیزب نارد، لە کۆتایی نامەکەدا دەڵێت:"حکومەت لەرزیوە بە هەر نرخێك بووە دەبێت لە ناو بیریێ و خڵچکیلە کاردا لە مەرگ دەچێت "ئەو نامەیە دوا فشاری حیزبی**

بەلشـــەفیك بـــوو بـــۆ راپـــەڕینی رۆژانـــی دواتـــر.(21) بەلشـــەفیكەكان دەیـــانوت ئامانجی پرۆلیتاریا گەیشتنە بە ئازادی و لەگەڵ ئەمەشدا راپەڕین بۆ گەیشتنە ئیشتراكیەت ئامانجی كۆتاییان دەبێت، چونكە بەرجەستە كردنی ئیشتراكیەت پێداویستی ئەو قۆناغە مێژووییەیە.(22)

لینین پێی وابوو كە رژێمی بۆرژوا تەنها لە رووخاندنی رژێمی تزاریدا بەشداریكردووە، ئەگەر نا بەتەواوی ئەركەكانی وەك:

1. ئاشتییەكی دیموكراسی راستەقینە.
2. دابینكردنـــی مـــافی چـــارەنووس و هەڵتەكانـــدنی لكانـــدنی زۆرەملێـــی نەتەوەكان.
3. دابەشكردنی زەوی بەسەر جوتیاراندا.
4. هەڵبژاردنی ئازادانەی دامودەزگاكان لەلایەن شوراكانەوە.

ئەمانە هەمووی دەسەڵاتی بۆرژوا نەیتوانیبوو بیهێنێتەدی. بۆیە لینین سـوربوو لەسـەر رووخانـدنی.(23) ئیتر لـەم وڵاتـەدا یەكـەمین رووبەڕووبوونـەوە لەگەڵ سیستمی سـەرمایەداری پێكداكێشـان لـەدایكبوو كـە لـە كۆتـایی سـەدەی نۆزدەهەمەوە لـە ئـەوروپا گەیشتبووە ترۆپك، پاشـان بـە هـۆی جـەنگی یەكـەمی جیهـانی یـەوە ئـەم سیسـتمە تووشـی بەركـەوتنێكی سـەخت و لێـدانێكی تێكشـكێنەر ببـوو، دواجـار لەگـەڵ خۆیـدا جۆرێـك لـە ناسـەقامگیری هێنـا، بـەم جۆرە كودەتاكە كە لە پاشاندا دەكرێت دەیتوانی پەیامێك بێت بۆ تێكشكاندنی سەرمایەداری و هەم هۆكاری خراپی و نەخۆشی ئەو بێت.(24) پاشان لینین لـە مـانگی تشـریندا بـە نهێنـی گەرایـەوە بـۆ پترۆگـراد و لـە 10ی هـەمان مانگـدا لیژنــەی مەركــەزی چــەند كۆبوونەوەیــەكیان كــرد بــە ســەركردایەتی لیــنین بــۆ دارشتنی نەخشەی شۆڕش، دواتر مەكتـەبی سیاسـیان لـە 7 ئەنـدام هەڵبـژارد و كاتێك بڕیاری هەڵایسانی شۆڕشیان دا هەموو ئەندامانی لیژنە رازیبوون لەسـەر ئـەو بڕیـارە تـەنها دوو ئەنـدام نـەبێت. لیژنـەی مەركـەزی وەك لیژنـەی سـەربازی شۆڕش وابوو، ئینجا بڵاوبوونـەوە بـە هـەموو ناوچە پیشەسازییەكانی روسـیا

بەمەبەستی سەرکردایەتی کردنی شۆڕش.(25) لەلایەکی ترەوە لیژنەی جێبەجێکاری ئەنجومەنی شوراکانی پترۆگراد لیژنەیەکی سەربازییان دروستکرد بە سەرکردایەتی (بودوفولیسکی) و ئەفسەرەکانیان دەنارد بۆ سەرجەم یەکە سەربازییەکانی پەیوەست بە پایتەختەوە بۆ ئامادەکردنیان بۆ گورزی سەربازی.(26) لەشەوی 24-25ی تشرینی یەکەمدا سوپای سوور و سەربازان و هێزی دەریایی شۆڕشگێڕان هەموو وێستگە و هێڵی ئاسن و پرد و ناوەندی پەیوەندیکردن و وێستگەی کارەبا و فەرمانگە حکومیەکانیان گرت لە پترۆگراد، (27) لە بەیانی رۆژی 25ی تشرینی یەکەمدا زۆربەی شار لەژێر دەستی شۆڕشگێڕاندا بوو، سوپای (الپورە المچادە) دژە شۆڕش توانیان هەندێك لە ناوەندەکان لە ناوەڕاستی شاردا بپارێزن بەتایبەت کۆشکی زستانە.

بەر لەوە کیرنیسکی بە نهێنی لە پترۆگراد بە ماشێنێکی قونسولخانەی ئەمەریکادا رایکردبوو، دواتر لە ئێوارەی 25ی تشرینی یەکەمدا کۆشکی زستانە دەستی بەسەرداگیرا و زۆربەی وەزیرەکانی پێشوو یەخسیرکران. لە ئێوارەی پاشتر واتا 26ی هەمان مانگ کۆنگرەی شوراکان بەسرا کە لە 650 ئەندام پێکهاتبوو لە 400 بەلشەفیك و180 ئیشتیراکی شۆڕشگێڕی چەپ و 70 مەنشەفیك بوون ئینجا بڕیاریاندا دەسەلاّت بە تەواوەتی بگەڕێننەوە بۆ شوراکان.(28) بەم جۆرە سەرکەوتنی شۆڕش سەرەونگون کردنی رژێمی بۆرژوا و کیرنیسکی و زاڵکردنی لینین و بەلشەفیکەکانی لێکەوتەوە و لە دواتردا بەلشەفیکەکان دەسەلاّتیان لە شوراکاندا پاوانکرد و یەکەمین کابینەی وەزاریان دروستکرد کە زۆربەی پایە گرنگەکانی لە دەستی ئەواندابوو، بەمەش زۆربەی کرێکار و خەڵکییان لێئالا و حیزبەکانی تر بە جۆرێك لە جۆرەکان پاشەکشەیان کرد .(29) ئەمانە هەمووی هەڵکەوتبوون بۆ لینین کە دەمێك بوو چاوەڕێی دەکرد بۆ سەرخستنی تێزەکانی هەر لە شۆڕشی بۆرژوای ژێرکەوتووی 1905ەوە خولیای بوو، بەو جۆرە یەکەمینجار لە مێژوودا حیزبێکی پرۆلیتاریا لە هەڵکەوتێکی سیاسی گونجاودا بە پلانی سیاسی

وئابووری پێشوەخت لە گەورەترین ولاّتی سەرمایەداری لاوازدا لە دوو قۆناغی شۆڕشدا، یەکەمیان بەهاوشانی بۆرژوا و دووەمیان دژی بۆرژوا بێتە سەرتەخت. (30)

دواجار لینین لە کۆنگرەی شوراکاندا راپۆرتی دەربارەی (ئاشتی زەوی) خوێندەوە، تێیدا وتی پێویستە لەگەڵ دەوڵەتان دانوستان بکرێت بۆ ئاشتی و دیموکراتی بەبێ هیچ قەرەبووکردنێك و داگیرنەکردنی زەوی خەڵکانی تر،هاوکات لەگەڵ دانی مافی چارەنووس بە هەموو گەلانی تر. ئینجا پێشنیاری (مرسوم الارچ)ی کرد کەهەرچی زەوی دەرەبەگەکان وخاوەن موڵك و خێزانی قەیسەر هەیە بەسەر گەلدا دابەش بکرێت و دروستکردنی حکومەت ودانانی لینین  بە سەرۆکی ئەوحکومەتە، هەروەها دانانی چەندین لیژنە بۆ ئەوەی بەڕێوەبردنی ولاّت ئاسانبێت.(31) پاشان لینین لە 6-7ی تشرینی دووەمدا و لە کۆبوونەوەی دووەمی سۆڤێتاتدا واتا (شوراکان) راستەوخۆ کرایە سەرۆکی ئەوحکومەتە، هەروەها ترۆتسکی کرایە شالیاری کاروباری دەرەوە و ستالین کرایە وەزیری کرێکاران و جوتیاران، پاشان حکومەت بەرنامەی خۆی راگەیاند کە داوای ئاشتی و دامەزراندنی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریای دەکرد.(32)

بەرنامەی حکومەت پێکهات بوو لە :

1.رێککەوتن وئاشتی بۆ سوپا و وەستانی شەڕی ئیمپریالیانە
2.کارگە بۆ کرێکار
3.زەوی بۆ جوتیار
4.ئەنجومەنی گەل شوێنی ئەنجومەن کارگەکان بگرێتەوە
5.دوورخستنەوەی بۆرژوازی
6.کارکردن بۆ بەهێزکردنی حیزبە شیوعییەکان.(33)

لە تشرینی دووەمی 1917دا روسیا دوابەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی کۆمۆنیستی پێینایە قۆناغێکی مێژوویی شێواوەوە، بە هۆی بەرپابوونی

بزووتنـەوە و شۆڕشـە نەتەوەییـەکان و زیـادبوونی توندوتیـژی ململانێـی نێـوان سوپای سپی و سوپای سوورەوە.(34) هەر لەو کاتەدا سوپای قۆزاقەکان لە سـەنگەری دژ بـە سـوپای سـووری بەلشـەفیکەکاندا دەجـەنگان، بـەڵام دواتـر دانوستانیان لەگەڵ کرا و توانرا کیرنیسکی و کراسنون دەستگیر بکرێن، ئینجا چەندین ناوچەی وەك باکۆ و سیکوف رزگار بکەن. لە کۆتـایی 1917دا توانیـان هەموو پرۆژە پیشەسازییەکان و بانك و بازرگـانی دەرەوە خۆماڵی بکـەن. (35) هاوکـات لەگـەڵ ئەمانـەدا کاتێـك ئـەم ڕژێمـە سـەرکەوت هاوپـەیمانان بوونیـان رەتکـردەوە بۆیـە ئـەوانیش بـۆ خـۆ رزگـارکردن لـەم قەیرانـە و (36) هـەروها بـۆ کەمکردنەوەی گوشاری شەڕی ناوخۆ بڕیاریانـدا رێککەوتنامـەی ئاشـتی لەگـەڵ ئـەڵمانیا و دەوڵـەتی عوسمـانی واژۆ بکـەن، ئـەوەبوو لـە 3ی ئـازاری 1918دا رێککەوتنامــەی (بریســت– لیتۆفســك )یــان مــۆرکرد، بــەپێی ئــەم کۆنتراکتــە دەستیان لـە زۆر ناوچـەی روسـیای تـزاری هـەڵگرت، بـەم پێودانگـە ئۆکرانیـا و بەشــی روســیای هۆڵەنــدایان دا بــە ئــەڵمانیا، هــەروەها هــەرێمی قــارس – ئەلکســـەندەرپوڵ ئەرمەنســـتان و بـــاتۆمی جۆرجیایـــان دا بـــە دەوڵـــەتی عوسمانی.(37) ئیتر پاش ئەوە روسیا رایگەیاند کە داننانێت بە هیچ لـەو قـەرز و گرێبەسـتانەی کـە حکومـەتی قەیسـەر کردوویـەتی، بەتایبـەت فەرەنسـا کـە قەرزێکی زۆری لای روسیا هەبوو.(38)

لەلایـەکی تریشـەوە هاوپـەیمانان ترسـێکی زۆریـان هـەبوو لـەوە کـە ئـەم رژێمە بێتە پشتیوانێکی گەورە بۆ بڵاوکردنەوەی شۆڕشی کرێکاری لـە دەوڵەتـە سـەرمایەدارەکاندا.(39 ) هـەروەها بـە هـۆی ئـەوەی لـە 8ی تشـرینی دووەمـی 1917و یــەك رۆژ دوای ســەرکەوتنی رژێمــی تــازە رایگەیانــد کــە هــەموو دیبلۆماسـیەتێکی نهێنـی رەتدەکاتـەوە و سـەرجەم بەڵگەنامـە و رێکەوتننامـە نهێنیـەکانی حکومــەتی قەیســەری پێشــوو کــە لەگــەڵ دەوڵەتــە گەورەکانــدا بەستوونی بڵاویدەکاتەوە. لەسەر ئـەم پرانسیپە لیژنەیـەکی تایبـەت دروسـتبوو بە سـەرکردایەتی (ن.گ.مـارکین) بـۆ تویژینـەوەی هـەموو بەڵگەنامە نهێنیـەکانی

روسیا بۆ ئەوەی ئامادەیان بکات بۆ بڵاوکردنەوە، ئیتر دوای شەش مانگ نزیکەی 1000 پەیماننامە و ژمارەیەکی زۆر لە بەڵگەنامە و نامەی بڵاونەکراوە لە حەوت بەرگدا بڵاوکرایەوە بە ناوی (کۆمەڵێك بەڵگەنامەی نهێنی لە ئەرشیفی وەزارەتیدەرەوەی پێشوو ).(40) لە ئازاری 1919دا لە مۆسکۆ بە ئامانجی یەکخستنی بزووتنەوەی کرێکاری و ئەنتەرناسیۆنالی سێیەم (کۆمێنترن )یان دروستکرد، ئەمەش بە ئامانجی هەڵگیرساندنی شۆڕشی شیوعیەت لە کۆمەڵێك دەوڵەتی ئەوروپیدا کە لە دواجاردا نەگەیشتە ئەنجام. (41)

تێکڕا هەموو ئەمانەش هاوپەیمانانی خانەگومان کرد بۆیە کەوتنە خۆسازدان بۆ دەستێوەردانی سەربازی بۆ ناو روسیا بۆ راستکردنەوەی پارسەنگی هێزی گشتی کە بە هۆی دابڕانی روسیا و شۆڕشی بەلشەفیکەوە تێکچوو بوو.(42) بەم شێوەیە هاوپەیمانان سیاسەتێکی دژە روسیایان گرتەبەر کە بە هەموو شێوەیەك هەوڵیاندا سۆڤیەت پەراوێز بخەن بۆیە ناچار روسیاش بەردەوام لە هەوڵی کردنەوەی ئەو دەلاقەیەدا بوون هەر ئەمەش وایلێکردن کە سازش لەسەر هەندێ بنەما و پرانسیپەکانی شۆڕش بکەن وەك ئەوەی کە خۆیان دەیانوت: "شێوەکانی حکومەتی بۆرژواکان جۆرا و جۆرن، بەڵام نێوەڕۆکیان هەریەکە و هەموو ئەوحکومەتانە لە کۆتاییدا هەر بۆرژوازی دیکتاتۆرن."(43) بەڵام خاوەنی ئەم ستراکچەرە هەر خۆی لەگەڵ دەوڵەتە دیکتاتۆرەکانی وەك ئێران و تورکیا هاوپەیمانێتی دەبەستێت، سەرباری ئەوەش سەرخستنی بزووتنەوە ناسیۆنالیستەکانی لە ئەستۆی خۆی گرت لەپێناوی ئەوەی بیانکاتە هاوسەنگەری خۆی، ئەمەش دواجار دژی بەرژەوەندی چەندان گەلی چەوساوە و چینی پرۆلیتاریا بووە. ئەمەش وا دەکات جوگرافیای سیاسی ناوچەکە بە شێوەیەك دابڕێژرێتەوە کە نەتەوەکانی کورد و ئەرمەن و چەرکەس... ژێردەستە بکرێن و خاکەکەیان وەك گۆشتی قوربانی دابەشبکرێت بەسەر نەتەوە سەردەستەکاندا و خەڵکەکەش بکەونە ژێر

**بەزەیی و دەست و مەچەکی ئاسنینی دەوڵەتانی ناوچەکە، بەم شێوەیە سەردەمی فەرمانڕەوایی لینین تا مردنی لە 1924دا بەوە جیا دەکرێتەوە کە هەوڵیداوە کێشە ناوخۆییەکان چارەسەر بکات.**(44)

***

<u>**پەراوێزەکان:**</u>

1.**یوسف گۆران : سەرچاوەی پێشوو، ل**42–43

2.عمر الديراوی :الحرب العالمية ألأولى، الطبعة الخامسة، دار العلم للملايين، بيروت، 1977، ص384

3.فراندسوا- كسافيه كوكان: الثورة الروسية، ت: جان كمير، مطبعه البولسية – جونية، 1980، ص27-28

4.ميشال سايرز و البيركان: المؤامرة الكبرى على روسيا، ت: احمد غربيه، دار الفكر الجديد، الطبعه الثانية، بيروت، 1958،ص.8

5.**فرانسوا– كسافيه كوكان: سەرچاوەی پێشوو، ص**28

6. **فرانسوا– كسافيه كوكان: سەرچاوەی پێشوو، ص**29–33

7.**ليوس ل.شنايدر: العالم في القرن العشرين،ت: سعيد عبود السامرائي، دار مكتبه الحياه، بيروت،**1908**،ص**104

8.**عمر الديراوی : سەرچاوەی پێشوو،ص**384

9.**فرانسوا كسافيه كوكان : سەرچاوەی پێشوو، ص** 30–33

10. د. عبدالوهاب الكيالی : الموسوعة السياسية، الجزء الاول، الطبع الاولى،المؤسسة العربية للدراسات والنشر، 1999، ص 888

11.**عمر الديراوی: سەرچاوەی پێشوو، ص** 384–385

12 **د. عبد الوهاب الكيالی: سەرچاوەی پێشوو، ص**888

13.**د.عبدالوهاب الكيالی: سەرچاوەی پێشوو، ص**889

14.**د.عبدالوهاب الكيالی: هەمان سەرچاوە، ص** 889–890

15.**د.عبدالوهاب الكيالی: سەرچاوەی پێشوو، ص**891

16.**عمر الديراوی: سەرچاوەی پێشوو،ص ص** 434–435

17.**عمر الديراوی: هەمان سەرچاوە،ص**435

18.**د.عبدالرهاب الكيالی :سەرچاوەی پێشوو،ص**892

19.**عمر الديراری: سەرچاوەی پێشوو،ص**435

20.**مەلابەختیار: کۆبەندی چەند بابەتێك** (1987–1993)، **چاپخانەی دانان،**1999**،ل** 316

21.مەلا بەختیار: هەمان سەرچاوە،ل319

22.لیون تروتسکی: تاریخ الثورة الروسیة،ت :أكرم دیری، الهیثم الایوبی، الجزءالاول بیروت، 1971 ص335

23.مەلا بەختیار:هەمان سەرچاوە،ل321

24.ای.اج.كار : انقلاب روسیه (1917-1929)،ل 1

25.د.عبدالوهاب الكیالی: سەرچاوەی پێشوو،ص 892

26.د.عبدالوهاب الكیالی: سەرچاوەی پێشوو،ص 892

27.عمر الدیراوی : سەرچاوەی پێشوو،ص 437

28. د.عبدالوهاب الكیالی: سەرچاوەی پێشوو،ص 892

29.مەلا بەختیار : سەرچاوەی پێشوو،لالا320-321

30.مەلا بەختیار :هەمان سەرچاوە،ل321

31.د.عبدالوهاب الكیالی: سەرچاوەی پێشوو،ص893

32.لویس ل.شنایدر :سەرچاوەی پێشوو،ص 105

33.د. عبدالعزیز سلیمان، د. عبدالمجید نعنعی: تاریخ اوربا المعاصر من الپوره الفرنسیه الی الحرب العالمیه الپانیه، دار النهچه العربیه، ص 520

34.یوسف گۆران :سەرچاوەی پێشوو، ل42

35.د.عبدالوهاب الكیالی:سەرچاوەی پێشوو،ص895

36.عمر الدیراوی :سەرچاوەی پێشوو،ص449.37

37.یوسف گۆران: سەرچاوەی پێشوو،ص45

38.د. عبدالعزیز سلیمان، د.عبدالمجید نعنعی : سەرچاوەی پێشوو،ص522

39.د.عبدالعزیز مسلمان، د.عبدالمجید نعنعی: سەرچاوەی پێشوو،ص522

40.د.كمال مظهر احمد: اضواء على قضایا دولیة في الشرق ألاوسط، دار الحریة، بغداد، 1978،ص140

41.د.عبد العزیز سلیمان، د.عبدالمجید نعنعی: سەرچاوەی پێشوو،ص523

42.یوسف گۆران: سەرچاوەی پێشوو،ل45

43. د.كەمال عەلی محەممەد :پێوەندی سۆڤیەت بەمەسەلەی كوردەوە، گۆڤاری زانكۆی، ژ1، 2000، ل69

44.د.عبد العزیز سلیمان، د.عبدالمجید نعنعی: سەرچاوەی پێشوو، ص524

دووەم: شوێنی کورد لەسیاسەتی دەرەوەی بەلشەفیکەکاندا.

چەند رۆژێك دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر و هاتنە سەرتەختی رژێمی نوێ، بەواژەی لینین بەیانێکی بۆ گەلانی خۆرهەلاَت بلاَوکردەوە، کە لە گەوهەردا نامەکە مافی ئازادی و چارەی خۆنووسینی دەدا بەگوێی ئەو گەلانەدا. (1) دوای ئەوەی لینین رۆڵی گەورەی لە دامەزراندنی ئەنتەرناسیۆناڵی سێیەمدا (کۆمێنترن )و دارِشتنی نەخشەی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی هەبوو، هەر بۆیە ئەوکات کتێبێکی دەربارەی کێشەی نەتەوە و کۆلۆنیالیزم نووسی و لە تەموزی 1920دا لە کۆمێنترندا خوێندیەوە و دوای ئەوەی گفتگۆی لەسەر کرا و لە دواجاردا جەخت لەسەر داننان بەمافی گەلاندا بەبێ جیاوازی کرایەوە.(2)

لینین دەیگوت "لەسەر سۆسیالیستەکانی نەتەوە چەوسێنەرەکان پێویستە داوای مافی ئازادی و جودابونەوەی نەتەوە بندەستەکان بکەن، دەنا بانگەشەی هاوشانی مافی میللەتان و هاریکاری کرێکاران دەبێتە هەراوهوریایەکی ساختە، دەبێتە ناپاکییەکی پەتی"(3) پاشانیش لە 1ی ئەیلولی1920دا کۆنگرەی یەکەمی گەلانی خۆرهەلاَت لە باکۆ لەژێر دروشمی (ئەی کرێکاران وگەلانی زۆرلێکراو یەکبگرن ) دەستی بەکارکرد، بەلاَم هەموو

ئەمانە لە کاتێکدا بوو کە شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە کەفوکوڵی سەرکەوتندا بوو، بۆیە پاش ماوەیەك کە ئایدۆلۆژیای ئەمانە لەگەڵ کێوی واقیعدا رووبەڕوو بویەوە ئەوا لینین بەرژەوەندی گەلی روس و سیاسەتی ئەمری واقعی هەڵبژارد.وحوکومەتی سۆڤیەت هەستی کرد کە ئایدۆلۆژیای دادی نادات، ناچار پشتی کردە گەلەچەوساوەکان و بای دایەوە بەلای حکومەتە چەوسێنەرەکانی خۆرهەلآت دا.(4) پاشان بۆ چاوبەستیش بە ناوی گەلانی خۆرهەلآتەوە پەیوەندی لەگەڵ دەبەستن، کاتێك لە ئازاری 1921دا سۆڤیەت پەیماننامەی لەگەڵ دەوڵەتەکانی وەك (ئەفغانستان، ئێران، تورکیا) گرێدا، ئەوا بە ناوی ئەوەوە دەیفرۆشتەوە کە ئەوە یەکەمجارە ولآتێکی ئەوروپی پەیمانی دۆستانە و هاوتا لەگەڵ خۆرهەلآتدا دەبەستێت.(5) دیارە ئەمەش لەسەر حسابی گەلە چەوساوەکانی ناوچەکە بووە بەتایبەتی بزووتنەوە ئازادیخوازەکانی ناوچەکە و تەنانەت دژی پارتە چەپ و کۆمۆنیستەکانی سەربەخۆشیان بووە.

لەم سۆنگەوە سەبارەت بە مافی کوردیش ئەو کات هەشت نوێنەر لە باکۆ لە 1-1920/9/8 داواکاری پێشکەش دەکەن، کە چی کۆنگرە پشتگوێی دەخات و بڕیاردەدات یارمەتی بزووتنەوەی کەمال ئەتاتورك بدات، کە بزووتنەوەیەکی شۆڤنیستانەی بۆرژواییە و ئاشکرایە ئەمەش پێچەوانەی تێزەکانی لینین خۆشیەتی.(6)سەرباری ئەوەی سۆڤییەت دان بە حکومەتی ئەنکەرەدا دەنێت لەمەش زیاتر دەڕوات و رایدەگەیەنێت کە داندەنێت بەو سنوورەدا کە لە پەیمانی نیشتمانی تورکدا هاتووە، ئینجا دەڵێت داننانێت بە هیچ پەیمانێکدا کە حکومەتی ئەنکەرە واژۆی نەکردبێت. لەم ساتەوەختەدا ئێمە لەوە تێدەگەین کە ئەو دوو بڕیارەی سۆڤییەت گورەترین راژە و خزمەت بوو بە حکومەتی کەمال و هەوادارانی لە هەمان کاتدا سەختترین لێدانی کوشندەبوو لە بزاڤی رزگاریخوازی کورد، چونکە پەیمانی نیشتمانی جەختی لەسەر ئەو سنوورە دەکردەوە کە ئاگربەستی مۆدرۆس دیاریکردبوو، بەم

پێودانگەش راستەوخۆ بەشێکی گەورەی لە کوردستان بە تورکیا دەبەخشی، لەلایەکی تریشەوە پەیمانی (سیڤر) کە باسی دەسەلاتی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد تێدابوو کە حکومەتی ئەنکەرە واژۆی نەکردبوو.(7) هەر بۆیە سۆڤیەت لەم دوو هەلوێستەیدا رووی راستەقینەی خۆی بەرامبەر کورد و بزووتنەوەکەی دەردەخات. جگە لەوەش لە ساڵی 1922دا (خالید بەگ) کە یەکێك بوو لە رابەرانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، ئەو کات یاداشتێکی داوە بە حکومەتی سۆڤییەت، کە چی سۆڤیەت لە پاداشتی وەلامی خالید بەگدا لەلایەن کۆمسیاری کاروباری دەرەوەی سۆڤییەتەوە رایگەیاندووە کە دوای هەڵسەنگاندنی بارودۆخی نێو دەوڵەتی بڕیاریانداوە دەست لە کاروباری نێوان کوردستان و تورکیا وەرنەدەن.(8) ئەحمەد تەقیش لەم بارەیەوە لە یاداشتەکانیدا دەڵێت :"لەوەلامی خالید بەگدا روسیا بەبێ هیچ پێچ وپەنایەك وتی ناتوانین ئێستا هیچتان بۆ بکەین، چونکە نامانەوێت تورکیا زویر بکەین ".(9) لەلایەکی تریشەوە شێخ مەحموود لە20ی کانونی دووەمی 1923دا نامەیەکی بۆ کونسولی سەرکەوتوو لەتەورێز نارد، کە تێیدا ئومێدێکی زۆری بە شۆڕشی ئۆکتۆبەر بە رابەری لینین دەربڕیوە و داوای کۆمەك وپشتیوانی سۆڤیەت بۆ خەباتی گەلی کورد کردووە، بەلام سۆڤیەت بەهیچ جۆرە وەلامی شێخی نەداوەتەوە.(10)

لە دەقی نامەکەدا هاتووە" دەنگی ئازادی راستەقینەی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە هەموو جیهاندا بلاو بووەوە و مرۆڤایەتی گەشایەوە بە هەواڵی رزگاربوونی میللەتەکەتان لە دەست کارگێڕێکی زۆردار و ستەمکار، کورد هیوادارە مافی رەوای نەتەوەیی بێتە دی، ئەوان لە دڵەوە دەیانەوێت لەگەڵ ئێوە بژین بە گیانێکی هاوڕێیەتی و پاکیەتییەوە لەگەڵ نەبوونی پەیوەندی دیبلۆماسی لە نێوانماندا، هەروەها ئێمە ناتوانین حکومەتی سۆڤیەت تێبگەیەنین لە هەموو پرۆژەکەمان لەم نامەیەدا و گەلی کورد باوەڕی وایە حکومەتی سۆڤیەت دەتوانێت دۆزی هەموو نەتەوە ژێردەستە و

**بەگیرهاتووەکان سەربخات و هەر دەبێت پاراستنی مافی گەلی کورد بگرێتە ئەستۆی خۆی، ئەوان ئامادەن چارەنووسی خۆیان ببەستن بەچارەنوسی حکومەتی سۆڤیەتەوە و چاوەڕوانن بەبێ ئارامگرتن پەیوەندی دۆستایەتیان لەگەڵدا ببەستین "، (11) بەلام مەخابن سۆڤیەت بچووکترین راستگۆی لەگەڵ تێزەکانی خۆی ولالێکردنەوەی ئەم نامەیەدا نەنواند.**

***

**پەراوێزەکان:**

1.**مەحمود رەزا: شۆڕشی ئۆکتۆبەر و چارەنوسی چەند گەلێکی خۆرهەلات، سیاسەتی دەولی، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، سلێمانی ژ**1997،20، **ل**113

2.**مەحمود رەزا: هەمان سەرچاوە،ل**.114

3.**د.کەمال عەلی محەممد: سەرچاوەی پێشوو،ل**70

4.**مەحمود رەزا: سەرچاوەی پێشوو، لالا** 115-116

5.**مەحمود رەزا: هەمان سەرچاوە،ل**116

6. **د. کەمال عەلی محەممەد: سەرچاوەی پێشوو،ل** 69-70

7.**تەلار عەلی ئەمین: سەرچاوەی پێشوو،لا**43

8.**مەحمود رەزا: سەرچاوەی پێشوو، لا**87

9.**مەحمود رەزا: هەمان سەرچاوە،ل**87

10. **مەحمود رەزا: سەرچاوەی پێشوو، لا**87

11. زنار سلوثي: في سبيل كردستان (مذكرات)، ت: ر.علي، رابطة كاوا للثقافة الكردية، الطبعة الأولى، بيروت،1987، ص77-78

## باسی دووەم

### یەکـــەم: فاکتـــەرەکانی زەمینـــە خۆشـــکردنی پێوەنـــدی نێـــوان کـــەمالی و بەلشەفیکەکان.

بۆچـــوونی ســـەرەتایی بەلشـــەفیکەکان دەربـــارەی رۆژهـــەڵات و کۆمەڵگاکانی ئەوە بوو کە گەلانی خۆرهەڵات وزەیەکی زۆریان تێدایە و دەکرێت بۆ مەسەلەی سۆشیالیزم و بەرپەرچدانەوەی ئیمپریالیزم سوودی لێوەربگیرێت، ئەمەش وایکرد کە دروشمی (ئەی کرێکار و گەلە چەوساوەکان یەکگرن ) بێتە بوون.(1)

بەدڵنیاییەوە ئەمبایەخدانە بە رۆژهەڵات هەڵاوێرد نەبووە لە مۆرك و مەبەستی سیاسی، ئەویش خۆی لەوەدا دەبینیەوە کە گەلانی خۆرهەڵات راکێشێت بۆ سەنگەری بەلشەفیك بۆ دەرباز کردنی خۆیان لەو گۆشەگیرییە نێودەوڵتییە کە تێیکەوتبوون.(2)

بۆ پشت راستکردنەوەی ئەو قسەیەشمان بەڵگە ئەوەیە کە ساڵێك پێش ئەوەی کۆنگرەی گەلانی خۆرهەڵات لە باکۆ ببەسترێت، لینین لە راگەیاندنێکی نارەسمیدا وتبوی ئێمە لەگەڵ بەریتانیا لەباری شەڕداین، هەر

بۆیە دواتریش کە کۆنگرەکە گرێدەدرێت بۆ ئامادەکردنی پێداویستیەکاکنی ئەو قۆناغە مێژووییەی سۆڤیەتە و بەرئەنجامەکانی کۆنگرەش دەڕژایەوە خانەی خزمەت بە ئەوان، بەمەش دەیانویست کە هەموو بزاڤە شۆڕشگێڕییەکانی ئەو سەردەمە لە هیندەوە تا میسر و تورکیا بخەنە خولگەی خۆیانەوە و هەرچەندە "ناوەڕۆکی چینایەتی بوون و مەیلی ناسیۆنالستی و بۆرژوایی بەسەریاندا زاڵە، بەڵام لە هەمان باردا بەو واقیعە سادەیەی کە دژی ئیمپریالیزمی ئەوروپایین دەتوانرێت سوودیان لێوەربگیرێت".(3)

بەم پێوەدانگەش بزووتنەوەی کەمالی لەو بزاڤە بەرایانەی رۆژهەلات بوون کەچوونە بەردەم بەلشەفیکەکان. پاشان لە رووی ئایدۆلۆژییەوە بەلشەفیکەکان بەو چاوە سەیری بزووتنەوەی کەمالییان دەکرد کە بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی دژی ئیمپریالیزمە، هەر بزووتنەوەیەکی نەتەوەییش تەنانەت ئەگەر بەرەی کۆنەپەرستییش رابەرایەتی بکات بەڵام دژی کۆلۆنیالیزم بێت ئەوە هەر پێشکەوتووخوازە.(4)

دەکرێت بڵێین بەلشەفیکەکان زۆر گوێیان نەداوەتە ئایدۆلۆژیای خۆیان دەربارەی کەمالیزم، بەڵکو سەرەتا هەر بەپێی پێداویستی سیاسی و ستراتیجیەکان و بەرژەوەندییە نێودەوڵەتیەکانی خۆی هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردووە.(5)

ئەوەی رۆڵی لە نزیکبوونەوەی هەر دوولا بینی ئەو راگەیاندنەی لینین بوو کە دەنگ و سەدایەکی باشی هەبوو لە نێو ئەو کۆڕ و کۆمەڵە ناسیۆنالە تورکیانەی کە دەیانویست دوای شکستی ولاتەکەیان بۆ تێهەڵچوونەوە بەرامبەر هاوپەیمانان راست ببنەوە، ئەمەش وایی کرد کە هەردوو ڕەوتی ناسیۆنالیستی و ئەنتەر ناسیۆنالی دژ بە ولاتانی سوێندخۆر کە ئامانجیان لەناو بردنی بەلشەڤیك و دابەشکردنی خاکی تورکیا بوون لەیەك نزیك ببنەوە.(6) پاشان سەپاندنی پەیمانی سیڤەر بەسەر تورکیا و بانگ نەکردنی سۆڤیەت بۆ کۆنگرەی ئاشتی و هەروەها وازهێنانی سۆڤیەت لە کۆمەڵێك

مـەرجی هـەرێمی تایبـەت بـە گـەرووەکانی ئەسـتەمبوڵ و پاشاکشـەکردن لـە زەوییـەکانی تورکیـا و دەسـتبەرداربوونی سـۆڤیەت لـە کۆمـەڵێك بەرژەوەنـدی خۆی کە ڕێکەوتنە نهێنییەکان سەلماندبوویان بەتایبەت ئەوکاتەی کە لینین لـە سـاڵی 1917دا ڕایگەیانـد "حکومەتەکـەیان ڕەمـزی هـەموو ڕێککەوتنـە نهێنییەکانی دەکاتەوە بەتایبەت ئەوانەی تایبـەتن بـە تورکیا".(7) بۆیـە هـەموو ئەمانە وایانکرد کە کەناڵی پەیوەندی میانی تورکیا و سۆڤیەت بەشێوەیەکی خێـرا دابڕژێتـەوە.(8)هەربۆیـە دەتـوانین بڵـێین دوو پێـوەری سیاسـی گـرنگ لـە سیاسەتی سۆڤیەتدا وەك ستراتیژ تەماشا دەکرا، ئەمـەش ڕۆڵـی کارای گێـڕا لـە نزیکبوونـــەوە و بـــەرە و پێشچـــوون و گەشەســـەندنی پەیوەنـــدییان لەگـــەڵ کەمالییەکاندا :

1.بەلشەفیکەکان هەوڵیاندا نفوزی هاوپەیمانان لـە تورکیا کەمبکەنەوە بەمـەش ناوچـەکانی باشـووری قـەفقاز و ئۆکرانیـا لـە مەترسـی ئـەوان دووربخەنـەوە کـە بەهۆی ئەوانەوە هەڵگەڕابوونەوە و یاخی ببوون.

2.گـەڕان بـەدوای هاوپـەیمانێتی لـە دەرەوەی سـنووری ڕوسـیا (9) (زارەڤانـد)ی بەڕەگـەز ئەرمـەنی پێـی وایـە هۆکـارێکی تـر ڕەنگڕێـژی کـردووە لـەوەی کـە نزیکبوونەوەی نێـوان ئـەم دوو هێـزە زووتـر فەراهـەم بێـت، ئـەویش ئـەوەبوو کـە کـەمال ئـەتاتورك خـۆی بەسـەرکردە و قارەمـانی یـەکگرتنی نەتـەوە بـە ڕەگـەز تۆرانیـەکان دەزانـی و پێشـوازی لـە نوێنـەراکانیان دەکـرد و باشـترین ئەفسـەری خـــۆی دەخســـتە خزمـــەتیان، بۆیـــە یـــەکێتی ســـۆڤیەت و یســـتویەتی بـــەم نزیکبوونەوە یە جوڵەوگیری لە مارە حەوتسەرەکەی پان تۆرانیزم بکات، چونکە لـە خەوهەسـتانی لـە نـاو دەروونـی وڵاتەکانیانـدا ئـەوا ڕژێمـی تـازەی دەخسـتە لەرزینـەوە.(10) لەلایـەکی تـرەوە ئـەوە ڕوونـە کـە کـەمال شـیوعیەکانی خـۆش نەدەویست، چونکە لە پرانسیپە نەتەوەییەکاندا دژی یـەکبوون وخـۆی لەیـەکێك لە بۆنەکاندا ئەوەی ڕەتکردبووەوە کە پەیوەندی لەگەڵ شیوعیەکانی ناو تورکیا هـــەبێت. باشـــترین بەڵگـــەش ئـــەوەبوو کـــە هەســـتا بـــە داخســـتنی ســـەرجەم

**ڕێکخراوەکانیان (11) دواتریش سکرتێرەکەیان (مستەفا سوبحی- تویێژەر) و هاوڕێکانی لەناو برد.(12) پاشان فەرمانی دا بە هاوڕێیەکی خۆی بە ناوی (حەقی بەهجەت) کە حیزبێکی کارتۆنی دروستبکەن کەچی سۆڤیەت هەر پێشوازی لەم جۆرە سیاسەتە دەکرد و شۆڕشەکەیانی بە (شۆڕشی ئازاد ) ناوزەند دەکرد.(13) فاکتەرێکی تر ئەویش پروپاگەندەی کەمال و هەوڵدانیان بۆ هەڵتەکانتندنی ئۆتۆکراتیەت و پێداگرتن لەسەر رزگاری تورکیا و دامەزراندنی کۆمار و دەستوری لائیکی (عەلمانی ) و لافلێدانی ئازادی دەوری هەبوو لە تۆخکردنەوەی پەیوەندییەکانیان، چونکە ئەو دەم سۆڤییەت لە ئاستەنگی ئابووری گەورە و سەربازی خەتەرناکدا رۆژگاری دەژمارد، بۆیە گۆڕانکاری وەها بەدرێژایی 370 میلی هاوسنووری لە رووی تاکتیکییەوە بۆ سۆڤیەتی گەمارۆدراو بایەخێکی گەورەی هەبوو.(14) دواجار چانسێکی باش بۆ کەمال هەڵکەوت کە توانی بیقۆزێتەوە و سۆڤییەت رازی بکات کە یارمەتی پێشکەش بکەن لەسەر بنچینەی بیری هاوکاری دژی ئیمپریالیزمی بێگانە.(15) مستەفا کەمال گەیشتە ئەوبڕوایەی کە بەهاوکاری بەهێزی نێوان هەر دوو لا دەتوانن "بگەن بەئامانجە خوازراو و مەبەستەکانیان ".(16)**

***

**پەراوێزەکان:**

1.**یوسف گۆران: سەرچاوەی پێشوو، ل**.50

2.**یوسف گۆران: هەمان سەرچاوە، ل**50

3.**زارەڤاند : سەرچاوەی پێشوو،لالا** 84-.85

4.**یوسف گۆران: سەرچاوەی پێشوو، ل**.51

5.**یوسف گۆران: هەمان سەرچاوە، ل**51

6.**حوسێنی مەدەنی: سەرچاوەی پێشوو، ل**226

7.**د.ابراهیم خلیل احمد، د.خلیل علی مراد: سەرچاوەی پێشوو، ص**230

8.**یوسف گۆران: سەرچاوەی پێشوو، ل**51.

9.**یوسف گۆران: هەمان پێشوو،ل**51

10.**زارەڤاند : سەرچاوەی پێشوو،ل**.98
11.د.احمــد نــوری النعیعــی: ترکیــا و حلــف الشــمال الأطلســی: المطبعــه المواطنیــة، الأردن،1981،ص319.
12.**محمود رەزا:سەرچاوەی پێشوو،ل**101.
13.**احمد نوری النعیعی:ترکیا وحلف الشمال الآگلسی، ص**53
14.**مەلا بەختیار: سەرچاوەی پێشوو،ل**.358
15.**د.احمد نوری النعیمی: ترکیا وحلف الشمال الآگلسی....،ص**.53
16.د.کمال مظهر احمد: أضواء علی قضایا.........،ص233.

**دووەم: قۆناغی بەکرداری بوونی راستەوخۆی پێوەندییەکان**

**رەنگە دەستپێکردنی راستەوخۆی پێوەندیەکان بۆ ئەو کاتە بگەڕێتەوە کە لە سەرەتای 1919دا کەمال ئەتاتورك هێشتا لە ئەستەمبوڵ بوو، هەر لەو کاتەدا لە رێگای ئاشنایەکیەوە (شوارتز) کە ئەفسەرێکی ئەڵمانی بوو پەیوەندی بە بەلشەفیکەکانەوە کرد، دوای ئەوەی بەنهێنی لەگەڵ کادێرێکی بەلشەفیك بە ناوی خوازراوی (کاتز) لە ئەستەمبوڵ کۆبووەوە ئەنجا جەلال نوری رۆژنامەنووسی بۆ مۆسکۆ نارد و لەوێ لەلایەن لینینەوە بە گەرمی پێشوازی کرا و پارەیەکی زۆری بە مەبەستی پڕوپاگەندەی کۆمۆنیستی وەرگرت، بۆیە لەوە بەدواوە مستەفا کەمال پەیوەندی بەردەوامی لەگەڵ سۆڤییەتدا درێژە پێدا، (1) بەتایبەت ئەوکاتەی بزووتنەوەی مستەفا کەمال لە قۆناغی دەستپێك و ریشەداکوتاندا بوو، حکومەتی سۆڤیەت لەو دەوڵەتانە بوو لە ئەیلوولی 1919 لە کۆنگرەی سویدا کەسەرەتای راستەقینەی بزووتنەوەکە بوو نوێنەری خۆی بەشداری پێکرد.**

**ئاقایار مەحمودۆف نمایندەی سۆڤییەت لەو کۆنگرەیەدا پشتگیری ولاتەکەی بۆ تورکیای شۆڕشگێڕ دەربڕی.(2) دیارە ئەمەش بۆ بزاڤی کەمالییەکان پاڵپشتکی ستراتیژی بوو، چونکە مستەفا کەمال بۆ بنیادنانی دەوڵەتەکەی نەیدەتوانی بەتەنها پشت بە گەلانی عوسمانی ببەستێت گەر**

پشتگیری و هاوئاهەنگی مادی ناوچەکە نەبوایە، ئەمە و جگە لەو یارمەتییە گوزارەیەی (مەعنەوی ) کە کەمال وەك نەبوایە، بەشێك لە جەنگی دەروونی بەرامبەر بە هاوپەیمانان بە کاریدەهێنا و دەیگوت: "ئێمە لەگەل روسیا دۆستین"(3) ئەمەش هاوپەیمانانی دەترساند لە لە دەستدانی بەرژەوەندیەکانیان، بەم کارەش ئەوانی تووشی جۆرێك لە سازش دەکرد لەگەڵ خۆی. لە پایزی 1919دا پەیماننامەیەکی دیکە لە نێوان مستەفا کەمال و سۆڤیەتدا مۆرکرا و لەو پێکهاتنەدا سۆڤیەت چرای سەوزی بۆ کەمالییەکان هەڵکرد کە دەوڵەتی ئەرمەنستان لەناوبەرن.(4)

هەروەها لە کاتی بەستنی کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس مستەفا کەمال برووسکەیەکی بۆ لینین لێداو تێیدا دەڵێت:"لەململانێدا دژی ئیمپریالیزم ئێمە هاورێبازی ئێوەین، گۆرەپانی تێکۆشانمان ئیمپریالیزمە و لە هەمانکاتدا سەنگەری بەرگری ئێوەیە، لەبەر ئەوە لێتان رازی دەبین بە ماڵ و چەك پشتگیریمان بکەن.(5) پاشان حکومەتی سۆڤیەت لە یاداشتێکیدا و لە 2ی حوزەیرانی1920دا کە بۆ کەمالی ناردووە دەڵێت: " حکومەتی سۆڤیەت بە گەرمی پشتگیری تێکۆشانی تورکیا لە پێناوی سەربەخۆیی و سەروەریدا دەکات، حکومەتەکەمان رۆنانی پەیوەندی دۆستایەتی لەنێوان هەر دوو لاماندا بەرز دەنرخێنێت".(6) لە ئەیلولی 1920دا سۆڤیەت بیرخەرەوەیەکی دا بە بەریتانیا و تێیدا بەم گوزارشتە دەبێژێت: " سۆڤیەت پشتگیری لەخەباتی میللەتی تورك و هەولدانی تورکیا دەکات لە هەلوەشاندنەوەی پەیمانی سیڤەردا کە سەربەخۆیی و یەکێتی خاکەکەی دەخاتە بەر مەترسیەوە، تورکیا لەو خەباتەیدا گشت خەڵکانی روسیای لە پشتە ".(7) بەم تەرزە پەیوەندیەکان لەسەر ئەم ریتمە گەشەیان کردووە و بەرەو پێش رۆیشتون بە جۆرێك زیاتر روون ئەبێتەوە لەو بروسکەیەدا کە کەمال ئەتاتورك لە 18ی کانونی یەکەمی 1920دا بۆ لینینی ناردووە و لە ناوەرۆکیدا رایگەیاندبوو ئەمە بەخۆشییەوە دەمانگەیەنێتە پێوەندییەکی قووڵی نێوان هەردوو لا و لە کۆتایی بروسکەکەدا

بـە وتـەی "مـن سوپاسـتان دەکـەم هـەتا ئـەو پـەڕی بـەهۆی ئـەو سیاسـەتە دووربینانەی کە سۆڤیەت لە رۆژهەلأت و جیهانـدا دەستپێشخەری جوامێرانەی کردووە ".(8) جارێکی تریش لە 26ی کانونی یەکەمی 1920 لینین خۆشحاڵی خـۆی دەربڕیـوە و بـەوەی کـە دەڵێـت: "بنچـینەیەکی هەمیشـەیی هەیـە بـۆ هاوڕێیەتی کە دەتوانرێ ببێتـە هـۆی یـەکگرتنی هـەر دوو گـەلی تـورك و روس ". (9)

دواجار بەم هەناسـەوە تورکیا ناردەیـەکی نەتـەوەیی بە سـەرکردایەتی (بەکرسـامی) شـالیاری دەرەوەی تورکیـا دەنێرێـت بـۆ سـۆڤیەت و لـە کۆتـایی سەردانەکەیدا پەیماننامەیەك لەگەڵ بەرپرسی کاروباری دەرەوەی روسیا لە 16 ی ئـازاری 1921 واژۆ دەکـەن، (10) کـە بەپـەیمانی هاوکـاری و برایـەتی ناسراوە.

ئـەمیش لـە دیـدگای لینینـەوە رێگایـەکی گرنگـە بـۆ دوورخسـتنەوەی تارمـایی شـەڕی بێکۆتـا تـا لـە ناوچـەکانی قـەوقاز و هۆکـاری سـەرەکییە بـۆ سەرخستنی تورکیا بەسـەر دەستێوەردانەکانی ئـەوروپا لـەو ولأتـەدا.(11) بـەم جۆرە پەیوەندییەکان سنووری وێژەیی و برووسکە لێدانیان تێپەڕاند و چوونە قۆنـاغی هاریکـاری راسـتەقینەوە لـە رووی سیاسـی و سـەربازییەوە و پانتـایی بـەکرداری بـوون و چـوونە قۆنـاغی پراکتیکبـوونی پەیوەندیـەکان لـە بەراییـدا بـەوە دەسـتی پێکـرد کـە ناوچـەی قـەوقاز و رۆژهـەلأتی تورکیـا بـۆ هـەر دوو لا گـرنگ بـوو، لەبـەر ئـەوە روسـەکان دەیانویسـت پشـتی هێـزی کۆمـاری ئەرمەنسـتان و کۆمـاری جۆرجیـا بشـکێنن، چـونکە رازی نـەبوون دەسـەلأتی روسـیا بگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو ناوچـانە، لەلایـەکی تریشـەوە کەمالیسـتەکان پێویسـتبوو ئـەو ناوچـانە بپـارێزن، چـونکە بـەوە دەیـانتوانی رێگـا لـە جیابوونەوەی کوردستان و هەم ئەرمەنستانیش بگرن، بەتایبەت ئەو کاتـەی کە پـەیمانی سـیڤەر لـە ئـارادا بـوو، بۆیـە بەرژەوەنـدی هـەر دوو لا لـەوەدا بـوو کـە سـنوورەکانی نێوانیـان بپـارێزن، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش هێزەکـانی کـەمال

بەسەرکردایەتی (کازم قەرەبەگ) و هێزەکانی روسیا و ئازەرەکان پێکەوە و هەریەکە لەلایەکەوە هەڵیانکوتایە سەر ئەرمەنستان و یەریڤانی پایتەختیان گرت، لەلایەکی تریشەوەو لە 21ی شوباتی 1921دا هێزەکانی سوپای سوور کۆماری جۆرجیایان داگیرکرد.(12) هەروەها سۆڤیەت لە سالآنی 1919-1922بایی سەد ملیۆن رۆبڵی زێڕ یارمەتی سەربازییان پێشکەشی هێزەکانی تورکیاکرد، لە ماوەی 1920-1921دا کە دژوارترین کاتی کەمالییەکان بوو ئەو کاتە سۆڤیەت 39هەزار تفەنگ و 63ملیۆن فیشەك و 54 تۆپ لەگەڵ گوللەی پێویستدا و 20هەزار دەمامکی خۆپاراستن و بڕی پێویست لە بەنزین و نەوتی دا بەهێزەکانی تورکیا، ئینجا هێزی چەکداری تورکیا بە ئازادکردنی دیلەکانی جەنگ کە لە روسیا گیرابوون و دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر ئازادکران بەهێزبوو،(13) ویڕای ئەمەش سۆڤیەت پسپۆڕێکی سەربازی نارد بۆ تورکیا کە (میخائیل فرونزەی ) سەرۆکی ئەنجومەنی شۆڕشگێڕی سەربازی و نوێنەری گەل بۆ کاروباری سەربازی و دەریایی بوو، کە لە تشرینی دووەمی 1922ەوە تاوەکو کانونی یەکەمی 1923 لە تورکیادا مایەوە، فرونزە لەپاڵ هەوڵدانی بۆ بەهێزکردنی پەیوەندییەکانی نێوانیان کاری تریشی نەخشەسازی سەربازی بوو بۆ هێزەکانی تورکیا بەخاتری ئەوەی بتوانن هێزەکانی ئینگلیز و یۆنان تارومار بکەن، (14) بەمەش پارسەنگی هێزی سیاسی و سەربازی بۆ کەمالییەکان گەڕایەوە، ئەمەش بارودۆخی هاوپەیمانانی سەخت کرد و ئیتر پەیتاپەیتا کەوتنە سازش و پاشەکشەکردن لە نەخشەکانی دوای جەنگ، سەرەنجام ئەم بارودۆخە تازەیە بە دژی چارەنووسی کورد و ئەرمەن تەواوبوو، قەدەری ئەمان وایکرد کە جارێکیتر بکەونەوە ژێر چەکمەی زۆردارەکانی وڵاتانی دەوروبەر، چونکە پەیوەندی کەمالیستەکان و سۆڤیەت بووە هۆی:

1. داگیرکردنی ئەرمینیاو رووخانی کۆماری یەکگرتوو
2. بنیاتنانەوەی هێزی سەربازی و جەنگی سوپای تورکیا
3. بەهێزبوونی کەمال و لاوازبوونی حکومەتی عوسمانی

4. واژۆکردنی  پەیمانی هاوکاری و برایەتی.

بەمــەش توانســتەکان یــەکخران بــۆ هەڵوەشــاندنەوەی  پــەیمانی ســیڤەر، چــونکە هاوپــەیمانان ترســان لــەوەی تورکیــا بەتــەواوەتی لەدەستبچــێت و بەیەکجاری بخزێتە باوەشی سۆڤێتەوە، بۆیە هەڵوێستی رەقی خۆیان گۆڕی و کەوتنە پشی پشی کردن بۆ تورکیا (15) و رایانگەیاند کە مەرجەکانی پەیمانی سیڤەر سووك دەکەن، هەروەها هەر یەکە لە وڵاتانی سوێندخۆر بەجیا خۆی دەبردە پێشەوە و پەیماننامەی لەگەڵ تورکیا مۆردەکرد، هەر وەك فەرەنسا لە20ی تشرینی یەکەمی 1921دا رێککەوتنی (فرانکلین– دیپلۆنی) لەگەڵ تورکیا مۆرکرد و ئیتالیاش پەیمانی 13ی ئازاری 1921 لەگەڵ تورکیادا گرێدا.(16) لە کۆنفراسی (پاریس)یشدا و لە 22–26ی ئازاری 1922دا ئامادەیی خۆیان دەربڕی بۆ هەڵوەشاندنەوەی گەلاَڵەنامەی دروستکردنی قەوارەیەك بۆ کورد لە تورکیا، بەلاَم کەمالییەکان بەم پاشەکشە شەرمنانە رازینەبوون، بەڵکو داوایان دەکرد پەیمانەکە لە بنەڕەتەوە دەستکاری بکرێت.(17) هەربۆیە بەریتانیاو یۆنانیش ناچاربوون ئاگربەستی مۆدانیا لە 11ی تشرینی یەکەمی 1922دا لەگەڵ تورکیا ببەستن. (18)

پاشانیش لە کۆنگرەی لۆزاندا سۆڤیەت بۆ ئەوەی هاوپەیمانان تەنگەتا و بکات و پشتی دیبلۆماسییەتی تورکیا بەهێز بکات بۆ ئەوەی ویلایەتی موسڵ بخاتە سەر خاکی تورکیا، ئەگەرچی  هەوڵەکەی لەمەدا سەری نەگرت بەلاَم هەماهەنگی سۆڤیەت ستوونێکی راگری گەورە بوو بۆ ئەوەی کەمال ئەتاتورك بگات بە سەرکەوتنی تەواوەتی (19) تا ئەوکاتەی پەیمانی لۆزان لە24ی تەموزی 1923دا مۆرکراو ئیتر پەیمانی سیڤەر هەڵوەشێنرایەوە.(20) بەم جۆرە تورکیا قاوغێکی فەرمی وەرگرت ئەویش بەیارمەتی سۆڤیەت کە لە کەناری مردن رزگاری بوو، هەروەك (جۆرج لوید) گوتەنی : "خەریکە لەسەر شانۆی ژیان ون دەبێت " ، بەلاَم ئەم هاوکارییەی سۆڤیەت بووە هۆی ئەوەی کە بە فۆرمێکی نوێتر و بەهێزترەوە بێتەوە سەرشانۆی سیاسی.

***

**پەراوێزەکان:**

1.**زارەڤاند: سەرچاوەی پێشوو،ل**80

2. **یوسف گۆران: سەرچاوەی پێشوو،ل**56

3.**تەلار عەلی ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل**43

4. **زارەڤاند: سەرچاوەی پێشوو،ل**.83

5. **یوسف گۆران :سەرچاوەی پێشوو،ل**56

6. د.احمد نوری النعیمی: ترکیا وحلف الشمال الاطلسی، ص319

7. **د. کەمال عەلی محەمەد، سەرچاوەی پێشوو،ل**83

8.**د.مڤهر احمد: أچواو علی قچایا**...**،ص**233

9.**د.کەمال عەلی محەممەد: سەرچاوەی پێشوو، ل**71

10.**د.أحمد نوری النعیمی: ترکیا حلف**...**،ص** 25

11.د.کمال مظهر أحمد: أظواء علی...،ص234

12.**یوسف گۆران: سەرچاوەی پێشوو، ل**58 -59

13. **محمود رەزا: سەرچاوەی پێشوو، ل** 102

14.**مەحمود رەزا: سەرچاوەی پێشوو، ل**103

15. **مەحمود رەزا: هەمان سەرچاوە، ل**104

16.**مەحمود رەزا: سەرچاوەی پێشوو،ل**104

17.**یوسف گۆران: سەرچاوەی پێشوو، ل**60

18.**مەحمود رەزا: سەرچاوەی پێشوو،ل**104

19.**یوسف گۆران: سەرچاوەی پێشوو، ل**61

20.**سەلام ناوخۆش: کوردستان چۆن داگیر کرا**... ، **ل**93-94

## بەشی سێیەم

## پەیوەندی هاوکارانەی کەمالی و بەلشەڤیک
## و
## جێکەوتی لەسەر دۆزی سیاسی کورد

### باسی یەکەم

**هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی سیڤەر و بەستنی پەیمانی لۆزان.**

کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی دەستپێکردنی سەردەمێکی هەستیارە لە مێژووی کورددا و لەو قۆناغەدا زۆر گۆڕانکاری گرنگ روو لە کێشەی کورد دەکەن، ئەم گۆڕانکارییانە لەسەر ئاستی دەرەوە و ناوخۆ سێ هۆکاری سەرەکی دەیانبزوێنن ئەوانەش هۆکاری رووسی و تورکی و بریتانییە (1). هەرلە سەرەتاوە شەڕی وڵاتانی هاوپەیمان دژ بە تورك و بەرنامەی ئەوان لە پارچەکردنی دەوڵەتی عوسمانیدا هێز و تەوژمێکی نوێیدا بە کورد کە لە ژێردەستەیی چەند سەد ساڵەیان هیوایەکیان بە بەردا بێتەوە، بەڵام راستیەکەی رزگاری و سەربەخۆیی کوردستان نەکەوتبووە بەرنامەی هیچ

یـەکێك لـەو دەوڵەتانـە.(2) تەنانـەت دروسـتبوونی زلهێزێکـی جیهـانی وەکـو سۆڤیەتیش کە وەك پێداویستیەکی مێـژوویی لـەو قۆناغـەدا تەماشا دەکرا، لـە ئاکـامی کودەتایەکـدا بەلشـەفیکەکان فەرمانــداری روسـیایان بەدەسـتهێنا، روودانـی ئـەم شۆڕشـە لـە دیـدگای گـەلانی چەوسـاوەوە دەبـوو ئەگـەر نەبوایـە دروسـتبکرایە(3)، چـونکە بـەپێی سیاسـەتی تـازە دامـەزراوی سـۆڤیەتی و تێزەکانی لینین دەبوایە هەموو گەلانی ژێردەستەی بێ دەوڵـەت بە مـافی رەوای خۆیان بگەن.(4)

لەلایـەکی تریشـەوە سـەرۆك (ودرۆ ویڵسـۆن) دەیویسـت رێککەوتننامـەی ئاشتی لەسەر بنچینەی ئاکارێکی بەرز دابمـەزرێنێت و زۆر بـەخێرایی چواردە پرەنسیپەکەی خۆی بۆ ئاشتی جیهان لـە مـانگی کـانوونی دووەمدا بلاوکردەوە و لـــە بەنـــدی دوازدەهەمـــدا جـــەختی لەســـەر ئـــەوە دەکـــردەوە کـــە بەشـــە تورکنشینەکانی دەوڵەتی عوسمانی دەبێت سەربەخۆیی و فەرمانڕەوایەتییـەکی تەواویان هەبێت، بەلام دەبێـت بـوار بـۆ تـەواوی ئـەو میللەتانـەش بڕەخسێنرێت کـە ئێستا لـە ژێر دەسـەلاتی عوسمانیـدان و ژیـانێکی پڕ لـە ئاسایش و بـواری گەشەسەندن بۆ گەیشتن بە سـەربەخۆییان هـەبێت.(5) لـە راسـتیدا هاوپـەیمانان و بـەرەی دژیـان هەریـەکـە و نەخشـەی تایبـەتی خۆیـان بـۆ دەوڵـەتی عوسمـانی هەبوو، جەنگی جیهانیش جەنگی ئامانجەکانیان بوو. نەخشەی ئەم زلهێزانەش لە داڕشتنی پەیمانی سایکس – بیکۆ – سازانۆف لەلایەن بەریتانیا و روسیا و فەرەنساوە دەردەکەوێت، لەپێش هەموویانەوە روسیای قەیسەری لە مێژبوو بۆ دەرفـەتێك دەگـەڕا دەسـەلاتی سیاسـی و ئـابوری خـۆی لـە دەوڵـەتی عوسمـانی بـەهێز بکـات (6)، ئـەوان هـەموو حـەزەکانیان لـە پـەیمانی سـایکس– بیکـۆ– سـازانۆف ئامـاژە پێـدابوو ئەگـەر چـی لەگـەڵ شۆڕشـی ئۆکتۆبـەر خۆیـان لـەو پەیمانـــە کشـــاندەوە و نهێنیـــەکانیان ئاشـــکراکرد (7)، بـــەلام روســـەکان بەشێوازێکی تر کاریگەری قووڵتریان لەسەر چارەنووسترین پەیمان بەجێهێشت کە بۆ یەکەم جار بوو لە یاسایەکی نێونەتەوەییدا بوونی کورد بسەلمێنێت.

پاش کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی هەر یەك لە گەلانی ژێر دەسەلآتی عوسمانی خوازیاری ئازادی بوون و هەوڵەکانیان لە چوارچێوەی پەیماننامەکانی دوای جەنگ خستەگەڕ. شەریف پاشا وەکو (سەرۆکی شاندی نوێنەرایەتی کورد ) لە کۆنفرانسی ئاشتیدا یاداشتێك ئاڕاستە دەکات و خوازیاری کوردستانێکی خودموختار دەبێت کە دیاربەکر و خەرپوت و بەدلیس و موسڵ و باژێڕی ئورفە بگرێتەوە، ئەو دووپاتی دەکاتەوە ئەوەی ئەو داوای دەکات لایەنی هەرەکەمی داخوازی کوردانە، چونکە کوردستانی یەکگرتوو دەبێت بە ئەرزڕومدا تێپەڕێ و کوردستانی ئێرانیش بگرێتەوە (8)، سەرەنجام هەوڵەکانی شەریف پاشا چەند بەندێکی لە پەیمانی سیڤەردا بۆ مەسەلەی چارەنووسی کورد بچڕاند بوو (9)، ئەودەمانە ئەستەمبوڵ لەلایەن لەشکری سوێندخۆرەکانەوە داگیرکرابوو، بوونی سەربازی چەند دەوڵەتێکی بێگانە لە ئەستەمبوڵدا وایکرد زەلیلی و بێ سەروبەری دەوڵەت بگرێتەوە. لەم کاتەدا پەیمانی سیڤەر * لەلایەن ولآتە سوێندخۆرەکانەوە بەسەر دەوڵەتی خەلافەتدا سەپێنرا.(10)

پەیمانی سیڤەر جێگایەکی دیاری لە یاسای نێودەوڵەتاندا لە سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانیدا هەیە، چونکە ولآتە سەرکەوتووەکانی جەنگ ویستیان بەگوێرەی ئەو پەیماننامەیە پاشماوەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە نێوان خۆیاندا دابەشبکەن دواجار چارەنوسی ئەو گەلانەی کە لەژێر دەسەلآتی عوسمانیەکاندا بوون دیاری بکرێت. پەیماننامەی سیڤەر لە 10ی ئابی 1920دا لەنێوان حکومەتی سوڵتان لە لایەکدا بەریتانیا، ئیتالیا، ئەرمینا، بەلجیکا، یۆنان، پۆڵۆنیا، پرتوگال، رۆمانیا، سرب، کرواتیا و چیکۆسلۆفاکیا لەلایەکی ترەوە واژۆکرا (11). دیارە لەم پەیماننامەیەدا ئەو بەندانەی کە تایبەتن بە مەسەلەی کوردەوە هەرچەندە مافی تەوای کورد نادات، بەلآم ئەوەش کە دیاریکرا بەشێك بوون لەو هەولآنەی کۆمەڵەی تەعالی کورد و کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان و ژەنەراڵ شەریف پاشا بوو، کە شەریفیان

کـرده نوێنـەر و لـە کـۆنگرەی ئاشـتیدا تـوانی داکـۆکی لەسـەر سـەربەخۆیی کوردسـتان و سەرخسـتنی کێشـەی نیشـتیمانی کـورد بکـات لەبـەردەم دەوڵەتـە هاوپەیمانەکاندا و سەرەنجام بەنـدەکانی سیڤەری لێکەوتـەوە (12)، بـەڵام لێـرە بـەدواوە هۆکـاری هـەرێمی و نێودەوڵـەتی و ناوخۆییـەکان دەبنـە لەمپـەرێکی گەورە ئەم بڕیارە چارەنووسسازەی گەلی کورد لە نێو دەبەن.

ئاشـکرایە لـە پـێش هەموویانـەوە پەیماننامەکـە کەوتـەژێر نەشـتەری سیاسـەتی پەرتکـە و زاڵبـەی سـۆڤیەتیەکانەوە و سـۆڤیەت لـەو حاڵـەدا دیـدی کوردسـتانی گـەورە و سـەربەخۆیی کـوردی بـەفیتی ئیمپریـالیزم دەزانـی، هـەر تێکۆشـانێکی جوداخوازانـەی کـوردی لـە تـورك و فـارس بـەزیان و دژی ژیـانی چینی پرۆلیتاریایی ئەوگەلانە دادەنا. (13) کەواتە ئامانجی ئۆکتۆبەر ئەوە بوو بەشێوەیەکی روون مەسـەلەی نەتەوایـەتی کـورد ببێـت بـە بەشـێك لـە مەسـەلەی ئەو وڵاتەی کە تێیدا دەژی زیاتر لـەوەی کـە هـەموو دۆزەکـەی پێکـەوەبێت.(14) سـەرباری چـەندین ناتـەواوی لـە بڕیارەکـانی پەیماننامـەی سـیڤەردا کەچـی چەندین فاکتەری هەرێمی راستبوونەوە لە شکست پێهێنانیدا، (15) بۆ نموونـە بـەرپابوونی بزووتنـەوەی چـەکدارانەی مسـتەفا کـەمال دژ بـە وڵاتـانی سـوێند خۆر، چونکە ئەم بزووتنەوەیە نـەك هـەر بەکشـانەوەی روسـیا لـە رێکەوتننامـەی سایکس – بیکۆ – سازانۆف لە 1916دا دەرفەتی دەستکەوت بەڵکو بەرنامەی روسیای لـە پارچەکردنی دەوڵـەتی عوسمانییـەوە گۆڕی بۆ پشتیوانیکردن لە یەك پارچەیی ئەودەوڵەتە و دوژمنایەتی کردنی هاوکارەکانی دوێنێ و لەهـەمان کاتیشـدا یارمەتیـدانی بزووتنـەوەی ئـەتاتورك لـە دامەزرانـدنی کیـانێکی ناسیۆلیستیدا بۆ کورد.(16) ئەو دەمانەی مستەفا کەمال لە ناوچەی ئەنادۆڵدا بزووتنەوەیـەکی بـەرپاکردبوو، کاتێـك زانـی بابیعـالی بـە پـەیمانی سـیڤەر قایـل بـووە پەیماننامەکـە دانـی نـاوە بـەمافی کـورد و سـەربەخۆیی کوردسـتاندا ( هەرچـەندە دانپیانـانێکی ناتەواویشـە) بـۆی دەرکـەوت ناتوانێـت لـە لایەکـەوە بەربەرەکانێی کورد و لە لایـەکی تریشـەوە دژایـەتی بابیعالی بکات، بۆیـە دوای

کۆنگرەی ئەرزڕوم بەهۆی زۆرزانی و فرت و فێڵەوە کەوتە کنەکردن لە سەرکردە کوردەکان و ئەندامانی کۆنگرەی ناوبراو ،(17) ئەوەی روونکردەوە بۆیان کە چاکتر وایە کێشەی کورد دوابخرێت تا هەموو وڵاتی تورکیا لە دوژمن جیادەکرێتەوە، چونکە پاککردنەوەی وڵات بە یەکێتی هەردوو رەگەزی تورك و کورد دەبێت کە خاوەنی وڵاتەکەن و گفتی پێدان کە بە ئاشکرا دان بە کورد و سەربەخۆیی کوردستاندا دەنێت بە رووبەرێکی گەورەتر لەوەی کە لە پەیمانی سیڤەردا بۆ کورد دیاریکراوە.(18)

بەم جۆرە مستەفا کەمال بزووتنەوەکەی لە کوردستانەوە دەستپێکرد و بەگژ پەیمانی سیڤەر و هێزەکانی رۆژئاوادا چوویەوە ئەو رووی لە سەرۆك عەشیرەت و پیاوە ئاینییە گەورەکانی کورد نا کە یارمەتی بدەن، لە پەیمانی نیشتمانی تورکدا بەڵێنیاندا رێز لە مافی نەژادە مسوڵمانەکانی عوسمانی بگرن و هەمیشە هەر باس لە پێوەندی مسوڵمانێتی و یەکگرتن و هاوکاری کورد و تورکیان دەکرد. (19) بەگەرمی ئیشکردنی مستەفا کەمال لە ئەنادۆڵ و بڵاوبوونەوەی ناوی و رۆژ بە رۆژ زیادبوونی دەسەڵاتی وایکرد کە حکومەتی ئەستەمبوڵ بێ هێز و بێنرخ بکات، ئەهالی و خەڵکی پەیتا پەیتا روویان لەم حکومەتە وەرگێڕا کە لە ژێر دەستێکی لاواز و سووکی هێزی سوێند خۆرەکان بوو لە ئەستەمبوڵ، (20) بەمەش شەرعییەتی خەلافەت بەرەو کاڵبوونەوە دەچوو و هەر بڕیار و پەیمانێکیش کە بەستبووی ئەرزشی نەدەما، لە لایەکی تریشەوە ناڕەزایی کورد لە ناوەڕۆکی پەیمانی سیڤەر هۆکارێکی تری لاوازی پەیمانەکە بوو و شێخ عەبدولقادری شەمزینی تەلگرافێکی بۆ پاریس نارد و تێیدا وتبووی : ( لەبەر ئەوەی کۆمیتەی کورد نوێنەرێکی لە کۆنفرانسی ئاشتیدا نەبووە، لەبەرئەوە مافی ناڕەزایی لەبەرامبەر هەر بڕیارێکدا کە دراوە و پێچەوانەی پرەنسیپی مافی میللەتان بێ و بۆ خۆی دەهێڵێتەوە، (21) شێخ عەبدولقادر و بەدرخانییەکان لە دژی هەڵوێرکردنی هەندێ ناوچەی کوردنشینی جەزیرە و ئورفە و ماردین لە سوریا و هەندێ ناوچەی دیکە، بە

تایبـەت مەلأتیـە و دەرسـیمی رۆژئـاوای فـورات لـە ناوچـەکانی خودموختـاری نارەزاییان دەردەبڕی.(22)

شەقامی کوردی ناڕازی بوون لە رێکەوتنی نێوان شـەریف پاشا و بوغـوس نۆبار پاشا و پێیان وابوو زیانی به کورد گەیاندووە ئەمەش بووە هۆی ناکۆکی لە نـاو ریزەکـانی کـورد دا، لـە دیکۆمێنتیـژمارە (fo.371-5.68)دا ئـەمین عـالی بـەدرخان تـەلگرافێکی نـاردووە بـۆ مەنـدوبی سـامی بـەریتانی لـە ئەسـتەمبولْ وداوای لێکردوە شەریف پاشا لە نوێنەرایـەتی کـورد لابـدرێت، (23) لـە لایـەکی تریشەوە تێکچونی نێوان ئەندامانی کۆمەڵەی تەعالی و جیابوونەوەی باڵی شێخ عەبـدولقادر و بـاڵی بەدرخانیـەکان وایکـرد کـە ئاسـۆی کـورد خـەریك بـوو لـە پەیمانی سیڤەرەوە هەڵبێت ئەوا ئەم دابەشبوون وناکۆکیەی ئەوان چارەنووسی کوردی تـاریککرد.(24) بـەم شـێوەیە کـورد ببـوون بـە دوسـیْ بـەرەی دژبـەیـەك و هەریەکـەیان بـەگوێرەی تێگەشـتنی خـۆی و بەرژەوەندییـەکانی دەیڕوانییـە مەسـەلەکە، کۆمـەڵێك لـە ئاغـا و سـەرکردەی خێڵـەکان وهەنـدیْ ئەفسـەری کـۆنی سوپای عوسمانی (مەبەست لە کوردەکانـە ) بـەجارێك کەوتبوونـە ژێـر گوشـاری دیماگۆژیـەتی ئەتاتورکـەوە و هـەر بـە قسـەی ئـەو بڕیـاری سـەربەخۆیی کوردسـتانیان رەتکـردەوە، تـەلگرافێکیان بـۆ ویـدرۆ ویلسـۆن نـارد و دەیـانووت ئێمـە سـەربەخۆیی کوردسـتانمان نـاویْ وخوازیـاری برایـەتی کـورد و تورکین.(25)

بـەدەر لـەناوخۆیی کـورد لاوازی پەیمانەکـەی و لێـدانی بزووتنەوەیـەکی بـەهێزی وەك کەمالییـەکان دژ بەپەیمانەکـە نـەکرابوو، چـونکە لـە هـەمان ڕۆژی راگەیانـدنی پـەیمانی سـیڤەردا هاوپـەیمانان بڕیـاری هاوبەشـی داگیرکردنـی بـاکووری کوردسـتانیاندا.(26) حـاکمی گشـتی بـەریتانیا لـە بەغـدا و (وڵسـن) لەکتێبەکەیدا "MES OPOTAMIA"و بەئاشکرا وتویـەتی : (سێر پرسی کۆکس لـە مـانگی دیسـەمبەری 1920دا کـە ماوەیـەکی کـەم بەسـەر مـۆرکردنی پـەیمانی سـیڤەردا تێپـەڕی نـەکردبوو، نەخشـەیەکی ئامـادەکرد بـۆ دواڕۆژی

عێراق و بە پێی ئەو نەخشەیەی ئەو، ماددەکانی پەیمانی سیڤەر پشتگوێ خرابوو، باشووری کوردستانی خستبووە ناو چوارچێوەی دەوڵەتی عێراق و بە بەشێك لەو حسابی کردبوو، (27) لەگەڵ بەهێزبوونی بزووتنەوەی کەمالیش رووی راستی مەسەلەکان ئاشکرابوون و دیاریکردنی ماوەش بۆ جێبەجێکردنی بەندەکانی پەیماننامەکە مەسەلەیەك بوو پەیوەندی بە رەوتی رووداوەکانەوە هەبوو، بۆ نموونە ئەو کاتانەی مستەفا کەمال لە ساڵی 1921دا توانی زەبرێکی کوشندە لە حکومەتی ئەستەمبوڵ وسوپای داگیرکەری یۆنانی لە باشووری تورکیا بدات و هێڵێکی راست و چەپ بە کۆنگرەی لەندەن لە 21 شوبات تا 14 ئازاری 1921دا بهێنێت ئیتر بە جارێك مەسەلەکە ئاڵۆز بوو و هەر یەکە لە فەرەنسا و ئیتاڵیا و یەکێتی سۆڤییەت کەرەستە و کەلوپەلی جەنگی نوێیان پێشکەش بەبزووتنەوەی کەمال کرد، (28) دەستبەجێ رەزامەندی خۆیان راگەیاند سەبارەت بەگۆڕینی ئەو بەندانەی پەیمانی سیڤەر کە باسی کوردستان دەکات، (سێر هنری یۆڵسن) سەرۆك ئەرکانی سوپای ئینگلیز لەو بارەیەوە دەنووسێت: (لەبەردەم دبلۆماسیەتی ئینگلیزدا یەك شت هەیە، ئەویش پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ مستەفا کەمالدا ببەستێت ).(29) سێر چارلس هارکنتۆنی سەرکردەی سوپای ئینگلیز لە ئەستەمبوڵ ئەڵێت: (باشترین شت بۆ ئێمەی ئینگلیز ئەوەیە کە ئەستەمبوڵ بەجێبێڵین لەگەڵ مستەفا کەمال پەیوەندی دۆستایەتی سازبکەین)، لەبەرئەوەی بەئەنجام گەیاندنی بەندەکانی پەیمانەکە لە ئەستۆی ئینگلیزدا بوو هەر بۆیە لەگەڵ هاتنە ئارای مەسەلەی موسڵ ومەترسی سۆڤیەت لەلای ئینگلیز و بۆیە دواجار سیاسەتی خۆیان (مەبەست لە بەریتانیایە)دەگۆڕن و پشت دەکەنە پەیمانەکە.(30)راوڵسن لە راپۆرتێکدا دیکۆمێنتی ژمارە (c.o.730-28) لەمایسی 1922دا تۆمارکراوە دڵێت:(گرنگترین شتێك روویدا بریتیبوو لەوەی لە 20ی/1/1929بەدواوە ئیتر بە ساڵی نەرمونیانی هەڵوێستی بەریتانیا و

ساردبوونەوەی دەژمێردرێت بۆ لایەنگرێتی پەیمانی سیڤەر و چۆن ئیتر لەوساوە کاربەدەستانی حکومەتی بەریتانیا لە کۆبوونەوەکانی لۆزاندا بەتەواوەتی مافی کورد و باسی نەتەوەی کورد پشتگوێ خراو سەرکەوتنی کورد بەسەر یۆناندا بوو بە هۆی خۆکێشانەوەی فەرەنسا و ئیتالیا بەرامبەر بە ماددەکانی سیڤەر ).(31)

مەخابن کوردەکانیش فێری کاری سیستماکی سیاسی نەبووبون بەشی هەرە زۆری روناکبیرەکان هیچ جموجوڵێکیان لە خۆیان نیشاننەدەدا و هونەرەکەیان ئەوەبوو چاوەڕوانی دەستی پڕسۆز و میهری ئینگلیز بوون، (32) لێرەدا دەتوانین بڵێین مەترسی روسیا بۆ ئینگلیزەکان هۆکارێکی گرنگی پشتلێکردنی ئینگلیز بوو لە پەیمانەکە، لەبەرئەوەی ئینگلیز ئارەزووی نەدەکرد کە داگیرگەکانی (مستعمرات) لەگەڵ روسیای تزاری یان یەکێتی سۆڤیەتدا هاوسنووربێت و هەمیشە دەبوو لە نێوانیاندا وڵاتێکی لەمپەر هەبێت کە پێش بەفراوانخوازی سۆڤیەت بگرێت و پێی خۆشنەبوو لە هیچ شوێنێك لەگەڵی دەرگیربێت، (33) بەم جۆرە هاوپەیمانان لە هەموو ئەو بەڵێنانەی کە بە کوردیان دابوو لێی پاشگەز بوونەوە و روویانکردە مستەفا کەمال وبیریان لە پەیمانێکیتر لەگەڵ ئەو کردەوە، (34) چونکە هەر لە سەرەتاوە جەنگی مستە فاکەمال دژی پەیمانی سیڤەر بووە ئەم پەیمانە ژیلەمۆیەك بوو بۆ گڕسەندنی بزووتنەوەی تورك. (35)

لەم نێوەندەشدا دەتوانین بڵێین روسیای سۆڤیەتی یارمەتیدەرێکی باشی مستەفا کەمال بوو و راستی کردووە دژی ئەو هەڵپە ئیستیعمارییەکان ژیاندییەوە ،(36) ئەمەش لە کاتێکدا بەپێی پرانسیپەکانی بیری کۆمۆنیزم هەروەك حکومەتی بەلشەفیکەکان بانگەشەیان بۆ دەکرد، دەبوو دۆستێکی پتە و سەرسەختی میللەتانی ژێردەستە و دژی بەرەی چەوسێنەران بوونایە،(37) بەڵام بەپێچەوانەوە سیاسەتی هاوکارانەی سۆڤییەت لەگەڵ رژێمە بۆرژوا وگەلێك جاریش تۆتالیتارەکان لەسەر حسێبی بزووتنەوە ئازادیخوازەکان،

(38) چـونكه يارمـــەتی ماددیانـــە و مۆرالاْنـــەی سـۆڤیەت و لـــە هەماكاتـــدا پێشكەشـكردنی چـەك وتەقەمـەنی سـەركوتنێكی گـەورەبوو بـۆ بزووتنـەوەی ئـەتاتورك لـە پاراسـتنی یـەك پارچـەیی ولاْت و دامەزرانـدنی دەوڵەتەكەیانـدا بەجۆرێك حكومەتە بۆرژوا دیكتاتۆرەكەی ئەتاتورك لەرێی میللیەوە رایگەیاند كـە:(حكومـەتی سـۆڤیەت یەكـەم دۆسـتی توركیایـە و توركـە. روسـیا دەسـتی یارمـــەتی بـۆ ئـــەنادۆڵ لەســـەردەمێكی یـــەكجار زەحمـــەت و ئاڵۆزاویـــدا درێـــژ كردووە). (39)

بـــەپێی لێكدانـــەوەكانی لیـــنین لـــەو ســـەردەمەدا ئـــەتاتورك مرۆڤێكـــی بەلشـــەڤیكە وپێشـــگیری لـــە هەڕەشـــەی ئیمپریـــالیزم دەكـــات و بۆیـــە نوێنـــەری ئـــەتاتورك لـــە كـــۆنگرەی بـــاكۆی 1920دا بـــە نوێنـــەری بـــۆرژوای نیشـــتمانی وەردەگیرێـــت، لـــە 16یئـــازاری 1920دا لەســـەر حســـابی ئامـــانجی ســـتراتیژی خەباتی رزگاریخوازی كورد و ئەرمەن و دەستی لە ئەرمەنستانی گەورە و باری ناوخۆیی توركیا هەڵگرت، دانی نا بە سنووری باكووری رۆژهەلاْتی توركیا و دەســـتبەرداری قـــارس و ئـــەردەهان بـــوو،(40) لەســـەر ئاســـتی ســـۆڤیەت دوو پـەیمانی لەگـەڵ حكومـەتی ئـەتاتورك بەست یەكـەمیان لـە 3ی كانونی دووەمـی 1920دا دووەمیان لە 16یئازاری 1921دا كە بە دەقێكـی ئاشكرا رێكـەوتنی سیڤەریان دایە دوواوە و رێگرییان كرد لـە پابەنـدی هەریەكـەیان بـە بەڵێننامـەی ئاشـــتی هاوپـــەیمانان لەگـــەڵ توركیـــا، ئـــەوان نـــە دانیـــان بەســـیڤەر ونـــە بەئەوســـنوورەدا نـــا كـــە بـــۆ كوردســـتان بـــە پێـــی ســـیڤەر جیـــاكرابووە (41)و سۆڤیەتیش بەڵێنی دابوو مستەفا كەمال  كە دان بەهیچ پەیمانێك نەبێت كە پەیوەندی بە توركەوە هەبێت و ئەگەر ئەو پەیمانە لە بڕوانامەی نیشتمانیدا نەهاتبێت و بڕیاری لەسەر نەدرابێ و دژی تورك بێت، ئەمەش مانای دان نەنان بوو بە ناوەڕۆكی ماددەكانی پەیمانی سیڤەردا. (42)

بەمجۆرە توانرا پرۆژەی نەتەوەیی كورد لەبار ببرێت و گەلاڵەی بیری سەربەخۆیی كوردستان بەیارییەكی تری دروستكراوی بەریتانیا كۆتایی پێ

بێنریٚ، (43) لەبەر ئەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە سۆڤییەت نە دراوسێیەکی باشی کورد و نە لەسەرکەرەوەیەکی بۆچوونەکانی خۆیشی بوو، نەك هەرئەوە بەلشەفیك و کەمالیستەکان مافی رەوای کورد دژ بە تورك و کەرتکردنی تورکیا دەزانی، بەڵکو لە بڕگەی هەشتی پەیماننامەی 16ی ئازاردا کە لەنێوان ئەم دوو لایەنەدا مۆرکرابوو بەم چەشنە هاتبوو:(هەردوو وڵات بانگەشەی هەر گروپێك بۆ دابڕینی بەشێك لە خاکی یەکێك لەو لاٚتانە رەتدەکەنەوە)،(44) لەبەرئەوە دەوری سۆڤیەت لە هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی سیڤەر و بەحەتمی کردنی دابەشکردنی کوردستان لای هاوپەیمانەکان بەهێزکرد.

لەدیدی سۆڤیەتەوە نیازی راستەقینەی بەریتانیا و فەرەنسا لەم پەیمانە ئەوە بوو کە بەرگری لە بلاٚوبوونەوەی شوێنەواری شۆڕشی ئۆکتۆبەر بگرن وئەوان دەیانویست دەوڵەتێکی پاشکەوتووی دەرەبەگایەتی دروستبکەن روسیای سۆسیالیستی لێکجودا بکاتەوە و ببێتە خاڵێکی ستراتیژی دژی سۆڤیەت لە نزیك کانگاکانی نەوتی قەوقازەوە، (45) بۆیە سۆڤیەت لە پەیمانی (هاوڕێیەتی وبرایەتی )دا یەکەم دەوڵەتی مەزن بوو لە ناوچەکەدا کە بە رەسمی حکومەتی ئەنکەرەی ناساند، (46) تەنانەت سۆڤیەت بیرخەرەوەیەك دەدات بە بەریتانیا لە ئەیلولی 1921داو دەڵێت: "سۆڤیەت پشتگیری لە خەباتی میللەتی تورك و هەوڵدانی تورکیا دەکات لە هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی سیڤەردا کە سەربەخۆیی و یەکێتی خاکەکەی دەخاتە بەر مەترسییەوە، تورکیا لەو خەباتەیدا گشت خەڵکانی روسیای لە پشتە. (47)" بەمجۆرە سەرکەوتنی بزاڤی کەمالییەکان وایکرد کە هاوپەیمانان رێکەوتنێکی نویٚ لەگەڵ تورکیادا واژۆ بکەن پەیمانی سیڤەریش هەڵوەشێننەوە. (48) ئەم ڕێکەتنەش دەستی پێکرد بە ئاڵوگۆڕی چەند یادداشتێك لە نێوان وەزیری دەرەوەی بەریتانیا (لۆرد کیرزن ) و وەزیری دەرەوەی تورکیا (ئیسمەت ئینۆنۆ)، بەلاٚم لەسەر ویلایەتی موسڵ پێکنەهاتن بۆیە بڕیاری بەستنی کۆنگرەی لۆزان *درا.(49)

بەلاًم لەسەر چارەنووسی ویلایەتی موسڵ هیچ لایەکیان بەئەنجام نەگەیشتن بۆیە لۆرد کیزن داوایکرد کە کێشەکە بچێتە پێش ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان بۆ ئەوەی لە 25ی کانونی دووەمی 1923دا یەك لایی ببێتەوە، بەلاًم ڕۆژی چواری شوبات عیسمەت ئینۆنۆ یاداشتێکی دایە هەر یەك لە نوێنەرانی بەریتانیا و فرنسا و ئیتالیا و تیایدا داوایکرد کە کێشەی ویلایەتی موسڵ لە کۆنفرانسدا گفتوگۆی لەسەر نەکرێت و لۆردکیرزنیش لەم ڕووەوە ڕەزامەندی خۆی نیشاندا، بەمجۆرە پەیمانی لۆزان لە 24ی تەممووزی 1923دا بەبێ داخوازییەکانی کورد واژۆ کرا.(50)

***

<u>پەراوێزەکان:</u>

1.سەردار محەممەد: لعبە ألأمم فی کردستان (1918-1925)، پەیڤین العربی،عدد 7، 2001،ص23

2.د.کەمال عەلی محەممەد: سەرچاوەی پێشوو، ل67

3.هیوا ئەمین: دۆزی کورد لەنێوان بەرداشی مارکسیەت و دیمکوراسیەتدا، هەولێر،1998، ل3

4.د.کەمال عەلی محەممەد: سەرچاوەی پێشوو، ل68

5. دیڤید ماکداوڵ: مێژووی هاوچەرخی کورد، و: ئەبوبەکر خۆشناو، بەرگی یەکەم، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، 2002، ل246

6.م.ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو، ل528

7. م.ڕەسوڵ هاوار: هەمان سەرچاوە، ل529

*پەیمانی سیڤەر : لە 1920/8/10 لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و وڵاتانی هاوپەیمانانـدا مۆرکرا. لە پێش مۆرکردنیدا لە ڕۆژی 1920/4/13 دا دەقەکەی وەك پێشنیارێکی تایبەتی حکومەتی بەریتانیا بووە، دوایی کراوە بە بڕیاری کۆنگرە و لەم پەیمانەدا سێ بەندی (62-63-64) تایبەت بە کورد بوون. بەندی (62) لیژنەیەك لە ئەستەمبوڵ پێکدێت لە سێ ئەندام کە بریتین لە نوێنەرانی بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتالیا بۆ ئەوەی لەدوای بەجێهێنانی ئەم پەیمانە بەشەش مانگ پرۆژەی خودموختارییەکی ناوچەیی ئامادە بکات بۆ ئەو ناوچانەی کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی فورات و باشووری ڕۆژئاوای سنوورێك کە لەدوایدا دەکێشرێ بۆ

ئەرمەنستان و باکووری سنووریْك لە تورکیا و سوریا و میسۆپۆتامیا جیادەکاتەوە کە نەژادی کورد تێیدا زۆرینە بن. بەپێی ڕێنماییەك کە لە بەندەکانی (2,3-11-21)دا باسکراوە، ئەگەر لەسەر باسێك پێکهاتن سەری نەگرت ئەندامانی کۆمیسیۆن ئەبێت هەر یەکەیان دەنگ لە حکومەتی خۆی بگێڕێتەوە و ئەم جۆرە پێکهاتنە پێویستە ڕێبدات بەدەرخستنی ئەوەی کە کەمایەتییە نەتەوەیی و مەزهەبییەکانی نەستوریەکان و ئەوانیتر کە لەم هەرێمەدا ئەژین و بەتەواوی دڵنیابن کە لەژێر باڵی ئەمنی و پارێزگاریدا ئەبن، بۆ ئەم مەبەستە کۆمیسیۆنێك لە ئەندامانی (بەریتانیا، فەرەنسا، ئیتالیا، ئێران وکورد) ئەگەڕێت بۆ پشکنین و بڕیاردانی راستکردنەوە ئەگەر پێویست بوو بکرێت لەو سنوورانەدا کە بەپێی ئەم پەیمانە بۆ تورکیا دانراوە و ئەلکێت بەسنووری ئێرانەوە. بەندی( 63) حکومەتی عوسمانی گفت ئەدات کە لە مێژووی ڕاسپێری و پێڕاگەیاندنی بە تورکیا تاماوەی سێ مانگ بەڵێنی بەجێهێنانی ئەم پەیمانە لەو هەرێمانەی کە لەبەندی (62)دا دانراوە نەتەوەی کورد داوای لە کۆمەڵەی گەلان کرد و تێیگەیاند کە بەشی زۆری دانیشتووە کوردەکانی ئەم هەرێمە ئەیانەوێت لە تورکیا جیاببنەوە و سەربەخۆ بن لە خاکێکدا کە کۆمەڵەی گەلان لەو باوەڕەدا بێت کە کوردەکان شیاوی ئەوەن سەربەخۆییان بدرێتێ، تورکیا هەر لە ئێستاوە بەڵێن ئەدات کە دان بە سەربەخۆیی نەتەوەی کورد و هەموو مافێکی کە بەسەر ئەم هەرێمانەوە هەیەتی بنێت. بڕوانە:(م.ڕەسوڵ هاوار : کورد و باکوری کوردستان لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانییەوە هەتا دوای شۆڕشی شێخ سەعید لە پیران، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی خاك، سلێمانی،2002، ل108–109–110.

8.کریس کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدە و بیستدا، و: حەمە کەریم عارف، چاپی یەکەم، چاپخانە و ئۆفسێتی شڤان، سلێمانی، 2003،ل.27

9.سەلام ناوخۆش :کوردستان چۆن داگیر کرا، ل79.

10.ڕەفیق حیلمی: کوردستانی عێراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحمود (پاداشت)، بەشی یەکەم، چاپخانەی محەممەدی سەقزی، ل10

11.د.مارف عومەر گوڵ: سەرچاوەی پێشوو،ل28

12.د.بلەج شێرکۆ: کێشەی مێژینەو ئێستای کورد، و: محەممەد حەمە باقی، چاپی سێهەم، کوردستانی عێراق،1991، ل67–68

13.هیوا ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل14

14.ئازاد مستەفا: نەتەوە و نەتەوایەتی، چاپی دووەم، چاپخانەی شەهید ئازاد، 1992،ل 48

15.**هیوا ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل**16
16.**د.کەمال عەلی محەممەد : سەرچاوەی پێشوو، ل**68
17.**د.بلەج شێرکۆ: سەرچاوەی پێشوو، ل**69
18.**د.بلەج شێرکۆ: سەرچاوەی پێشوو، ل**70
19**د.عیسمەت شەریف وانلی: لێنۆڕینێکی مەسەلەی نەتەوایەتی کوردستانی تورکیا بەزەمینەی مێژووییەوە، و:شێرکۆ هەژار، رۆما، ئابی** 1971**، ل**29
19. **رەفیق حیلمی: سەرچاوەی پێشوو،ل**14
20.**دیڤید ماکداول: سەرچاوەی پێشوو،ل** 286
21.**دیڤید ماکداول: هەمان سەرچاوە، ل** 286
22.**م. رەسوڵ هاوار: لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی تاشۆڕشەکەی شێخ سەعید..،ل** 121
23.**م.رەسوڵ هاوار :هەمان سەرچاوە، ل** 119
24.**جەمال نەبەز: دۆزی ناسیۆنالی کورد، سوید،**1985**،ل** 49
25.**هیوا ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل** 30
26.**م.رەسوڵ هاوار : لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی تاشۆڕشەکەی شێخ سەعید..، ل** 116
27.**سەلام خۆشناو: سەرچاوەی پێشوو ل**81
28.**سەلام خۆشناو: سەرچاوەی پێشوو ل**82
29.**عەبدولعەزیز یامولکی: کوردستان وراپەڕینەکانی کورد، و :شێرزاد کەریم، چاپەی یەکەم، چاپخانەی دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم،سلێمانی** 1999**،ل**70
30.**م.رەسوڵ هاوار: لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی تاشۆڕشەکەی شێخ سەعید..، ل** 142
31.**حوسێنی مەدەنی: سەرچاوەی پێشوو،ل**242
32.**حوسێنی مەدەنی: سەرچاوەی پێشوو،ل**248
33.د. بلةج شێركوة:القضيةالكورديةماضي الكوردوحاضرهم، ت :جمعية خويبون الكوردية الوطنية،الطعبة الاولى،رابطة كاوه،بيروت،1986،ص89-90
34.د. فؤادحمة خورشيد :القضية الكوردية في المؤتمرات الدولية، الطبعةالاولى،موسسةموكريان للطابعة والنشر،اربيل،2001،ص 69
35. **د.فۆاد حمە خورشید: هەمان سەرچاوە ص**74
36.**د.کەمال عەلی محەممەد : سەرچاوەی پێشوو،ل**69
37.**د.کەمال عەلی محەممەد :هەمانسەرچاوە،ل** 69
38.**د.کەمال عەلی محەممەد :سەرچاوەی پێشوو،ل**69
39.**حیکمەت محەمەد کەریم : شۆڕشی نەگۆڕو جیهانی گۆڕاو،** 1990**،ل**38

40.د. فؤاد حمة خورشيد:القضية الكوردية..، ص74

41.م..رەسوڵ هاوار :... لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی تاشۆڕشەکەی شێخ سەعید لە پیران ل 149

42. د. فؤاد حمه خورشيد :القضية الكوردية..، ص75

43. د.کەمال عەلی محەممەد :سەرچاوەی پێشوو،ل71

44.د.عەبدولڕەحمان قاسملو: کوردستان وکورد، و:عەبدوڵڵا حەسەن زادە،بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم،ل 55

*پەیمانی لۆزان :لە 1923/7/24 لە نێوان تورکیای کەمالی و وڵاتە هاوپەیمانەکاندا مۆرکرا لە پەیمانەکەدا سێ ماددەی (37–38–39) دا تاڕادەیەك ئاهێکی بۆ کورد تێدا بوو." شۆڕشەکەی شێخ سەعید لە پیران... ،ل239 "، بەڵام لە راستیدا نەك ئەو بەندانە جێبەجێ نەکران بەڵکو جگە لە نەتەوەی تورك هەموو نەتەوەکانی تر شوناسی نەتەوەییان دەسڕایەوە و جینۆساید دەکران.

ماددەی37: تورکیا بەڵێن ئەدات هیچ بڕیار و یاسایەك دەرنەکات پێچەوانەی ناوەڕۆکی ماددەکانی ئەم پەیمانە.

ماددەی 38: حکومەتی تورکیا بەڵێن دەدات هەموو دانیشتوان سەربەستییەکی تەواویان دەبێت لە رووی نەتەوایەتی و زمان و رەگەز و ئاینیانەوە.

ماددەی 39: هیچ فشار و بەرهەڵستییەك ناخرێتە بەر هیچ هاوڵاتییەکی تورکیا رێگای لێناگیرێ لە بەکارهێنانی هەر زمانێك کە بیەوێ بەکاری بهێنێ لە کاروباری خۆیدا وەکو بازرگانی و راگەیاندن و نووسین و بلاوکردنەوەی چاپەمەنی لە شوێنە گشتییەکاندا بڕوانە (م. رەسوڵ هاوار :... لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی تا شۆڕشەکەی شێخ سەعید لە پیران، ل 239) بەڵام لە راستیدا نەك ئەو بەندانە جێبەجێ نەکران بەڵکو جگە لە نەتەوەی تورك هەموو نەتەوەکانی تر شوناسی نەتەوەییان دەسڕایەوە و جینۆساید دەکران.

45. د.کەمال عەلی محەممەد : سەرچاوەی پێشوو،ل71

46. د. فۆاد حمە خورشید : القچیە الکوردیە..، ص95.

47.د. فۆاد حمە خورشید : هەمان سەرچاوە،ص.97

48.د. فۆاد حمە خورشید، جەزا تۆفیق تالیب: سەرچاوەی پێشوو،ل20.

## باسی دووەم

**دەرئەنجامی پەیمانی لۆزان و لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراقەوە.**

**هاوکات لەگەڵ هۆکارە نێودەوڵەتی و ناوخۆییەکاندا لە هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی سیڤەردا هەمان هۆکاریش لە بەستنی پەیمانی لۆزاندا رۆڵیان بینی، لەم نێوەندەدا سۆڤیەت رۆڵێکی بەرچاوی لەم پەیمانەدا گێڕا.**

**لە دیدگای سۆڤیەتەوە ئەو پەیماننامەیە بریتی بووە لە پەیمانێکی ئاشتیخوازانە و لە هەمانکاتدا رووداوێکی یەکجار گرنگە، کە پێ لەسەر سەربەخۆیی حکومەتی بۆرژوازیانەی نوێی تورکیا دادەگرێ و بەڕەسمی دەیناسێت، (1) بەم جۆرە دەبینین قۆناغەکانی بەستنی پەیمانی لۆزان زۆر ململانێی بەخۆوە بینی، کە سەرئەنجام بە پاراستنی سنووری تورکیا و لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراقی عەرەبییەوە کۆتایی هات.**

**لە دەرئەنجامدا زۆر فاکتەر دەوریان هەبوو کە رەوتی رووداوەکان بەم جۆرە بڕوات و هەریەکەیان هێزێکی نێودەوڵەتی لە پشتەوە بوو، زۆربەی کێشەکانیش بەشێکبوون لەململانێی پەترۆڵ (نەوت). زلهێزەکان سەرکەوتنیان لە بردنەوەی شوێنە پەترۆڵدارەکاندا دەدۆزییەوە، ستالین گوتەنی: "کێ زۆرترین پەترۆڵی هەبێت ئەوە چارەنووسی جەنگی ئاییندە دیاریدەکات ".(2)**

دواجار دەكرێ بڵێین بایەخی كوردستان كرۆكی زۆربەی ململانێ گرنگەكان بوو لە رۆژهەڵاتی ناڤین، هەر كێبەركێیەك لە ئارادا بوایە بە شێوەیەك لە شێوەكان كوردستانی دەگرتەوە، لەم سەروبەندەشدا ستراتیژی بەریتانیا بۆ باشووری كوردستان (ویلایەتی موسڵ)یەكلایی بووەوە و لۆردكیرزن 8یشوباتی 1920دا بە راشكاوی گوتی:"ئنگلیزەكان دوای ئەوەی پەترۆڵی باشووری كوردستان (ویلایەتی موسڵ)یان بەدەستهێنا، ئامادەن دانیشتوانەكەی لە دەستدرێژی دەرەكی بپارێزن. " هەروەها لوید جۆرج لە یەكێك لە دانیشتنەكانی ئەنجوومەنی گشتی بەریتانیادا گوتی :" حكومەتەكەی هەرگیز واز لە كوردستانی باشوور ناهێنێ، ئەگەر بەریتانیا واز بهێنێ ئەوا دەوڵەتێكی تر جێگای دەگرێتەوە، " (3) لەم پێناوەشدا سۆڤیەت لە هەوڵدابوو تاوەكو ئینگلیز گرەوی ویلایەتی موسڵ نەباتەوە، بەڵكو سەر بە توركیا بێت.

لەم پێناوەشدا سۆڤیەت دژی هەموو هەوڵێكی ئینگلیز بوو بۆ بە لاداخستنی كێشەكە بە قازانجی خۆی. بۆ نموونە لەگەڵ تەوژمی راپەرینی كوردەكانی توركیا دژی سیاسەتی كەمالییەكان، سۆڤیەت نەك هەر بە گوفتار بەڵكو بە كرداری سەربازی پاڵپشتی توركیایان كرد لەو شەڕەدا. لەمەش زیاتر میدیاكانی سۆڤیەت ئەو شۆڕشەیان بە بزاڤێكی عەشیرەتگەری و كۆنەپەرستی ناوزەد دەكرد. هەر لەو روانگەوە هەندێ رۆژهەڵاتناسی سۆڤیەت و توركی ئەو شۆڕشەیان بە جووڵانەوەیەكی ئینگلیز لە قەڵەم دەدا و لە تێڕوانینی ئەوانەوە ئەو شۆڕشە دوو مەبەستی بنچینەیی هەبووە كە گرینگترینیان لاسەنگ كردنی هەڵوێستی ئینگلیز بووە لەو خەباتە سیاسییانەدا كە لەگەڵ توركەكان دەیانكرد لەسەر ویلایەتی موسڵ. (4) پێش ئەم جووڵانەوەیەش سۆڤیەت لەگەڵ هیچ جووڵانەوەیەكی كوردی نەبووە بۆ سەربەخۆیی، تەنانەت ئەگەر دژی بەریتانیاش بووبێت. باشترین نموونەش ئەو نامانەن كە شێخ مەحمود بۆ یەكێتی سۆڤیەتی دەنارد لە كانوونی دووەمی 1923 داوای پشتیوانی و

یارمەتی و پەیوەندی نێوان گەلی کورد و روسی دەکرد، بەلاَم سۆڤیەت لەو پێناوەدا هیچ هەلَویستێکی نەبوو. (5)

کەواتە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە مۆرکردنی پەیمانی لۆزان نەك هەر بووەتە هۆی داننانی دەولَەتان بە تورکیای کەمالیدا، بەلَکو بوو بە مایەی هاوکاری هەرێمی و ستراتیژی نێوان ئەو دەولَەتانەش کە کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە بۆ مەبەستی یەك سیاسەت بۆ سەرکوت کردنی گەلی کورد و جوولاَنەوە سەربەخۆخوازییەکەیی، (6) ئەمەش لەو هەولاَنەدا زیاتر دەردەکەوێ کە قۆناغەکانی لۆزانی پێدا گوزەر دەکات.

پاش شکستهێنانی دانیشتنەکانی نێوان بەریتانیا و تورکیا، کێشەکەیان بەرزکردەوە بۆ کۆمەلَەی گەلان ئەوانیش لیژنەیەکیان پێکهێنا لە 1924 بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر کێشەکە سەرئەنجام پاش راپرسییەك گەیشتنە ئەو ئاکامەی کە کورد نە عەرەب نە فارس ونە تورکە و بەلَکو جیاوازن، بەلاَم دەرئەنجامی فشاری بەریتانیا لەسەر کۆمەلَەی نەتەوەکان باشووری کوردستان لکێنرا بە عێراقەوە، (7) چونکە عێراقی ژێردەستی بەریتانیا لە رووی سیاسی و سەربازی و ئابوورییەوە بەبێ ویلایەتی موسلْ نەیدەتوانی بژی.

بەم جۆرە سووربوونی بەریتانیا لەسەر ناوبژیوانیکردنی نێوانیان لە لایەن کۆمەلَەی گەلانەوە کە تورکیا دژی ئەم ناوبژیە بوو، چونکە بە دەستکەلای بەریتانیای دەزانی. سەرئەنجام ویستی بەریتانیا سەرکەوت و تورکیا و بەریتانیا لە 5ی حوزەیرانی 1926 بە مۆرکردنی پەیمانێکی دوولایەنە بڕیارەکەی کۆمەلَەی گەلانیان قبولْکرد و بە رەسمی ویلایەتی موسلْ خرایە سەر عێراق.(8) ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە بیلێین سووربوونی بەریتانیا لەم هەولَەیدا هەلاَوێرد ناکرێت لە مەترسی دەولَەتە گەورەکانی تر لەسەر ناوچەکە، چونکە ئەو ئاژاوە و ناکۆکیانە ئەوە دەردەخەن کەوا دۆزی باشووری کوردستان مەسەلەیەکی سەخت و ئالۆز بوو و پلان و دەستێوەردانی زۆری لە دواوە بووە،

بـه پلـەی یەكـەم لـە نێـوان ئینگلیـز و فەرەنسـییەكان، دواتـر ئینگلیـز و ئەمەریكییـەكان بەشێوەیەكی ناڕاستـەوخۆش پەیوەنـدی بـە سۆڤیەتەوە هـەبوو كـە بـە هـەموو جۆرێك پشتگیری توركـەكانیان دەكـرد بۆ گەڕانـەوەی باشووری كوردسـتان، (9) چـونكە سـۆڤیەت پێـی وابـوو هەوڵـەكانی بـەریتانیا لـە پێنـاو لكاندنەوەی ویلایەتی موسڵ بە عیراقەوە جۆرێكە لـە ڕێگری و لەمپـەردانان لـە بـەردەم بڵاوبوونـەوەی شـوێنەواری شۆڕشـی ئۆكتۆبـەر، (10) چـونكە بـەردەوام بەرپرسـانی بـەریتانیا لـە رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت راپۆرتیـان نووسـیوە لەسـەر مەترسییەكانی لەدەستچوونی ویلایـەتی موسڵ لەسـەر بەرژەوەنـدی بەریتانیا، ئەگەر بكەوێتە بندەستی دەسەڵاتی توركیا. دەزگاكـانی هـەواڵگری بـەریتانیا لـە رۆژهـەڵاتی توركیـا و باكوری عێـراق سـیناریۆی ترسـناكیان سـازداوە و هەنـدێ جـار زانیـاری و لێكدانـەوەی نادروسـتییان رادەگەیانـد لەسـەر مەترسـی پلانـی كۆمەنیستەكان ئەگـەر ئێـران و عێـراق و توركیـا پەیوەنـدییان هـەبێ بـە یـەكێتی سۆڤیەتەوە. (11) بۆیە پێم وایە دابەشكردنی كوردسـتان بـەمجۆرە دواپێشـنیاز و هەڵبـژاردنی باشـترین تێـز بـووە بـۆ پاراسـتن و مسـۆگەركردنی بەرژەوەنـدی بەریتانیا.

بێگومـان ئەمـەش بەشێك بـووە لـە رەواندنـەوەی تـەمی ئـەو ترسـەی كـە بەردەوام لە سۆڤیەت هـەیبووە، چونكە لـە یاریگـای سیاسـی ئـەوكات سـۆڤیەت كاراكتەرێكی چالاك بووە و هەمیشە لـە باشترین حاڵەتدا ئەگـەری ئـەوە هـەبووە كـە مەترسـی گـەورە لەسـەر بەرژەوەنـدی بـەریتانیا لـە ناوچـەكە دروسـتبكات و گۆڕانكـاری ترسـناك لـە باڵانسـی هێـزە سیاسـییەكان بەرجەسـتەكات. ئەمـەش ئەوە روونـدەكاتەوە كە قەدەری دابەشـكردنی كوردسـتان بـەم سـتایلەی ئێسـتای بەرپرسـیارێتییەكی مێـژوویی دەخاتـە ئەسـتۆی سـۆڤیەتەوە كـە هیچـی كـەمتر نـەبێت لـە توركیـا و بـەریتانیا كـە دوو وێنـەی بەرجەسـتەكراوی ئـەو واقیعـە و فەراهمهێنەری ئەم ژینگە ناسازەن بۆ كورد.

***

**پەراوێزەکان:**

1. د.کەمال عەلی محەممەد: سەرچاوەی پێشوو، ل72
2. کامەران ئەحمەد محەممەد ئەمین: کوردستان لە نێوان ململانێی و ناوچەییدا (1890-1932)، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، 2000، ل164
3.کامەران ئەحمەد محەممەد: سەرچاوەی پێشوو، ل177
4.د.کەمال مەزهەر ئەحمەد: چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی..، ل67
5.سەردار محەممەد : سەرچاوەی پێشوو،ص32
6. د. فوئاد حەمە خورشید: جەزا تۆفیق تالیب - سەرچاوەی پێشوو،ل23
7.www.imk-news.org/kurdstan
8. دیڤید ماکداوڵ: سەرچاوەی پێشوو، ل306
9.د.خلیل ابراهیم وأخرون: سەرچاوەی پێشوو، ص230
10.د.عەبدولڕەحمان قاسملو: سەرچاوەی پێشوو، ل55
11.د.عوسمان عەلی: هۆکاری کوردی لەکێشەی ویلایەتی موسڵدا،و:کامەران بابان زادە، گۆڤاری بوار، ژمارە"2"،سلێمانی،2000، ل154

## دەرئەنجام

لە مێژووی هاوچەرخی کورددا بۆ یەکەمجار چارەسەری بەشێك لە کێشەکەی لە چوارچێوەی پەیمانێکی نێودەوڵەتیدا کرا و دۆزی کورد دانپیانانێکی فەرمی بە دەستهێنا، بەلاّم بەهۆی گۆڕانی بالانسی هێزی نێودەوڵەتی و پێکدادانی بەرژەوەندی زلهێزەکانی ئەو کاتەی جیهان و پێکنەهاتنەوەی لەگەڵ چارەنووسی کورددا، وایکرد کە ناوهێنانی لەو پەیمانە رەسمییەدا بە هەڵپەسێراوی بمێنێتەوە و بە پەیمانێکی دیکە شەرعییەتی مافی خودموختاری لێبسەنرێتەوە.

ئەو کاتەی ئەوانەی کە خاوەن ویست و قەدەری سیاسی بوون لەسەر ئاستی جیهاندا بەتایبەت (بەریتانیا، فەرەنسا، ئیتالیا) نەخشەو پلانی خۆیان سەبارەت بە ناوچەکە داڕشت.

کوردیش ئەوکات دەروازەیەکی بە روودا کرایەوە وخەریکبوو بەشێك لە مافە زەوتکراوەکانی وەربگرێتەوە، بەلاّم بە هۆی روودانی شۆڕشی بەلشەفیك و هەوڵەکانی لینین لەسەرخستنی مافی کەمالیدا، وایکرد کە جەمسەرێکی تر دژ بە بەرەی هاوپەیمانان بێتەکایەوە، ئەمەش ئەجێندای وڵاتانی سوێندخۆری گۆڕی سەبارەت بە کورد و دۆزەکەی، بە سانایی کەوتنە پێچرکە و سازشکردن لەو بەڵێنانەی کە بەگەلانی ژێر دەستی دەوڵەتی

عوسمانییان دابوو. نەخشەی خۆیان کە دابەشکردنی خاکی عوسمانی بوو دەستییان لێهەڵگرت لە ترسی ئەوەی نەوەك تورکیای تازە بە سەرکردایەتی کەمال ئەتاتورك بخزێتە باوەشی سۆڤیەتەوە و نفوز و هەواداریی سۆڤیەت ناوچەکە کۆنترۆڵ بکەن.

ئەم هەڵوێستەی هاوپەیمانان شتێکی چاوەڕوانکراو بوو چونکە ئەوان دۆستی ستراتیژی میللەتی کورد نەبوون، بەڵکو عەودالّی بەرژەوەندی ستراتیژی خۆیان بوون و لە هەر کوێوە با هاتبێت لە وێوە شەنیان کردووە، ئیتر چ باکیان بێت کە ئەمە چەندەها گەل و نەتەوەی بێ پەناو پاسار دەکاتە سووتماك و قوربانی، گرنگ ئەوە بوو کە چیاوکەکانی (امتیازە)کانی خۆیان لە ناوچەکەدا مسۆگەر بکەن.

هاوکات لەگەڵ ئەمەدا کوردیش کەمتەرخەم بووە لە ئاست هەندێ لێپرسراوێتی مێژووییدا، چونکە بە ئاسانی کەوتوونەتە ژێر گوتاری ئەم و ئەو، هەروەها ناتەبایی و نەبوونی سەنگێکی تۆکمە و بەهێز لە سەراپای توانستە نیشتمانییەکانی کۆبکردایەتەوە، هەروەها نەبوونی سەرکردایەتییەکی یەکگرتوو بەرچاو روون کە خاوەنی پلان و تاکتیك و ستراتیژ و ئامانجی داڕێژرا و بێت. بەڵکو بە هۆی دواکەوتوویی واقیعی کۆمەلأیەتی و دابەشبوونی تواناکان بەسەر چەند بەرەیەکی دژ بەیەکدا وایکرد کە نەك نەتوانن دیفاکتۆ و واقیعێك کە هەموو لایەك ناچار بن مامەڵە و حیسابی بۆ بکەن. بۆیە بە داخەوە جوگرافیای سیاسی ناوچەکە بەشێوەیەك دەکێشرێتەوە کە سەربەخۆیی کوردستان لەبەر چاو نەگیرێت، بەڵکو وەك گۆشتی قوربانی بەسەرگەلانی ناوچەکەدا بەخشرایەوە و کورد خۆیشی بە کۆتکراوی خرایە زیندانەوە و تاکە سوودمەندیش لەم نەخشەسازیەی کەمال ئەتاتورك و عەرەبی عێراق بوون.

***

## لیستی سەرچاوەکان

### یەکەم: لیستی سەرچاوە کوردییەکان


1.ئازاد مستەفا: نەتەوە و نەتەوایەتی، چاپی دووەم،چاپخانەی شەهید ئازاد،1992

2.د. بلەج شێرکۆ: کێشەی مێژینە وئێستای کورد، و:محەممەد حەمە باقی چاپی سێیەم، کوردستانی عێراق، 1991

3.حسێنی مەدەنی: کوردستان وئیستراتیژی دەوڵەتان، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، هەولیر،2000

4. دیڤیدماکداولْ: مێژووی هاوچەرخی کورد، ئەبوبەکر خۆشناو، بەرگی یەکەم، چاپخانەی روون، سلێمانی، .2002

5.م. رەسولْ هاوار: کورد و باکووری کوردستان لەسەرەتای مێژووەوە تاشەڕی دووەمی جیهانی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، خاك، سلێمانی، 2000

6. م.رەسولْ هاوار: کوردو باکوری کوردستان لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی لەدوای شۆڕشی شێخ سەعید لە پیران، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی خاك، سالێمانی، 2002

7. رەفیق حلمی: کوردستانی عێراق وشۆڕشەکانی شێخ مەحمود ( یاداشت )، بەشی یەکەم، چاپخانەی مەحمود لە سەقز.

8.زارە ڤاند: تۆرانچێتی وەدەرکەوتن، ئایدۆلۆژیا و بەرنامە، و: ئەبوبەکر خۆشناو، چاپی یەکەم، هەولێر،1996

9.سەلام ناوخۆش: کوردستان چۆن داگیرکرا و دابەشکرا، چاپی دووەم، .2000

10. سەلام ناوخۆش: هۆکارەکانی لکاندنی ویلایەتی موسڵ بەعێراقی عەرەبییەوە، چاپخانەی ژین، هەولێر، 2000
11.عەبدلڕەزاق عەبدلڕەحمان محەممەد: تێڕوانینێك بۆدۆزی کورد، چاپی یەکەم، چاپخانەی تیشك، سلێمانی.
12.د. عیسمەت شەریف وانلی: لێنیوڕینێکی مەسەلەی نەتەوایەتی کوردستانی تورکیا بەزەمینەی مێژووییەوە: شێرکۆ هەژار، ڕۆما، ئابی 1971.
13.عەبدولعەزیز یاموڵکی: کوردستان وراپەڕینەکانی کورد، و:شێرزاد کەریم،چاپخانەی دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم، سلێمانی،.1999
14.د.عەبدلڕەحمان قاسملۆ: کوردستان وکورد، و:عەبدللاّ حەسەن زادە،بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم.
15.د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی گەلی کورد،بەشی یەکەم دەزگای ڕۆشنبیری و بلاّوکردنەوەی کورد،بەغداد،1985
16.کریس کۆچێرا: کورد لەسەدەی نۆزدە و بیستدا،و:حەمە کەریم مارف،چاپخانە وئۆفسێتی شڤان،سلێمانی،2003
17.کامەران ئەحمەد محەممەد ئەمین: کوردستان لەنێوان ململانێی نێو دەوڵەتی وناوچەییدا (1890-1932)، چاپی یەکەم،دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم،سلێمانی،.2000
18. د. گوینتەر دیشنەر: کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدرلێکراو، و: حەمە کەریم عارف، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، .1999
19. مەحمودمەلا عیزەت: بازنەکانی ململانێ و ستراتیژی ئاسایشی نەتەوەی کورد، چاپی دووەم، سلێمانی، 1999
20. مەلا بەختیار: کۆبەندی چەند بابەتێك (1987-1993)، چاپخانەی دانان،1999
21. نوئیل باربەر: فەرمانڕەوایانی قۆچی زێڕین لەسوڵتان سلێمانی قانونییەوە تا ئەتاتورك، و:ڕێبوار کەریم وەلی، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، .2001
22. هیوا عەزیز سەعید: ناسیۆنالیزمی کوردی (1880-1939) مەکتەبی بیرو هۆشیاری (ی،ن، ك)،سلێمانی، .2003
23. هیوا ئەمین: دۆزی کورد لەنێوان بەرداشی مارکسیەت و دیمکوراسیەت، هەولێر، .1998

**دووەم/ سەرچاوە عەرەبی یەکان**

24. أورخان محمد علي : السلطان عبدالحميد حياته وأحداث عهده،الطبعة الاولى،العراق،1987
25. د.ابراهيم خليل احمد، د. خليل علىمراد:ايران و تركيا، دار الكتب للطبع والنشر، موصل، 1992
26. د. احمد نورى النعيمي: الحياة السياسة في تركيا الحديثة (1919-1938)، دار الحرية، بغداد، .1990
27. د. احمد نورى النعيمي: تركيا وحلف الشمال الاطلسي، المطبعة الوطنية، الاردن، 1981
28. د.بلةج شيركوه: القضية الكردية ماضى الكرد وحاضرهم، ت:جمعية خويبون الكردية الوطنية، الطبعة الاولى،رابطة كاوا، بيروت، .1986
29. جليلى جليل، م.س.لازيف، م.أ.هستريان، أولغاجيغالينا، شاكر و محويان :الحركة الكردية في العصر الحديث، و: د.عبدى حاجى،الطبعة الاولى، دار الرزاي،بيروت،1992
30- د.ابراهيم خليل احمد، د.عبدالجبار قادر غفور ، د.عماد احمد الجواهيرى، د.خليل على مراد، د.باسم الساعاتي، عون عبدالرحمن السبعاوى، د.ابراهيم الداقوقى، د.شامل العلاف، عبدالكريم كامل ، د.حسين البياتى: تركيا المعاصره :بغداد،.1988
31. زنار سلوثى: في سبيل كردستان (مذكرات)، ت:د.على، رابطه كاوا للثقافة الكردية، الطبعة الاولى، بيروت، 1987.
32 . سلام ناوخوش: دراسة سياسة حول احتلال وتقسيم كردستان،ت:يوسف كةمال، الطبعة الاولى، مكتب التفسير، .2002
33. عمر الديراوى: الحرب العالمية الاولى، الطبعة الخامسه، دار العلم للملايين، بيروت، .1977
34. د.عبدالوهاب الكيالى: الموسوعة السياسية، الجزء الاول، الطبعة الاولى،المؤسة العربية للدراسات والنشر، 1999
35. د.عبدالعزيز سلمان، د.عبدالمجيد نعنعي: التأريخ المعاصر أورثا من الثورة الفرنسية الى الحرب العالمية الثانية، دار النهضة العربية، 36، فراسوا، كسافية كوكان:الثورة الروسية، ت:جان كعيد،مطبعة البولسية جونيه، .1980
37. د.فؤاد حمه خورشيد: القضية الكردية في المؤتمرات الدولية، الطبعة الاولى، مؤسسة موكريان للطباعة والنشر، أربيل، .2001
38. كارل بروكلمان: تأريخ الشعوب الاسلامية، ت:نبيه فارس، منير بعلبكي، الطبعة الاولى، دار العلم للملايين، بيروت،2000
39. د.كةمال مظهر احمد: أضواء على قضايا دولية في الشرق الاوسط، دار الحرية، بغداد، 1987
40. لويس ل. شنايدر: العالم في القرن العشرين، ت:سعيد عبود السامرائي، دار مكتبة الحياة، بيروت، .1960
41. ليون تروتسكى: تأريخ الثورة الروسية، ت: اكرم ديري، الهيثم الايوبى،الجزء الاول، بيروت، .1971
42. مصطفى الذين: أتاتورك وخلفاؤه، الطبعة الاولى، بيروت، 1982.

43. محمد عزة دروزة: تركيا الحديثة، مطبعة الكشافة، بيروت، 1946
44. ميشال سايرز والبيركان: المؤامرة الكبرى على روسيا، ت: احمدغربية،دار الفكر الجديد، الطبعة الثاني، بيروت، .1958
45. البروفيسور.م. أ . هسرتيان: كردستان تركيا بين الحربين، ت:

**سێیەم: سەرچاوە فارسی یەکان**

46. **ای.اّچ.کار : انقلاب روسیه** (1929-1917)

**چوارەم: سەرچاوە ئەلەکترۆنییەکان (ئینتەرنێت):**

47. بيار مصطفى السيف الدين: كردستان في السياسة البريطانية، التركية ( تموز 1923 - كانون الاول 1925)، جامعة دهوك

www.imk-news.org/kurdstan

**پێنجەم: تێزە زانکۆییەکان**

48. **تەلار عەلی ئەمین: سیاسەتی کەمالی و بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەی کورد لە باکوری کوردستان، نامەی ماستەر، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین،** 2000 **(بلاْونەکراوە)**.

**شەشەم: گۆڤارەکان بەزمانی کوردی**

49. **د.عوسمان عەلی: هۆکاری کوردی لە کێشەی ویلایەتی موسڵدا،و:کامەران بابان زادە، گۆڤاری بوار، ژمارە** 2**،سلێمانی**، 2000

50. **د.فوئاد حەمە خورشید، جەزا تۆفیق تالیب: کۆنفرەنسی لۆزان، کۆنفرەنسی دابەشکردنی کوردستان، سیاسەتی دەولی، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، سلێمانی، ژمارە** 33، .2001

51. **د.کەمال عەلی محەممەد: پێوەندی سۆڤیەت بە مەسەلەی کوردەوە،گۆڤاری زانکۆی سلێمانی، ژمارە** 1، .2000

52. **د.مارف عومەر گولْ: پەیمانی سیڤەر لە سیاسەت ویاسای نێودەوڵەتاندا، سیاسەتی دەولی، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە** 20، 1997.

53. **مەحمود رەزا: شۆرشی ئۆکتۆبەر و چارەنووسی چەند گەلێکیخۆرهەلاْت، سیاسەتی دەولی، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی ژمارە** 34، 2001.

**حەوتەم: گۆڤارە عەرەبییەکان**

55. **سردار محمد: لعبە الامم ڤ كردستان**(1918-1925)، **پەیڤین العربی،عدد**7، 2001

## زنجیره کتێبی کۆچ:

به تەماین لەمەودوا بە پێی بەرنامەیەکی دارێژراو لە بواری روناکبیریدا، زنجیرە کتێبی تایبەت بە گۆڤاری کۆچ چاپ و بڵاوبکەینەوە.

***

• بەرگی یەکەم: تابلۆی هونەرمەند سەروەت ئەنوەر سەوز.
• بەرگی دووەم: وێنەکانی کەرنەڤاڵی 3 ی سەنتەری روناکبیری ئێلبەگی جاف.